**باس و توێژینەوە بڵاوکـــراوەکان لە گۆڤاری ئەکادیمیای کـــوردی دەربـــڕی بیـــر و بۆچوونـــی توێژەرانـــن نەک دەستەی نووســـەرانی گۆڤار**


- گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی.
- بەرگ و سەرپەرشتی هونەری: عوسمان پیرداود کواز
- نەخشەسازی: عیسام موحسین.
- هەڵەچن: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل.
شیلان جەلال.
- چاپ: چاپخانەی حاجی هاشم- هەولێر.
- تیراژ: ٧٥٠ دانە.

## لەم ژمارەیەدا

### بەشی کوردی



### بەشی عەرەبی - القسم العربی



### English part

# ڕێنماییەکانی بڵاوکردنەوە
# لە گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی

١- گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی، گۆڤارێکی زانستی وەرزییە، باس و توێژینەوەی زانستی لە بارەی کورد و کوردستان، بڵاودەکاتەوە، بە مەرجێ لە هیچ شوێنێکی دیکە بڵاو نەکرابێتەوە یان بۆ بڵاوکردنەوە وەرنەگیرابێت.

٢- زمانی کوردی زمانی سەرەکی بڵاوکردنەوەیە لە گۆڤارەکە، بەڵام لێکۆڵینەوەی زانستی بە هەردوو زمانی عەرەبی و ئینگلیزیش بڵاودەکاتەوە.

٣- هەر بابەتێک کە بۆ گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی دەنێردرێت، دەبێت ناوونیشانی باسەکە، ناوی نووسەر، شوێنی کارەکەی، پلە و پایەی زانستی، ئیمێل و ژمارەی تەلەفۆنەکەی لە سەر لاپەڕەی یەکەمی لێکۆڵینەوەکە نووسرابێت.

٤- نووسەر دەبێت پوختەی باسەکەی بە هەردوو زمانەکەی دیکە، جگە لە زمانی نووسینی دەقەکە لە کۆتایی توێژینەوەکە بنووسێت، کە نابێت لە یەک پەڕەی (A4) زیاتر بێت. لەو پوختەیەدا پێویستە گرنگی و ئەنجامە سەرەکییەکانی توێژینەوەکە بخرێنەڕوو.

٥- لە دوای پەسەندکردنی باسەکە لە لایەن هەڵسەنگێنەرانی زانستیەوە، دەستەی نووسەران ڕەزامەندی بڵاوکردنەوەی بە توێژەر دەدات.

٦- بۆ ئەوەی بابەتەکە لەگەڵ ڕێنماییەکانی بڵاوکردنەوەی گۆڤارەکەدا بگونجێت، دەستەی نووسەران مافی سەرلەنوێ داڕشتنەوە و لابردنی هەندێ دەستەواژەی هەیە، بە مەرجێک بیرۆکەی سەرەکی توێژینەوەکە نەگۆڕێت.

٧- ئەگەر باسەکە لە بارەی ساخکردنەوە (پەیدۆزیی، تحقیق) ی دەستنووسەوە بێت، دەبێت پەیدۆزییەکە بە پێی بنەما زانستییەکان بێت و چەند لاپەڕەی کۆپیکراوی دەستنووسەکە و شوێنی وەرگرتنی، کۆد و جۆری دەستنووسەکە (دەستنووس، چاپ، مایکرۆفیلم... هتد) لەگەڵ دابێت.

٨- ئەگەر ڕێبازی لێکۆڵینەوەی زانستی لە هەڵبژاردنی ناوونیشانی باسەکە،

تویژینەوەی بابەت، شێوازی بەکارهێنانی سەرچاوە و ڕێکخستنی پەراوێزەکان ڕەچاو نەکرابێتن، ئەوا باسەکە لە گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی بڵاوناکرێتەوە. هەروەها ئەو لێکۆڵینەوانەش کە بە زمانێکی پاراوی زانستی نەنووسرا بێتن فەرامۆش دەکرێن.

٩- دەبێت باسەکە دانەیەکی لەسەر (CD) لەگەڵ (٣) دانەی چاپکراوی سەر کاغەز (A4) بە فۆنتی (١٥) ی یۆنیکورد بێت، بە مەرجێک ژمارەی لاپەڕەکانی بە لیستی پەراوێز و سەرچاوەکانەوە لە (٢٥) لاپەڕە زیاتر نەبێت و پەراوێزەکانیشی لە کۆتایی باسەکە دابندرێت.

١٠- ئەگەر بابەتەکە وەرگێڕدراو بوو، دەبێت لە زمانی یەکەمەوە بێت و دەقە ئەسڵییەکەشی لەگەڵدا هاوپێچ کرا بێت.

١١- گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی ناساندن و هەڵسەنگاندنی ئەو کتێبانەی لە بارەی کورد و کوردستانەوە نووسراون بڵاودەکاتەوە، بە مەرجێک نووسەر ڕەچاوی پێوەرە زانستییەکانی ئەم بوارەی کردبێت.

١٢- بابەتی نێردراو بۆ گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی نادرێتەوە بە خاوەنەکەی.

# تێبینی لەسەر چەند پارچە شیعرێکی شێخ ڕەزای تاڵەبانی و ژیاننامە و نەوەکانی

د. نووری تاڵەبانی
سەرۆکی ئەکادیمیای کوردی

شێخ ڕەزای تاڵەبانی، بە چوار زمانی کوردی و فارسی و تورکی و عەرەبی شیعری داناوە وەك هەر یەکە لەم چوار زمانانە زمانی زکماکی خۆی بێت. شێخ ڕەزا گەورەترین شاعیری کوردە لە بواری هەجو و داشۆردندا، پیاوێکی چاونەترس و بێ باك و قسە لەڕوو بووە، ڕووخۆش و نوکتەباز و قسەخۆش و بەشێك لە قسە خۆشەکانی لەناو شیعرەکانی ڕەنگیان داوەتەوە. بەشی زۆری شیعری شێخ ڕەزا بە بۆنە و موناسەبەتی تایبەتەوە داینـاون، چێژ و تام و بایەخی ئەو شیعرانەی دەرناکەون تا ئاگاداری بۆنەی وتن و دانانیان نەبین.[1] بە پێچەوانەی بەشی زۆری شاعیرانی تر، شێخ ڕەزا بە کتوپڕی و لە ناکاو شیعری داناوە، بۆیە زۆر جار لەو کاتەدا نەنووسراونەتەوە، ئەوەش ڕێگای خۆش کردووە بۆ دەستکاری کردنی بەشێکیان. ئەمین فەیزی، دۆستی دێرینی شێخ ڕەزا لە کتێبی (انجمن ادیبان کورد) کە لە ساڵی ١٣٣٩ لە ئیستانبوڵ چاپکراوە، ئاماژەی بۆ ئەو ڕاستییە تاڵە کردووە.[2]

دیوانی شیعری شێخ ڕەزا چەند جارێك چاپکراوە، بەلام بە ناتەواوی و کەموکوڕی. هەتا ئەو دیوانەشی کە لە ساڵی ١٩٤٦ لە بەغدا چاپکراوە، پەلەکردنی پێوە دیارە و هەڵەی زمانەوانی و ڕێنووسی تێدایە. شێخ عەلی کوڕەزای شێخ ڕەزا و مەلا فەتحوڵلا ئەسعەد سەرپەرشتی چاپکردنیان کردووە. شێخ عەلی شارەزای زمانی کوردی نەبوو، لەبەر ئەوەی هەموو ژیانی لە بەغدا بەسەربردبوو و خوێندنی لەو شارە تەواو کردبوو. مەلا فەتحوڵلا ئەسعەدی کۆیی، ئەرکی کۆکردنەوەی شیعرەکانی شێخ ڕەزای لە ئەستۆی گرتبوو، بێ ئەوەی داوای هاوکاری لە کەسانی شارەزا لە شیعری شێخ ڕەزا بکات، کە بەشێکیان لە ژیانا مابوون. شێخ

حەبیبی تاڵەبانی، برازا و زاوای شێخ ڕەزا و حەمید فەتاح، ناسراو بە حەمید ئەفەندی و حاجی حەمیدی حاجی کەریم و ئەحمەد سۆفی دانیشتوانی گەڕەکی (بەرتەکیە) لە کەرکووک، ئەوان و چەندین کەسی دیکەی شارەزا لە شیعری شێخ ڕەزا، کە ئاگاداری موناسەبەتی دانانی شیعرەکانیشی بوون، لە ژیانا بوون، دەبوو بۆ ساغکردنەوە و لێکدانەوە و دیاریکردنی موناسەبەتی دانانی شیعرەکانی، داوای هاوکارییان لێ بکات.(٣)

لەپاش بلاوکردنەوەی دیوانی ساڵی ١٩٤٦، چەند شاعیر و ئەدیبێکی ناسراوی وەکو (پیرەمێرد) و (میرزا مارف)، کە لەو دەمە فەرمانبەر بووە لە کەرکووك، ڕەخنەیان بە توندی لەو دیوانە گرتووە. میرزا مارف چووەتە لای سەیید ئەحمەدی خانەقا، ناسراو بەوەی بەشی زۆری شیعرەکانی شێخ ڕەزای لەبەر بووە، پرسیاری لێ کردووە، ئایا هەموو شیعرەکانی شێخ ڕەزای لەو دیوانەدایە؟ سەیید ئەحمەد دەڵێ بەشێکی کەمی شیعری شێخ ڕەزا لەو دیوانەدایە. میرزا مارف پرسیاری لێ دەکاتەوە شیعرەکانی لەلای کێن؟ سەیید ئەحمەد ئاماژە بۆ دۆلابێك لە ناو دیوەخانەکەی دەکات و دەڵێ لەناو ئەو دۆلابەیە! پرسیار لە سەیید ئەحمەد دەکاتەوە بۆ بلاویان ناکاتەوە، یان بیانداتە کەسێکی دی تا بلاویان بکاتەوە؟ سەیید ئەحمەد بە پێکەنینەوە دەڵێ: بلاوکردنەوەی شیعری شێخ ڕەزا دەبێتە هۆی نەمانی سەیید ئەحمەد و خانەقاکەی!(٤) پاش تێپەڕبوونی چەند ساڵێك بەسەر ئەو گفتوگۆیەدا، شێخ محەمەدی خاڵ بە شێوەیەکی توندتر ڕەخنەی لەو دیوانە گرتووە و نووسیویەتی: "ئەوەی لەو دیوانەدا کۆکراونەتەوە پڕە لە هەڵە و ساتمە و کەموکوڕی و کورت و کوێری" ، "دیوانم نەبینیوە بەقەد دیوانی شێخ ڕەزا بەدبەخت و وێران و هەڵەی تیابێ".(٥) مەلا فەتحوڵلا ئەسعەد، نووسەری (پێشەکی) ئەو دیوانە دانی بەوەدا ناوە، کە ئەرکەکەی قورس بووە و هەر ئەوەندەی لە دەست هاتووە.(٦)

شێخ ڕەزا، کە زۆر جاران بە کتوپڕی و لە ناکاو شیعری داناوە، پاشان لەسەر بنەمای بیستن و گێڕانەوە شیعرەکانی کۆکراونەتەوە، ئەوەش بۆتە هۆی دەستکاریکردن لە بەشێك لە شیعرەکانی. ژیاننامەی شێخ ڕەزا بەو شێوەی مەلا فەتحوڵلا ئەسعەد لە (پێشەکی) ئەو دیوانە نووسیویەتی، لەوەشدا سەرکەوتوو

نەبووە، لەبەر ئەوەی پشتی بەو دوو پارچە شیعرەی شێخ ڕەزا نەبەستووە کە بۆ دیاریکردنی بنەچەی بنەماڵەکەی داینـاون. ئـەوەی مـەلا فـەتحوڵلا ئەسـعەد نووسیویەتی بۆتە بنەما بۆ نووسینی بەشێك لەو کەسانەی لەسەر ژیانی شێخ ڕەزا بابەتیان بلاَوکردۆتەوە.

ناهـەقییێکی گـەورە لەگـەڵ ئـەم شـاعیرە کـراوە، بـەوەی لـە سـەرەتاوە شـیعرەکانی بـە هەڵـە و کەموکوڕییـەوە چـاپ کـراون. کـاك ئـەنوەری سـوڵتانی نووسیویەتی، کە ئەم ناهەقییە لەگەڵ شاعیرانی دیکەش کراوە و باسـی شـاعیری گـەورەی ڕۆژهـەلاَت، مـەلا موسـتەفای بێسـارانی دەکـات، ئـەویش لـە سـەرەتاوە کەسانێکی ناشارەزا شیعرەکانیان کۆکردووەتەوە و دیوانەکەیان بە کەموکوڕییەوە چـاپ کـردووە.(٧) ئـەوەش بـە پێچـەوانەی شـیعری مەولـەوی، لەبـەر ئـەوەی لـە سەرەتاوە کەسـانی شـارەزای وەکـو مامۆسـتا مـەلا عەبدولکـەریمی مـوددەریس و کوڕەکـانی خـەریکی کۆکردنـەوەی شـیعرەکانی بـوون و سەرپەرشـتی چـاپکردنی دیوانەکەیان کردووە، بۆیە هەڵەی زۆر کەمی تێدایە. ئەو ناهەقییەی لە سـەرەتاوە لەگەڵ شێخ ڕەزا کراوە، بەداخەوە درێژەی کێشاوە بـە شـێوازی جۆراوجـۆر. لـەم ڕووەوە چەند کەسێکی شارەزا لـە شـیعری شـێخ ڕەزا ئاماژەیـان بـۆ بەشـێك لـەو دەستکارییانە کردووە کە لە شیعری شێخ ڕەزا کـراون، بەشـێکیان لەبـەر میزاجـی شەخسـی، یـان بـۆ گاڵتـەجاڕی. مـەلا جـەمیلی ڕۆژبـەیانی ڕەخنـەی تونـدی لـە نووسینێکی حەمە بۆر گرتووە و نووسیویەتی: (ئەوەی شارەزا بـێ، هەسـت بـەوە دەکا کە ئەم هەڵبەستە هی شێخ ڕەزا نییە، شێخ هەرگیز خۆی مانـدوو نـەکردووە بە ڕێکخستنی قسەی وەها قۆڕ، ئەو هەمیشە وتوویەتی، کە بمـەوێ هەڵبەسـتێکی ستایش و هەڵنان بڵێم جارجارە بیر لە وشەکان دەکەمەوە بزانم کامیـان جـوانترە، بەلاَم کە بمـەوێ هـەجو بکـەم، جنێـو بـدەم، ئەوەنـدە وشـەی سـەیر سـەیر دێتـە بەرچـاوم سـەرم سـووڕ ئـەمێنێ کامیـان هەڵبـژێرم.."، ڕۆژبـەیانی ڕەخنەکـەی دەرحەق بە ناوبراو توندتر کردووە و نووسیویەتی، "لـەوە دەچـێ بـیری لـە دەس دابـێ" !(٨) شـێخ عـەلی قـەرەداغی، ئـەویش ئامـاژەی بـۆ چـەند پارچـە شـیعرێك کردووە بەناوی شێخ ڕەزاوە بلاَوکراونەتەوە، بەلاَم شیعری ئەو نین.(٩)

شـێخ ڕەزا شـاعیرێکی خـاوەن بـەهرە و بـە توانـا بـووە لـە بـواری هـەجو و داشۆردن و لە بوارەکانی کۆمەڵایەتی، سیاسـی، ئـابووری، ڕۆشـنبیری و ئـایینی، بەڵام بە شێوازی خۆی. لەبەر ئەوەی پیاوێکی خاوەن هەڵوێست بووە، لە شـیعر و قسەکردنیش سڵی لە کەس نەکردۆتـەوە، هـەر کـاتێ ئیلـهامی شـیعری بـۆ هـاتبێ وەکو پەڵە هەوری بەهار شیعر لە دەمی دەرپەڕیوە. هەروەها شێخ دژی بێدادی و ناڕاستگۆیی بووە و بە شیعریش باسی باری نالـەباری کۆمـەڵانی خـەڵکی کـردووە، بەڵام بە زمانێکی تیژ و گاڵتەوە و باسی ئەو کەسانەشی کردووە ناسـراو بـوون بـە دووڕوویی، وەکو لەم بەیتە شیعرەی دەردەکەوێ:

**ڕاست لە دونیادا نەماوە گەر قسەی ساغت دەوێ**

**بێ هەزارانت نیشان دەم گەر قورمساغت دەوێ !**

شێخ ڕەزا شیعری هەجو و داشۆرینی بە زمانێکی تونـدی پـڕ لـە داهێنـان بـە چـوار زمـانی کـوردی و تـورکی و فارسـی و عـەرەبی هەیـە. دەسـەڵاتی هونـەریی شـیعری لـەوەدا دەردەکـەوێت کـە ئـەو شـیعرانەی تـا ئێسـتاش بـە بەشـێکی جیانەکراوە لە ئەدەبی هەجو لەسەر ئاستی ناوچەکە پێناسە دەکرێ.

شـێخ ڕەزا شـیعری خۆشەویسـتی و نیشـتمانی زۆر جـوانی هەیـە، ئـەم قەسیدەی بۆ میرانی بابان داناوە، وەکو ڕێزلێنان پاش ڕووخانی ئیمارەتەکەیان:

**ئێوەن بە حەقیقەت مەلیکی میللەتی کوردان**

**شایانە زیارەت بکرێ، خاکی قەدەمتان**

**ئینکاری حقووقیان لەسەر ئەم میللەتە ناکرێ**

**ئابائی فەرەیدوون فەڕ و جەمشید حەشەمتان**

مەدح و ستایش بەشێکی دیکە بوون لە شیعری شێخ ڕەزا، جوانترین شـیعری داناوە بە زمانی کوردی و فارسی بۆ مـەدحی پێغەمبـەری ئیسـلام، دروودی خـوای لەسەر بێت، و ئیمامی عـەلی و غەوسـی گـەیلانی و ئیمـامی ئـەعزەم و مـەعرووفی کەرخی و شێخ نوورەدینی بریفکانی و شێخ عەبدورەحمانی تاڵەبانیی باوکی و کاك ئەحمەدی شێخ. مەدحی بەشێك لە کاربەدەستانی سەردەمی خۆی کردووە، وەکو سوڵتان عەبدولعەزیز و سوڵتان عەبدولحەمیدی عوسمانی و ناسرەدین شای قاجـار و میرانی بابان و چەند سەرۆك عەشیرەتێکی دۆستی خۆی. جوانترین شیعری شێخ

ڕەزا بە زمانی فارسی بۆ مەدحی پێغەمبەر و ئالوبەیتە، جارێك لە بەغداوە دەچێتە شاری نەجەف بۆ زیارەتی مەزاری ئیمامی عەلی، بەو بۆنەوە چەند پارچە شیعرێکی بە زمانی فارسی دەخوێنێتەوە، کە هەموویان بۆ مەدحی ئالوبەیت بوون، ئامادەبووانی ئەو کۆڕە خۆشحاڵ دەبن بە بیستنی ئەو شیعرانەی و وادەزانن وەکو خۆیانە، چونکە شیعرەکانی بە فارسی بوون و بۆ مەدحی ئالوبەیت بوون و ناویشی (رەزا) بووە! بۆ ڕاستکردنەوەی ئەو بۆچوونەیان، شێخ ڕەزا ئەم بەیتە شیعرەی دەخاتە سەر یەکێك لە قەسیدەکانی و دەڵێ:

**من سونیم اسمم ڕضا کلبی امامی مرتضی**

**درویشی عبدولقادرم ڕاهم به مولا میرود**

شێخ ڕەزا شیعری غەزەلی زۆر جوانی هەیە، بۆ نموونە، کە وتوویەتی:

**دڵی بردم بە ناز و عیشوە دیسان، شۆخی عەییارێ**

**فەریبی دام بە سیحری چاوی خۆی، مەحبووبی سەححارێ**

**لە هیجرانا تەقم کرد، ئەی ڕەفیقان کوا مەدەدکارێ**

**ئەمان مردم عیلاجێ سا لە ڕێی پێغەمبەرا چارێ**

**ویساڵ، یا قەتڵ یا تەسکین، لە هەر سێ بۆم بکەن چارێ**

لە ڕووی بابەت و فۆرمەوە شێخ ڕەزا لاسایی شاعیرانی دیکەی نەکردۆتەوە و شیعری بۆ ڕۆشنبیران و ئەدیبان و زانایان داناوە، بەڵام بەشێك لە شیعرەکانی لەسەر زاری خەڵکی ئاسایی بوون بە هەموو چین و توێژەکانیانەوە.

لە ڕووی دیندارییەوە، شێخ ڕەزا پیاوێکی بە دین و لە خواترس بووە، بە ڕەوشت دوور بووە لەو شیعرانەی بۆ نوکتە و بەزم و گاڵتە دایناون. پرسی لێکراوە بۆ هەجوی هەندێ کەسی کردووە، بەڵام بێدەنگ بووە بەرانبەر کەسانی دی؟ وەرامی ئەوە بووە: ئەو کەسەی دیار نەبێ ئەو هەجوی ناکات!

شێخ ڕەزا هەجوی کەسانێکی زۆری لە کەرکووك کردووە و دانیشتوانی ئەو شارە لەو دەمە، کورد و تورکمان و کلدان و جوو بوون. لە ناوچەی کەرکووك، چەندین خێڵ و عەشرەت و تیرەی جیاواز هەبوون و بەشێکیان کەوتوونەتە بەر تانەی شیعری شێخ ڕەزا، ئەوەش کێشەی بۆ خۆی و کەسوکارەکەی دروستکردووە. بەشێك لەو کەسانەی شێخ ڕەزا هەجوی کردوون پەست و

نارەحەت نەبوون، چونکە زانیویانە پیاوێکی دڵ پاك بووە و ئەو شیعرانەی بۆ نوکتە و ڕابواردن وتووە، بەڵام بەشێکیان پەست بوون و قسەی ناشرینیان بۆ ڕێکخستووە، یان بە زمانی ئەوەوە شیعریان داناوە. یەکێ لەو شاعیرانەی زۆر بە توندی هەجوی شێخ ڕەزای کردووە، شوکری فەزلی بووە، بەڵام پاش چوونی بۆ بەغدا ئیتر هەجوی نەکردووە. ئەو شیعرانەی پێشتر هەجوی شێخ ڕەزای تیا کردوون، بە کەسی نەداون، وەکو مامۆستا تۆفیق وەهبی بەگ دەگێڕێتەوە، چونکە شوکری فەزلی پیاوەتی شێخ ڕەزای لەبەرچاو بووە، بەوە بە هۆی ئەوەوە ملی لە پەتی سێدارە ڕزگاری بووە. مامۆستا تۆفیق وەهبی ماوەیەك لە بەغدا دراوسێی شوکری فەزلی بووە لە گەڕەکی (جدید حسن پاشا)، لەو ماوەدا چەند جارێك هەوڵی لەگەڵ داوە ئەو شیعرانەی لێ وەربگرێ، کە هەجوی شێخ ڕەزای تێدا کردوون، بەڵام پێی نەداون.[١٠] شێخ ڕەزا لە بەیتە شیعرێکی تایبەت بە شوکری فەزلی ئاماژەی بۆ هۆی هەجوکردنی ئاشکرا کردووە و وتوویەتی:

**من دەزانم کێ لەخشتەی بردووی، ئەمما چ سوود**

**سەییدە و سەیید قسەی سووکی دەبێ دەرحەق نەکەم!**

شێخ ڕەزا بە هەق و بە ناهەق هەجوی کەسانێکی زۆری کردووە، بەڵام بۆ سووکایەتیکردن نەبووە، بۆیە ئەو کەسانەی هەجوی کردوون بەشێکیان نارەحەت نەبوون، لەبەر ئەوەی بۆ بەزم و گاڵتە ئەو شیعرانەی داناوە. لەو دەمە کە شێخ ڕەزا ئەو شیعرانەی وتووە، قسەی خۆش و بابەتی ئەدەبی و شیعری جۆراوجۆر، بە شیعری ڕووهەڵماڵراویشەوە، لە ناو مزگەوت و تەکیە و خانەقا و دیوەخانەکاندا دەخوێندرانەوە و گوێیان لێ دەگیرا، ناوەڕۆکی بەرگەکانی کتێبی (ڕشتەی مرواری)ی خوالێخۆشبووی مەلا عەلادینی سوججادی ئەو ڕاستییە دەسەلمێنن، شیعرەکانی شێخ ڕەزاش هەر بەو چاوەوە تەماشا کراون.

شێخ ڕەزا وەکو شاعیرانی دی، جاروبار هەجوی کەسانێکی کردووە، بەڵام پاشان مەدحی کردوون. بەڵام بەشێك لەو بەڕێزانەی لەسەر شیعری شێخ ڕەزا بابەت و لێکۆڵینەوەیان بڵاوکردۆتەوە باسی شیعرە هەجوەکانیان کردووە و گرنگییان بە شیعرەکانی دیکەی نەداوە، بەتایبەتی شیعری مەدح و ستایشی ئەو کەسانەی پێشتر هەجوی کردبوون. بۆ نموونە، شێخ ڕەزا لە پارچە شیعرێکی کە

هەجوی شێخ عەلی کاکی کردووە بە جنێودان بە (حەمەی وەستا فەتاح) بەرپرسی کاری دارایی لە تەکیەکەی، ئەو پارچە شیعرەی لێکدانەوەی جۆراوجۆری بۆ کراوە، کە بەشێکیان بێ بنەمان، بەلاَم ئەو پارچە شیعرەی کە تێیدا باسی باب و باپیرانی کردووە و مەدحی شێخ عەلی کردووە و بە (زومرەی ئەولیا مەعدوود) ناوی بردووە، چەند کەسێك ئاماژەیان بۆ کردووە:

**ئەمێستاش شێخ عەلی نەجلی کەبیری    لە زومرەی ئەولیا مەعدوود.**[11]

لە (پێشەکی) ئەو دیوانە مەلا فەتحوڵلا ئەسعەد باسی ناکۆکی نێوان شێخ ڕەزا و شێخ عەلی کردووە و هۆی تێکچوونیانی گێڕاوەتەوە بۆ ناکۆکییان لەسەر میراتی باوکیان. هەموو ئەو کەسانەی لێکۆڵینەوەیان لەسەر شیعری شێخ ڕەزا بلاَو کردۆتەوە هاوڕان لەسەر ئەوەی شێخ ڕەزا پێش کۆچکردنی شێخ عەبدوڕەحمانی باوکی شیعری هەجو و ڕوهەڵماڵراوی دانەناوە، ئەو شیعرانەی لەسەردەمی شێخ عەلی داناوە. لەبارەی سەروەت و سامانی شێخ عەبدوڕەحمانی باوکیان، کە بۆتە هۆی تێکچوونیان، هەموو دەزانن باوکیان عارفێکی گەورە بووە و ئامۆژگاری موریدەکانی کردووە ئەوەی پەیدای دەکەن خەرجی بکەن پێش ئەوەی زەکاتی بکەوێتە سەر[12]. هۆی ناکۆکی نێوان شێخ ڕەزا و کاکی، شیعرە ڕووهەڵماڵراو و هەجوەکانی شێخ ڕەزا بوون، چونکە لەو شیعرانەی حیسابی بۆ جێگا و شوێنی شێخ عەلی و بنەماڵەکەیان نەکردووە. شێخ عەلی وەکو باوکی زانایەکی گەورە و شێخی ئیرشادی تەکیەی تاڵەبانی بووە و لە کەرکووك و ناوچەکە دیار و ناودار بووە. جگەلەوەش، ناکۆکی لەسەر میرات لە نێوان شێخ عەلی و دوو براکەی دیکەی: شێخ عەبدولقادر و شێخ عەبدولواحید ڕووی نەداوە، هۆی تێکچوونی نێوان ئەو دوو برایە شیعرەکانی شێخ ڕەزا بوون، کە لەگەڵ جێگە و پایەی خانەوادەکەیان نەگونجاو بوون.

شێخ ڕەزا هەجوی کەسانێکی کردووە، کە بەشێکیان چوونەتە لای شێخ عەلی و گلەییان لە شێخ ڕەزا کردووە، ئەویش بەپێی نەریت و وەکو برا گەورە، ئامۆژکاری کردووە و جاروبار خۆی لێ تووڕە کردووە. بۆ نموونە، شێخ ڕەزا لە پارچە شیعرێکی بە زمانی تورکی هەجوی حاجی موستەفای قیرداری کردووە، کە پیاوێکی ناوداری شاری کەرکووك بووە، ماوەیەك ئەندامی (مەجلیسی مەبعوسان)

و سەرۆکی شارەوانی ئەو شارە بووە. شێخ ڕەزا لە پارچە شیعرێکی بە زمانی تورکی تەشبیهی کردووە بە (میناس غەریب)ی گەورەی کلدانییەکانی کەرکووک، ئەوەش بۆ ئەو دەمە وەکو سووکایەتی تەماشاکراوە. ئەو پارچە شیعرەی شێخ ڕەزا لە ناو دیوەخانەکانی کەرکوک بلاَو دەبێتەوە و دەگاتە حاجی موستەفا، کە دۆستی شێخ عەلی بووە و بۆ گلەییکردن دەچێتە لای شێخ عەلی، کە لەبەردەم حاجی موستەفا بە شێخ ڕەزا دەڵێ، چۆن پیاوێکی وەکو حاجی موستەفای تەشبیە کردووە بە فلاَنە کەس؟ شێخ ڕەزا دەڵێ: کاکە سەرم لێشێواوە، میناس غەریب هاتۆتە ماڵەکەم و گلەیی لێ کردووم بەوەی شوبهاندوومە بە حاجی موستەفا، کەچی جەنابی حاجی ئەویش گلەیی ئەوە دەکات کە شوبهاندوومە بە میناس غەریب! بە کورتی، بەشێك لە شیعرەکانی شێخ ڕەزا ئیحراج بوون بۆ شێخ عەلی و خانەوادەکەی، بەتایبەتی شیعرە ڕووهەڵماڵراوەکانی و باسکردنی کەسانێکی دیاری ناو کۆمەڵگا بە شێوەیەکی ناشیرین، وەکو ئەو شیعرانەی هەجوی شێخ غەفووری مامی و ئامۆزاکەی کردووە، یان هەجوی مەلا مەحموودی مەزناوەی کردووە، کە یەکێك بووە لە مەلا هەرە بەناوبانگەکانی کەرکوك و خەلیفەی کاك ئەحمەدی شێخ و شێخ عەلی بووە و بە (بزنە گەڕە) ناوی بردووە:

**کێ دیویەتی ماڵی خەزوور بۆ زاوا**

**تۆ لە کێ و، تەکیە لە کێ، بزنە گەڕەی مەزناوە!**

شێخ ڕەزا لەو پارچە شیعرەی بە زمانی فارسی کە تایبەتە بە بنەماڵەکەی، ناوی مەلا مەحموودی باپیرە گەورەی بە زەنگنە بردووە، بەلاَم هەر لەو شیعرەدا ڕوونی کردۆتەوە گوڵێکن لە دارەگوڵی باخی کاکە سووری و وتوویەتی:

**مشهور جهان بەغوث ثاني　　عبدالرحمن طالباني**

**محمودش جد و أحمدش باب　　هرسه ولي اند و قطب اقطاب**

**محمود مريد پير لاهور　　هرچند بە زنگنە أست مشهور**

**در وصل و نسب، گلی است سوری　　أز گلبن باغ (کاکە سووری)**

چەند کەسێکی شارەزای زۆر نزیك لە بنەماڵەی شێخانی تاڵەبانی، وەکو شێخ محەمەد حیساموددین عومەر و مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، هاوڕان لەگەڵ بۆچوونی شێخ ڕەزا. شێخ محەمەد حیسامووددین عومەر،[١٣] لە کتێبی:

(الانفـاس الرحمانيـة في سلسـلة القادريـة الطالبانيـة) بنەچـەی ئـەم خانـەوادەی گێڕاوەتەوە بۆ بنەماڵەی (کاکـە سـووری)، کـە دەچـێتەوە سـەر سـەیید ئەحمـەدی کوڕی سەیید حەسەنی کوڕی سەیید بابا ڕەسووڵی گەورەی بەرزنجی).[١٤] مامۆستا مـەلا عەبدولکـەریمی مـودەریس ئـەویش لـە کتێبـی (بنەماڵـەی زانیـاران) هـەمان بۆچوونی دەربڕیوە.[١٥] بەڵام ئەم دوو نووسەرە ئاماژەیان بۆ ئەوەش کردووە، کە کەسێك لەم بنەماڵەیە باسی سەییدبوونی خۆیانی نەکردووە.[١٦] لێرەدا ئامـاژە بـۆ دوو ڕووداوی تازە دەکـەم، یـەکێکیان لـە خوالێخۆشـبوو شـێخ عـەلی کـوڕی شـێخ جەمیلی تاڵەبانیی کاکم بیستووە، بەوەی لە سەردەمی شێخ عەلی گـەورە و شـێخ جەمیلی باوکمان چەند کەسێك چوونەتە لایـان و (شـەجەرەی) سـەییدبوونی ئـەم بنەماڵەیان بـۆ بـردوون، بـەڵام بڵاویـان نەکردۆتـەوە. ڕووداوی دووەم مێژووەکـەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٥٠، کاتێ خوالێخۆشبوو شێخ مـەحموودی نـەمر چـووەتە کەرکوك بۆ سوپاسکردنی شێخ حەبیبی تاڵـەبانی، پـاش خـوازبێنی کچـەکەی بـۆ شێخ باباعەلی کـوڕی شـێخ مـەحموود. لـە دانیشـتنێکی تایبەتـدا، کـە بەشـێك لـە شێخانی تاڵەبانی ئامادەی بوون، شێخ مەحموود سوپاسی شێخ حـەبیبی کـردووە و وتوویەتی، خزمایەتیمان تازە کردەوە و ئێوەش سەییدن و بەرزنجەن. لە سـاڵی ١٩٥٧ چـەند کەسـێك لـە بنەماڵـەی (کاکـە سـووری) لـە بۆکانـەوە چـووبوون بـۆ کەرکووك و لەوێوە هـاتبوون بۆ بەغدا بـۆ زیـارەتی بارەگـای شـێخ عەبـدولقادری گەیلانی و سەردانی من و کاك عیرفانی برامیان کرد، کە لەو دەمە خوێندکار بووین لـە کۆلێـژی مـاف (حقـوق) لـە بەغـدا، سـەردانەکەیان لەبـەر خزمایـەتی بـوو. لەسـەردەمی شـێخ عـەلی گـەورە، حـاجی شـێخ موسـتەفا، کـە ڕیـش سـپیی ئـەو بنەماڵەیە بووە لە بۆکان چەند جارێك هاتۆتە کەرکووك، نەوەکانی تا سـاڵی ١٩٥٧ سەردانی کەرکووکیان کردووە.[١٧]

مەلا فەتحوللاّ ئەسعەد لە (پێشەکی) ئەو دیوانە باسی بنەماڵەی شـێخ ڕەزای کردووە و بنەچەکەی گێڕاوەتـەوە بـۆ سـەر خێڵـی زەنگنـەی گـەرمیان، بـە پشـت بەستن بەو پارچە شیعرەی شێخ ڕەزا بە زمانی فارسی، کە ناوی مەلا مـەحموودی بە (زەنگنە) بردووە. بەڵام وەکـو پێشـتر ڕوونکراوەتـەوە، شـێخ ڕەزا لـەو پارچـە شیعرەی وتوویەتی، هەرچەندە مـەلا مـەحموود بـە (زەنگنـە) ناسـراوە، بـەڵام بـە

بنەچە دەگەڕێنەوە بۆ (کاکە سووری). هۆی ناوبردنی مەلا مەحموود بە زەنگنە ئەوە بووە ماوەیەکی زۆر لە ناو خێڵی زەنگنە ماوەتەوە و کچی میر سمایل خانی زەنگنەی هێناوە و لەناو دێهاتەکانی ئەو خێڵە بە مەلایەتی ماوەیەك ماوەتەوە. خزمایەتیی نێوان مەلا مەحموود و خێڵی زەنگنە ماوەتەوە، چونکە شێخ ئەحمەدی کوڕی کچی خاڵی خۆی هێناوە، و ئەو خزمایەتییە شۆڕبووەتەوە بۆ ناو نەوەکانی خوارەوە.

شێخ ڕەزا بەشێك لە ژیانی منداڵی لە گوندی (قرخ) بەسەر بردووە، ئەو ناوچەیە لە ژێر دەسەلآتی ئەمارەتی بابان بووە. شێخ ڕەزا لەو قەسیدە بەناوبانگەی کە تایبەتە بە سلێمانی و خاکەکەی، حەسرەتی بۆ ئەو ڕۆژانە بردووە، کە لەژێر دەسەلآتی حوکمی عەجەم نەبووە و بەشێك نەبووە لە دەوڵەتی عوسمانی:

**لەبیرم دێ سلێمانی کە دارولمولکی بابان بوو**

**نە مەحکومی عەجەم و نە سوخرەکێشی ئالی عوسمان بوو**

شێخ ڕەزا باسی تەمەنی خۆی کردووە و وتوویەتی: "پێنج و شەش طفلی دبستان بوو". کاتێ چوونەتە کەرکوك، ئەو شارە مەڵبەندی ویلایەتی شارەزوور بووە، والی عوسمانی لەوێ دانیشتووە، کە تا ساڵی ١٨٧٩ درێژەی کێشاوە. مەڵبەندی ویلایەت لەو ساڵەدا لە کەرکووکەوە دەگوازرێتەوە بۆ مووسڵ، شێخ ڕەزا ئەو ڕووداوە مێژووییەی بە بەیتە شیعرێکی بە زمانی تورکی بۆ تۆمارکردووین و وتوویەتی:

**موسل اولدي ولايت، نافع افندي والي**

**ويل لكم رِعيت، كول باشوة اهالي**

واتا، (موسڵ) کرایە ویلایەت و (نافع) ئەفەندی بە (والی)، هەی بێچارە ڕەعیەت و خۆڵەمێش بەسەرتان خەڵکەکەی! لەوە دەچێ ئەو (نافع) ئەفەندییە پێشتر لە کەرکووك والی، یان کاربەدەستێکی گەورە بووە و ستەمکار بووە، بۆیە شێخ ڕەزا بەو جۆرە وەسفی کردووە. ئەم بەیتە شیعرەی شێخ ڕەزا لە دیوانەکەی بلآو نەکراوەتەوە، نووسەری تورکمان عەتا تەرزی باشی لە کتێبێکی کە تایبەتە بە شاعیرانی کەرکووك، ئەو بەیتەی بلآوکردۆتەوە.[١٨]

شێخ ڕەزا بەشی زۆری ژیانی لە کەرکووك لە **تەکیەی تاڵەبانی بەسەربردووە، تەکیەی تاڵەبانی لە کەرکووك لە سەردەمی مەلا مەحموودی باپیرە گەورەی دروستکراوە، سەرەتا نوێژ و زیکری دەروێشان لە ژێرزەمینێکی ناو ئەو تەکیە کراون، بەڵام کاتێ شێخ عەبدوڕەحمانی باوکی دەچێتە کەرکووك، گەورە و فراوان دەکرێتەوە، بەهاوکاری والی عوسمانی و خێزانی (سوڵتان عەبدولمەجید)، کە هەردووکیان موریدی شێخ عەبدوڕەحمان بوون.**

شێخ ڕەزا خۆی گێڕاویەتەوە، کاتێ مێردمناڵ بووە لەگەڵ شێخ عەلی برا گەورەی و براکانی پێکەوە چوونە بۆ بەغدا بۆ زیارەتی بارەگای غەوسی گەیلانی. لە کاتی تەوافدا، شێخ ڕەزا لە خوای گەورە پاڕاوەتەوە ئیلهامی شیعردانانی پێ ببەخشێ، پاش ماوەیەك لە ترسا زمانی گیراوە و قسەی پێ نەکراوە، کە دەگەڕێنەوە بۆ کەرکووك، شێخ عەلی ئەم ڕووداوەی بۆ باوکی گێڕاوەتەوە و ئەویش بە بزەیەکی سەر لێوەوە فەرموویەتی: "خۆزگە زمانی نەکرابایەوە"!

شێخ ڕەزا دووجار سەردانی ئیستانبوڵی کردووە، لە سەفەری یەکەمی باوکی لە ژیانا بووە و تەمەنی شێخ ڕەزا لە ٢٥ ساڵ کەمتر بووە. لە گوندی (بریفکان)ی نزیك دهۆك دەچێتە سەر مەزاری شێخ نوورەددینی بریفکانی، کە شێخێکی ئیرشادی گەورە بووە لە ناوچەی بادینان و دۆستی باوکی بووە. بە هۆی کۆچکردنی ئەو شێخەوە، پارچە شیعرێکی بە زمانی فارسی لەسەر مەزارەکەی دەخوێنێتەوە، بەم بەیتە دەست پێدەکات:

**عزم دیار ڕوم چو کردم زشهرزور**

**افتاد در دیار بریفکان مرا عبور**

واتا، لە وڵاتی شارەزوورەوە هاتووە و بە نیازی سەفەر بۆ وڵاتی (ڕۆم). سەفەری دووەمی شێخ ڕەزا بۆ ئیستانبوڵ لە ساڵی ١٨٦٦ بووە. ئەم گەشتەی بۆ ماوەیەکی درێژخایەنتر بووە، لەو ماوەدا تێکەڵ بەو کۆمەڵگا تازەیە بووە و خەڵکێکی زۆری ناسیوە، کە بەشێکیان گەورە پیاوان و ئەدیب و شاعیر و ناودارانی ئەو شارە بوون، بە تورك و کورد و عەرەبەوە. ئاشنابوونی لەگەڵ کۆمەڵگایەکی تازە لەو شارە گەورەیە ئاسۆی بیرکردنەوەی فراوانتر کردووە و هامشۆی دیوەخانەی پیاوە گەورەکانی کردووە و چاوی بە پیاو ماقووڵان و شاعیر و ئەدیبان کەوتووە.

شـێخ ڕەزا لـە ئیسـتانبوولەوە دەچـێتە میسـر، دواتـر بـۆ حیجـاز و لـەوێوە دەگەڕێتەوە بۆ کەرکووك. ماوەیەك لە دێی (قرخ) خەریکی کاری کشتوکاڵی بووە، پاشان لەسـەر پێشـنیازی شـێخ عـەلی کـاکی، چـووە بـۆ بەغـدا و بووەتـە شـێخی ئیرشاد لەسەر ئەو تەکیەی پێشتر باوکی لە گەڕەکی (مەیدان) دروستی کردبوو. لە بەغدا لە نێوان ساڵانی ١٩٠٠ تا ١٩١٠ ماوەتەوە و ئاشنایەتی لەگـەڵ ژمارەیـەك لـە پیاوە گەورەکانی ئـەو شـارە پەیداکردووە، کـە یـەکێك والـی بەغـدا بـووە، لەبـەر ئەوەی پیاوێکی ئەدەب دۆست بووە و بەشێك لە شیعرە تورکییەکانی شێخ ڕەزای لەبەر بووە، بە هۆی ئەویشەوە شوکری فەزلی لە پەتی سێدارە ڕزگار کردووە.

شێخ ڕەزا خۆشحاڵ بووە بە ژیانی لە بەغدا، کـە بـە جـوانترین شـاری دونیـا وەسفی کردووە و وتوویەتی:

**گەر بڵێم بەغدا لە جەننەت خۆشترە هێشتا کەمە**

**چونکە سوکنای (غەوس) و (کەرخی) و (ئیمامی ئەعزەمە)**

شێخانی تاڵـەبانی لـە کـەرکووك و شـێخ ڕەزا بەتایبـەتی پێشـتر پێوەنـدییان لەگەڵ خانەوادەی گەیلانی بەهێز بووە و چەند جارێك شێخ ڕەزا لەگەڵ شێخ عەلی چـوونە بـۆ بەغـدا و میـوانی نـەقیبی ئەشـرافی بەغـدا بـوون. جارێـك شـێخ ڕەزا خەریکی شەترەنج دەبـێ لەگـەڵ سـەیید مـەحموودی گـەیلانی، نـەقیبی ئەشـرافی بەغـدا، کتـوپڕ شـێخ ڕەزا دەڵـێ: "قتلتـه ورب الكعبـة"! نـەقیب ڕائەچـڵەکێ و دەپرسـێ ئـەوە چـی بـوو شـێخ ڕەزا؟ لـە وەڵامـدا ئـەو بەیتـە شـیعرەی بـۆ دەخوێنێتەوە، کە تێیدا هەجوی جەمیل سیدقی زەهاوی شاعیری کردووە! نەقیب دەڵێ نازانم چ مێشکێکت هەیە؟ وام دەزانی بـیرو هۆشـت لەگـەڵ شـەترەنجەکەیە، بەڵام دەرکەوت خەریکی شیعردانانی بە زەهاوییەوە!

شێخ ڕەزا کاتێ شیعری دانابێ سەری هـەڵبڕیوە و لەسـەر یـەك قافییـەی بـۆ هاتووە. جارێك دۆستێکی پرسیاری لێ کردووە، بۆچی کاتێ شیعر دەڵێ سەر بەرز دەکاتەوە؟ وەڵامی ئەم شاعیرە گەورەیە ئەوە بووە، هەرچەند ئیلهامی شیعری بۆ هاتووە خەریك بووە مێشکی بتەقێ، چونکە قافییە لە دوای قافییەی بـۆ هـاتووە، بۆیە لەتاوا سەر هەڵدەبڕێ.

شێخ ڕەزا دوو کوڕ و چوار کچی هەبووە، هەموویان لەناو بنەماڵەکەیان و لەناو کۆمەڵگادا دیاربوون. شێخ محەمەد کە کوڕی گەورەی بووە، پیاوێکی خوێندەوار و شاعیرێکی پایەبەرز بووە، نازناوی شیعری (خالصی) بووە، واتا نەوەی (خالص). لەسەردەمی حکومەتی شێخ مەحموود دەبێتە قایمەقامی ڕانیە، لەبەر ئەوەی پیاوێکی سەرڕاست بووە و ڕێگای بە دەسەڵاتدارانی ناوچەکە نەداوە کاری ناڕەوایی بکەن و دەست بخەنە ناو کاروباری حکومەتەوە، کێشەیان بۆ دروست کردووە، هەتا هەوڵی کوشتنیان داوە و برینداریان کردووە و یەکێك لە پاسەوانەکانی دەکوژرێت. کاتێ ڕۆژ دەبێتەوە، بە تەرمەوە دەچنە کۆیە و لەوێ دەیشارنەوە و تیماری برینی سەرشانی دەکەن. ماوەیەك شێخ مەحموود لێی ناپرسێتەوە، بەڵام کە ڕاستییەکانی بۆ دەردەکەوێت، نامەیێکی بۆ دەنێرێ و داوای سەردانی سلێمانی لێ دەکات، ئەویش بە شیعر نامەیێکی بۆ دەنێرێ، بۆ بارودۆخی ئەمڕۆی وڵاتەکەمان زۆر گونجاوە ! لەو پارچە شیعرەی باسی کەسانی نەزان و هەلپەرستی کردووە، کە بۆ بەرژەوەندیی تایبەتی خۆیان لە دەوری شێخ کۆبوونەتەوە. لەبەر ئەوەی دڵسۆزی شێخی نەمر بووە، لەو پارچە شیعرەی، بە هەردوو زمانی کوردی و فارسی، ئەو دیاردە ناشرینانەی خستۆتە بەرچاوی و ئاگاداری کردۆتەوە لە ئاکامەکانی و وتوویەتی:

**یەکانە و پەڵخ و مالۆسی قەوی قۆڵی گەلێك زۆرە**
**بەری ملیان لە کوێ ئەگرێ پشیلەی (کانی ئێسکانی)**
**لەپاش تالأن و عەزل و لانەوازی و خانە وێرانی**
**حەواڵەی خۆت دەکەم قوربان چلۆن بێم بۆ سلێمانی؟**
**لەبەر چاوت وەکو یەك وایە بێ فەرقە لەخزمەت تۆ**
**شەهین و حاجی لەقلەق، شێرو ڕێوی، مورشید و جانی**

شێخ محەمەد کوڕێکی هەبوو ناوی شێخ سەعید بوو، لە ساڵەکانی شەستی سەدەی ڕابوردوو کۆچی دوایی کردووە، لە کەرکووك زۆر بە دەست کورتی دەژیا لە ماڵەکەی شێخ ڕەزا. شێخ سەعید تەنیا کچێکی هەبوو، ئەویش لە سەرەتای ئەم سەدەیە لە کەرکووك کۆچی دواییی کردووە. کوڕی دووەمی شێخ ڕەزا، شێخ عەبدوڵلا بوو، کە سێ کوڕ و سێ کچی هەبوو، هەموویان خوێندەوار و کۆلێژیان تەواو کردبوو. کوڕی گەورەی ناوی شێخ ڕەحمەتوڵلا بوو، ئەفسەر بوو و نزیکبووە

لە بەکر سدقی، لە پاش کوشتنی بەکر سدقی لە ساڵی ١٩٣٧، خانەنشین کراوە. لە ساڵی ١٩٥٩ عەبدولکەریم قاسم داوای گەڕانەوەی لێ کردووە بۆ ناو لەشکری عیراق، بەڵام نەگەڕاوەتەوە. کوڕی دووەمی شێخ عەبدوڵلا ناوی شێخ حەسەن تاڵەبانی بوو، کۆلێژی ماف (حقووق)ی تەواوکردبوو، لە ساڵی ١٩٤٦ کراوەتە موتەسەریف (پارێزگاری) سلێمانی، پاشان هەولێر و دیالە. لە ساڵی ١٩٥٩، لەسەردەمی حوکمی عەبدولکەریم قاسم دەکرێتە وەزیر، لەپاش کۆدێتای شوباتی ١٩٦٣ لەگەڵ بەشی زۆری وەزیرەکانی قاسم دەستگیردەکرێت. کوڕی سێیەمی ناوی شێخ عەلی بوو، پارێزەر بووە و (موتەوەلی) تەکیەی تاڵەبانی بووە لە بەغدا، دیوانی شیعرەکانی شێخ ڕەزا لەسەر ئەرکی ئەو لە ساڵی ١٩٤٦ چاپکراوە. شێخ ڕەزا چوار کچی هەبووە، هەموویان خێزانی خزمی خۆیان بوون، تەنیا (رابعە خانم) نەبێ، کە خێزانی ڕاسخ ئەفەندی کەرکوکی بووە، کە کەسێکی ناوداری ئەو شارە بووە. لە پاش ڕووخانی دەوڵەتی عوسمانی لە ئیستانبووڵ بووە و بڕیاری مانەوەی داوە و کوڕێکی هەبوو بە ناوی (عومەر)، کە پیشەی ڕۆژنامەنووس بوو. لەسەردەمی حوکمی عەدنان مەندەریس هەڵبژێرراوە بە پەرلەمانتار لەسەر شاری ئیستانبووڵ. کاتێ منداڵ بوو، هاوینان لەگەڵ دایکی دەهاتن بۆ کەرکووك و لە ماڵەکەی شێخ ڕەزا دەمانەوە. لە ساڵی ١٩٩٣ لە شاری ئیستانبووڵ سەردانیم کرد و بە گەرمی پێشوازی لێ کردم، ئەو بابەتەی لە ساڵی ١٩٨٨ لە گۆڤاری (کاروان) لەسەر شێخ ڕەزای باپیری نووسیبووم بە دیاری پێمدا و زۆری پێخۆشبوو.

لە ساڵی ١٩١٠ شێخ ڕەزا کۆچی دوایی کردووە، هەواڵی کۆچکردنی لە ڕۆژنامەی (الرقیب) بڵاوکراوەتەوە. خەڵکێکی زۆر لە پیاو ماقووڵان و ئەدیبان و شاعیرانی ئەو شارە بەشدارییان لە مەراسیمی بە خاکسپاردنی لە گۆڕستانی شێخ عەبدولقادری گەیلانی کردووە.[١٩] لەسەر وەسیەتی خۆی ئەم دوو بەیتە شیعرەی لەسەر کێلی قەبرەکەی نووسراوە:

**یا ڕسوالله چە باشد چون سگ اصحاب کهف**
**داخل جنت شوم در زمرەی اصحاب تو**
**او ڕود در جنت و من در جهنم کی ڕواست**
**او سگ اصحاب کهف و من سگ اصحاب تو**

خوالێخۆشبوو ڕەشاد موفتی، لە زمانی خوالێخۆشبوو شێخ شەریفی هەولێری بۆی گێڕامەوە و وتی، پێش کۆچکردنی شێخ ڕەزا، شێخ شەریف چووە بۆ بەغدا و بووەتە میوانی لە تەکیەکەی. ڕۆژێك شێخ ڕەزا پێی دەڵێ، فلانە کەس کارێکی وام نەکردووە خوا بەو هۆیەوە لێم خۆش بێت؟ ئەویش پێی دەڵێ، "قوربان چۆن قسەی وا دەکەیت، خودا لەبەر هیچ لێت خۆش نەبێت، لەبەر ئەو پارچە شیعرەی خۆت لێت خۆش دەبێت" و پارچە شیعرەکەی بۆ دەخوێنێتەوە. شێخ شەریف وتوویەتی، شێخ ڕەزا داوای قەڵەم و کاغەزی کردووە و هەردوو بەیتەکەی نووسیوەتەوە و وتوویەتی وەسیەت دەکەم پاش مردنم، ئەو دوو بەیتە شیعرە لەسەر کێلی گۆڕەکەم بنووسنەوە، و وەسیەتەکەی جێبەجێ کراوە.

لەسەر دەرگای بارەگای شێخ عەبدولقادری گەیلانی ئەم بەیتە شیعرەی شێح ڕەزای نووسراوە:

**این بارکه حضرت غوث الثقلین است　　نقد کمرحیدر و نسل حسنین است**
**مادرش حسینی نسب است و بدر او　　ز اولاد حسن، یعنی کریم الابوین است**

**پەراوێزەکان:**

(١) د. نووری تاڵەبانی: (گەشتێکی تر بە جیهانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی)، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (٧٠)، ١٩٨٨، لەگەڵ نووسینێکی دی لەژێر ناوی: (لە قسە خۆش و نەستەقەکانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی لەگەڵ ئاماژەکردن بۆ چەند هەڵوێستێکی جوامێرانەی)، لەگەڵ چەند بابەتێکی تر، لە کتێبی (شێخ ڕەزای تاڵەبانی بەپێنووسی چەند بنووسێك)، دەزگای ئاراس لە هەولێر لە ساڵی ٢٠١٢، بڵاوی کردوونەتەوە.

(٢) د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ: (شێخ ڕەزای تاڵەبانی)، دەزگای چاپ و بڵاوکراوەی ئاراس، چاپی دووەم، هەولێر ٢٠١٠، ل ١٠.

(٣) د. نووری تاڵەبانی: گەشتێکی تر بە جیهانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی، گۆڤاری (کاروان)، هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(٤) د. نووری تاڵەبانی: شێخانی ئیرشادی تاڵەبانی و چەند ناودارێکی دیکەی ئەم بنەماڵەیە، چاپخانەی پاك، چاپی دووەم، هەولێر ٢٠٠٣، ل ٥٧. ئەو دەستنووسە کە لەلای سەیید ئەحمەدی خانەقا بووە، لەپاش کۆچکردنی کەوتۆتە لای شێخ حسێنی کوڕی، کاك پیرۆت تاڵەبانی، کە دایکی کچەزای شێخ ڕەزایە، لە ساڵی ١٩٨٩ داوای لێ دەکات بە مەبەستی بڵاوکردنەوەی دیوانی شێخ ڕەزا، بە مەرجی بڵاونەکردنەوەی ئەو شیعرانەی هەجوی سەیید ئەحمەدی کردووە، پێی دەدا. بەڵام مخابن، لەپاش ڕاپەڕینی بەهاری ساڵی ١٩٩١، کاك پیرۆت و کەسوکارەکەی ماڵەکەیان جێهێشتووە و ئەو دەستنووسانە لەناو (قاسە)کەی بوون، ئەوانیش فەوتان، بۆ زانیاریی زیاتر، تەماشای سەرچاوەی پێشوو بکە، ل ٥٨.

(٥) شێخ محەمەدی خاڵ، دیوانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی، گۆڤاری (کۆڕی زانیاری عێراق/ دەستەی کورد)، بەرگی سێیەم، ساڵی ١٩٨٩.

(٦) دیوانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی، چاپی ١٩٤٦.

(٧) ئەو نووسینەی کاك ئەنوەری سوڵتانی، بە e- mail بۆی ناردبووم.

(٨) مەلا جەمیلی ڕۆژبەیانی: (چاوخشاندنێ بە چاپی تازەی دیوانی شێخ ڕەزای تاڵەبانیدا)، کتێبی: (شێخ ڕەزای تاڵەبانی، بەپێنووسی چەند بنووسێك)، کە دەزگای ئاراس لە ساڵی ٢٠١٠ چاپی کردووە، ل ١١٣.

(٩) شێخ محەمەدی عەلی قەرەداغی: (کۆمەڵێك سەرنج لەبارەی دیوانی شێخ ڕەزاوە)، کتێبی: (شێخ ڕەزای تاڵەبانی، بە پێنووسی چەند بنووسێك)، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، ساڵی ٢٠١٠، ل ١٩٠ و ١٩١.

(١٠) (تۆفیق وەهبی بەگ لە بیرەوەرییەکانی د. نووری تاڵەبانی)، گۆڤاری (ئەکادیمیای کوردی)، ژمارە ٢٥، ساڵی ٢٠١٢.

(١١) (حەمەی وەستا فەتاح) بەرپرسی کاری دارایی بووە لە تەکیەی تاڵەبانی، کوڕەکەی تا کۆتایی ساڵەکانی پەنجای سەدەی ڕابوردوو مابوو، لە کەسانی بەتەمەنم بیستووە لە باوکی دەکرد، هەرچەندە پیاوێکی بێ زەرەر بوو، بەڵام ڕەزا سووک نەبوو! بە پێچەوانەی کوڕەزاکەی، کە حاجی تەها بوو.

(١٢) پێشەکی (جەزبەی عیشق)، دیوانی شیعری حەزرەتی مەولانا شێخ عەبدوڕەحمانی تاڵەبانی (خالص)، لە بڵاوکراوەی ئەکادیمیای کوردی، ژمارە (٢٧٤)، هەولێر ٢٠١٤، ل ٩ – ١٨.

(١٣) شێخ محەمەد حیسامووددین عومەر، خەلیفەی شێخ جەمیلی تاڵەبانی بووە، لە ناوەڕاستی بیستەکانی سەدەی ڕابوردووەوە تا کۆچکردنی لە کۆتایی ساڵی ١٩٦٦ هەموو ڕۆژانی هەینی چووەتە تەکیەی تاڵەبانی و بۆ ماوەیەکی زۆر (کاتب)ی بووە، لە ساڵی ١٩٣٧ لەگەڵ چەند کەسێکی دی بردوونی بۆ مەککە بۆ ئەدای فەریزەتی حەج. تەکیەی شێخ حیسامودین لە گەڕەکی (شاترلو) لە بەرەی (قۆریە)ی شاری کەرکووکە. لەپاش کۆچکردنی شێخ محەمەد حیسامووددین، نەوەکانی هامشۆی تەکیەی تاڵەبانییان کردووە، (گۆران فەتحی)، (شاری کەرکوك، بەشێك لە مێژووی مزگەوت و خانەقا و زانا و پیاوە ئایینییە ناودارەکانی)، ئەنستیتوی کەلەپووری کوردی بڵاوی کردۆتەوە، چاپخانەی کەمال، چ ٢، سلێمانی ٢٠١٢، ل٢٣٧.

(١٤) شێخ محەمەد حیسامووددین عومەر، (الانفاس الرحمانیة في سلسلة القادریة الطالبانیة)، كركوك، مطبعة الشمال ١٩٧٧، ص١٤٤.

(١٥) مەلا عەبدولکەریمی مودەریس، بنەماڵەی زانیاران، چاپخانەی شەفیق، بەغدا، ساڵی ١٩٨٤، ل ٥٦٧.

(١٦) شێخ عەلی کوڕی شێخ جەمیلی تاڵەبانی، لە ساڵی ١٩٢٩ لە کەرکووك هاتۆتە دونیاوە و لە کۆتایی ساڵی ١٩٩٠ کۆچی دوایی کردووە، لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٦١ تا کۆچکردنی، شێخی ئیرشادی ئەو تەکیە بووە، مەلا و زانایەکی گەورە بووە و

دەرسی بە بەشێك لە فەقێیەکانی تەکیە دەگوتەوە، خاوەنی هەڵوێست بووە، بۆیە ڕژێمی بەعس لە ساڵی ١٩٦٣ تا کۆچکردنی دەستی بەسەر هەموو موڵکەکانی خانەوادەکەی لە کەرکووك گرتبوو.

(١٧) لە ساڵی ١٩٥٧ لەگەڵ کاك عیرفانی برام خوێندکار بووین لە کۆلێژی ماف (حقوق) لە زانکۆی بەغدا، کوڕەزایەکی حاجی شێخ موستەفا، کە ئەویش ناوی شێخ موستەفا بوو، لەگەڵ دوو خزمی دی چووبوونە کەرکووك و لەوێوە، بۆ زیارەتی بارەگای شێخ عەبدولقادری گەیلانی، هاتبوونە بەغدا و سەردانی ئێمەیان کرد لەبەر خزمایەتی. لەبەر ئەو گۆڕانکارییانەی لەپاش ساڵی ١٩٥٨ لە عێراق ڕوویاندا، جارێکی دی نەهاتنەوە بۆ کەرکووك.

(١٨) عەتا تەرزی باشی، کرکوك شاعرلری، ج/ ٢، ل ١٣١.

(١٩) عەبدوڕەزاق بیمار، شێخ ڕەزای تاڵەبانی لە ڕۆژنامەی (الرقیب)دا، ڕۆژنامەی (هاوکاری)، ژ/ ١١٦٩ ی ١٢/٤ /١٩٩٠، لە ڕۆژنامەی (الرقیب)ی ژ/٨٢ی ٩ی موحەڕەمی ساڵی ١٣٢٨ی کۆچی وەرگرتووە.

## ملخص البحث

الشيخ رِضا الطالباني هو احد كبار الشعراء الكورد الكلاسيك، خاصة في ميدان الهجاء. ولد عام ١٨٣٧ في قرية (قرخ) القريبة من مدينة كركوك، ثم انتقل مع اسرته الى تلك المدينة وقضى معظم ايامه فيها. زار الشاعر عام ١٨٦٦ مدينة استانبول وهو في مقتبل شبابه، ومر في طريق سفره على قرية (بريفكان)، والقى قصيدة باللغة الفارسية على مزار الشيخ نورالدين بريفكاني، احد كبار شيوخ التصوف في منطقة باهدينان. زار الشاعر استانبول فيما بعد ومكث فيها فترة اطول واختلط بكبار الشعراء والادباء وكبار القوم، ثم سافر الى مصر، ومنها الى الحجاز لاداء فريضة الحج، ثم عاد الى كركوك، قبل ان يستقر في بغداد عام ١٩٠٠.

نظم الشعر باللغات الكوردية و الفارسية والتركية والعربية. ورغم انه كان شاعرا كبيرا في حقل الهجاء، الا ان لديه قصائد عديدة رائعة في ميادين الغزل والمدح وتمجيد الوطن. وما يتميز به هذا الشاعر، هو انه كان ينظم الشعر فجاة دون سابق تحضير، لذلك لم تدون اشعاره الا فيما بعد، وترتب على ذلك عدم جمع اشعاره بصورة كاملة او امينة. طبع ديوان اشعاره لاكثر من مرة، لكن تلك الدواوين لم تضم جميع اشعاره وقصائده، بضمنها ديوانه المطبوع عام ١٩٤٦ في بغداد من قبل حفيده.

سجل لنا الشاعر في قصائد له باللغات الكوردية و التركية و الفارسية اهم الاحداث التاريخية التي مر بها كوردستان. فقد اشار في قصيدته المعروفة عن مدينة السليمانية، انه يتذكرها ولم تكن انذاك تحت سيطرة حكم آل عثمان، او جزءا من دولة العجم. وسجل لنا في بيت شعر اخر له باللغة التركية، تاريخ نقل مركز الولاية من مدينة كركوك الى الموصل. توفي الشاعر في مدينة بغداد عام ١٩١٠ التي احبها كثيرا، ودفن في مقبرة الحضرة القادرية، وقد شارك في مراسيم التشييع كبار الادباء والشعراء وغيرهم، وسجل على لحده بيتين من اشعاره باللغة الفارسية، بناء على وصية منه.

## Abstract

Sheikh Reza Talabany was a renowned Kurdish poet with a distinctive style, which included rhythmic verses and unique satirical nature. Breaking with convention of his peers, he would often use his work to illustrate his arguments and write witty comebacks for his critics. However, much of his work has only been recorded through personal accounts of individuals, resulting in a loss of many of his great works. Sheikh Reza's most provocative work, which includes insults at the expense of many individuals and regions from different parts of Kurdistan, is still cited today and used to tease its subjects.

Sheikh Reza's peers often recall their interactions with him through fondness and a praise of his character as a devote man with good spirit, using his work to target only those with power and status, even quoting that "I won't insult anyone unless he is famous".

It is important to consider his work in the context of his time. Much of his poetry comes to modern scholarship anecdotally, and some information about Sheikh Reza's life has been recorded incorrectly. For example, the introduction to a collection of Sheikh Reza's poetry published in 1946 in Baghdad by his nephew contains a number of errors, which resulted in other writers relying on this false information. In this collection of Sheikh Reza, there are also frequent mistakes within the Kurdish language.

The Kurdish scholar Tawfiq Wahbi compares Sheikh Reza's poetry to a deep ocean that must be delved into to understand. Like an ocean, whenever we dive in, we find greater and greater depths.

# ڕۆڵی (ی) لە زمانی کوردیدا

**د. عاتف عەبدوڵڵا فەرهادی**
بەشی کوردی – کۆلێژی زمان
زانکۆی سەلاحەددین – هەولێر

**پێشەکی:**

(ی) یەکێکە لەو کەرەستانەی لەڕووی بەکارهێنانەوە ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێ لە زمانی کوردیدا، لەبەر ئەوەی تاکو ئێستا لێکۆڵینەوەیێکی زمانەوانیی زانستییانەی لەبارە نەکراوە، کە هەموو لایەنەکانی وەک (دەنگسازی، مۆرفۆلۆژی، سینتاکس) لەخۆ بگرێ، هیچ بەرهەمێکی سەربەخۆی بۆ تەرخان نەکراوە، جگە لە هەندێ ڕێزماننووس نەبێ، کە لابەلا لە کتێب و گۆڤارەکاندا لەگەڵ بابەتی تردا باسی لایەنێکیان کردووە. ئینجا لەبەر گرنگیی (ی) ئەم بابەتەمان هەڵبژاردووە، بەمەبەستی ئەوەی بەپێی توانا لێی بکۆڵینەوە و ئەو لایەنانە ڕوون بکەینەوە، کە پەیوەندییان بەم بابەتەوە هەیە.

کەرەستەی توێژینەوەکە لە چوارچێوەی (دیالێکتی ناوەڕاست)ی زمانی کوردیدایە، نموونەکانیش لە ئاخاوتنی ڕۆژانەی خەڵک و ئەوانە وەرگیراون، کە تایبەتن بە زمانی کوردی (دیالێکتی ناوەڕاست).

ڕێبازی لێکۆڵینەوەکە وەسفیی شیکارییە.

توێژینەوەکەمان بێجگە لە پێشەکی و ئەنجام لە دوو بەش پێکدێت:

لە بەشی یەکەمدا بەسەر ئەو کارانەدا چووینەوە، کە باس لە (ی) دەکەن لەگەڵ هەڵسەنگاندنێکی گشتی کارەکان.

لە بەشی دووەمدا باسی ڕۆڵی (ی)مان کردووە بەپێی ئاستەکان (دەنگسازی، مۆرفۆلۆژی، سینتاکس). دوای ئەمە ئەو ئەنجامانە خراونەتە ڕوو، کە لە بارەی لێکۆڵینەوەکە پێی گەیشتووین. لە کۆتاییشدا کورتەی باس بە زمانی عەرەبی و زمانی ئینگلیزی نووسراوە، ئینجا لیستی سەرچاوەکان.

## بەشی یەکەم

## پێداچوونەوە و خستنەڕووی هەندێ لەو کارانەی باس لە (ی) دەکەن:

ئەگەر بەسەر ئەو کارانەدا بچینەوە، کە لەبارەی زمانی کوردی کراون و سەرنج لەو شوێنانە بدەین، کە باس لە (ی) دەکەن، دەبینین هەندێ لەم ڕێزماننووسانە لە دووتوێیی باسەکانیاندا بە شێوەیێکی ناڕاستەوخۆ پەنجەیان بۆ ئەم بابەتە ڕاکێشاوە بەپێی بیر و بۆچوونی خۆیان باسیان لێوەکردووە، واتە بە شێوەیێکی سەربەخۆ بەپێی ئاستەکانی زمان لە چوارچێوەی بابەتێکی زانستیی سەربەخۆ لێیان نەکۆڵیوەتەوە، بۆیە بە پێویستمان زانی بەسەر ئەو کارانەدا بچینەوە و بیانخەینە ڕوو، کە لەلایەن ڕێزماننووسانی کوردییەوە کراون بەو نیازەی بابەتییانە وێنەیێکی ڕوون بکێشین بۆ هەندێ لەو کارانە:

- تۆفیق وەهبی ۱۹۲۹: لە کتێبی دەستووری زمانی کوردیدا باسی (ی) دەکات و دەڵێ: بە ئەداتی (ی) ناوی دروستکراو لە ناو دروست دەکرێت وەک: ( ژن+ ی = ژنی، کچ+ ی = کچی، ...) هەروەها ئەو ئەداتە سیفەتی چۆنی دروست دەکات وەک: (زستان+ ی = زستانی ، قاوە+ی = قاوەیی، ...) (تۆفیق وەهبی : ۱۹۲۹ ، ٥٤).

- نووری عەلی ئەمین ١٩٥٦: لە تەرکیبی اضافی باسی (ی) دەکات و بەحەرف ناوی دەبات و دەڵێ: (ی) حەرفی اضافەیە (مضاف و مضاف الیە) بەیەکتر دەبەستێتەوە وەک: ژنی برا، چرای شەو، ...) هەروەها نووسەر لەلاپەڕە ٧٩شدا (ی) بە ڕاناوی بەستەری داناوە و دەڵێ: ئەم ڕاناوە بۆ گرێدانی مبتدا و خەبەر بەیەکەوە هێنراوە وەک: باخەکە دەرگاکەی داخراوە (نووری عەلی ئەمین: ١٩٥٦ ، ٥٠-٧٩ ).

- مەسعود محەمەد ١٩٧٣: باس لە بەکارهێنانی (ی) لەڕێزمانی کوردیدا دەکات و دەڵێ: پیتی (ی) بۆ وەسف و ئیزافە و شەخسی سێیەم لە فرمانی مازی تێپەڕدا بەکاردێ وەک: (بەردی ڕەق، کراسی بارام، کردی ، چاندی) (مەسعود محەمەد :١٩٧٣، ٥٣).

- فاڕووق عومەر سدیق ١٩٧٥: لە وشەسازی لەزمانی کوردیدا لە ڕووی مێژووییەوە باس (ی) دەکات و دەڵێ: سوفیکسی (ی)ی ناوی ئەبستراکتی چ

لە ڕووی بەرهەمـــدارییەوە و چ لە ڕووی ئەو ڕۆڵە گەورەیەی کە لە مەیـــدانی وشەسازی لە زمانی کوردیدا دەبینێت زیاترە لە سوفیکسی (ی) کە سیفەتی نیسبی دروست دەکات وەک: (خۆش+ ی = خۆشی، جوان+ی = جوانی، زەیتوون+ی = زەیتوونی، پشدەر+ی = پشدەری ...) (فارووق عومەر سدیق: ١٩٧٥، ٤٣٥).

-سالح حسێن پشدەری ١٩٨٥: لەژێر ناونیشانی هێندێ نیشانە لەگەڵ وشەی ناویدا دەڵێ: پیتی (ی) دەچێتە سەر ناوی بەرجەستە دەیکات بە ناوی بێ جەستە (مەعنەوی) وەک : دز+ی = دزی. شلی، خەستی... جگە لە وەش (ی) بۆ پاڵدان (نسبـە)یە وەک: دزەیی، خۆشناوی، هەورامی... (سالح حسێن پشدەری : ١٩٨٥ ، ٢٥).

- کوردستان موکریانی ١٩٨٦: لە بەشی ئامرازەکانی خستنەسەردا باس لە (ی) دەکات و دەڵێ: ئامرازی (ی) ی خستنەسەر ئەو ئامرازەیە، کە دیارخراو و دیارخەر بەیەکەوە دەبەستێت. خستنەسەر لە زمانی کوردی پێوەندی وەسفی، ئاوەڵنێوی، چۆنیەتی، لەمەڕی و خاوەنێتی نێوان دیارخەر و دیارخراو دەردەخات. ئیتمۆلۆژی ئامرازی خستنەسەر لە زمانەکەماندا دەگەڕێتەوە سەر جێنێوی هەیی (هی — ئی) لە شێوەی کرمانجی خواروو (کوردستان موکریانی : ١٩٨٦، ١٢٩).

- عەبدوڵڵا حوسێن ڕەسول ١٩٩٥: لەبابەتی ناوبڕدا دەڵێ: پیتی (ی) ئەبێتە ناوبڕ لە نێوان دوو پیتە بزوێندا، لەم بارەدا خۆی ئەبێتە نەبزوێن ، وەک: چووبایە/ بچوایە، هات بایە/ بهاتایە، لەم بارەدا (ی) ئەکەوێتە نێوان (ا)ی مۆرفیمی ڕابردوو لەگەڵ (ە)ی مۆرفیمی کاتی ئێستا. ( عەبدوڵڵا حوسێن ڕەسول: ١٩٩٥ ، ٨٦).

- محەمەد ساڵح سەعید ١٩٩٨: بابەتێکی بە ناونیشانی (زمانی کوردی و پیتی (و) لەگەڵ (ی) دا، برڵاو کردەوەتەوە تیایدا لەڕووی دەنگسازییەوە باسی (ی) کردووە و بە پیت ناوی بردووە.

- ڕەفیق محەمەد شوانی ٢٠٠٣: باس لە دەوری ئامرازی پەیوەندی (ی) دەکات و دەڵێ: ئامرازی بەستنەوەی (ی) لە لێکدانی گرێی ناوی لە (ناو+ناو)،

(ناو+ڕاناو)، (ناو+ئاوەڵناو)، لە (ناو+ ئاوەڵفرمان) بەشداری دەکات و دەوری (هەیی) و (وەسفی و جۆر) لە چۆنیەتی لێکدانەکەیدا، لە ئامرازەکانی تری بەستنەوەدا جیا دەکاتەوە. نموونەشی بۆهەر یەکەیان هێناوەتەوە.(ڕەفیق محەمەد شوانی :٢٠٠٣، ٧٣ ).

- وریا عومەر ئەمین ٢٠٠٤: لە ژێر ناونیشانی ڕێزمانی هەیی لەزمانی کوردیدا باسی (ی) دەکات و دەڵێ: یەکێ لە یاساکانی داڕشتنی فرێزی ناوی لەزمانی کوردیدا ئەوەیە (فرێز لە ناوێ یا زیاتر پێک دێت). ئەگەر پەیوەندیی نێوان ناوەکان لەسەر بناغەی (هەیی) دابێ. ناوەکان بە ئامرازی بەستن (ی) لێک دەدرێن وەک: - من کلیلی دەرگای ژوورەکەم ون کرد (وریا عومەر ئەمین: ٢٠٠٤، ٣١٦).

- لێژنەی زمان و زانستەکان ٢٠١١: لە بابەتی ڕاناوی کەسی سێیەمی تاکدا باس لە (ی) دەکەن دەڵێن: ڕاناوی کەسی سێیەمی تاک لە کاری تێپەڕی ڕابردوودا لە شکلی (ی) دەردەکەوێ وەک: خواردی، کردی، کێڵای،... هەر ئەو (ی)ەیە دەبێتە مضاف الیە و بە دوا هەندێ پریپۆزشندا دێت:

- دارا نەهات برای هات — براکەی هات.

- لێیەوە دیارە، پێی گرانە.

دەشبێتە بەرکار وەک: دەیبینم، دەیدوێنین.( لێژنەی زمان و زانستەکان: ٢٠١١، ٤٧).

## هەڵسەنگاندنێکی گشتیی کارەکانی پێشتر:

ئەوەی بەشێوەیێکی گشتی لە هەموو کارەکانی پێشتر تێبینی دەکرێت ئەوەیە، کە ڕێزماننووسەکان بە زۆری لەلایەنێک دەدوێن و لایەنەکانی تر فەرامۆش دەکەن. لێرەدا چەند خاڵێکی گشتی دەخەینە ڕوو، کە زۆربەی بەرهەمەکان دەگرێتەوە لەوانە:

١- زۆربەی ڕێزماننووسەکان لە چوارچێوەی ئامرازدا باسیان کردووە واتە زیاتر لە ڕووی مۆرفۆلۆژییەوە باسی بابەتەکەیان کردووە، نەک لە ڕووی سینتاکسەوە.

٢- لە زمانی کوردیدا هەریەک لە ڕێزماننووسەکان زاراوەی جیاجیایان بۆ (ی) بەکارهێناوە لەوانە (پیت ، ئامراز، مۆرفیم، ڕاناو، حەرف، ئەدات، سوفیکس...) بەڵام ئێمە لەم لێکۆڵینەوەیەدا بەباشمان زانی کە بەپێی ئاستەکان ناوی بنێین لە ئاستی دەنگسازی بە دەنگ یان فۆنیم ، لەئاستی مۆرفۆلۆژی بە مۆرفیم (گیرەک ، نووسەک)، مۆرفۆسینتاکس... هتد.

٣- زۆربەی ڕێزماننووسەکان لە باسکردنی (ی)دا تێکەڵییەکیان کردووە لە نێوان دەنگسازی و مۆرفۆلۆژی.

## بەشی دووەم
## ڕۆڵی (ی) بەپێی ئاستەکان

ئاستەکانی زمان هەموویان پەیوەندییەکی تێکچڕژاوییان بەیەکەوە هەیە، واتە سنوورێکی دابڕ لە نێوان ئاستەکانی زماندا نییە، تەنیا بۆ لێکۆڵینەوە و وردەکاری و ئاسانکاری زیاتر ئاستەکانی زمان پۆلێن کراون و لەیەکتری جیا کراونەتەوە. بۆ دۆزینەوە و دەستنیشانکردنی ڕۆڵی (ی)ش وەک هەر کەرەستەیەک، یان یەکەیەکی تری زمان، پەنا دەبرێتە بەر ئاستەکان بۆ ئەوەی لایەنەکانی ئەم کەرەستەیە، یان یەکەیە ڕوون بکرێتەوە و دەستنیشان بکرێ.

### یەکەم: ڕۆڵی (ی) لە ئاستی دەنگسازیدا:

دەنگسازی ئاستێکە لە ئاستەکانی زمان، کە لە دەنگ و فۆنێمەکانی زمان دەکۆڵێتەوە، واتە زانستێکە لەبارەی پێکهاتنی دەنگی زمان لە دروستبوون و ئەرکی بچووکترین دانەی بێ واتایی زمان (فۆنێم، بڕگە) دەکۆڵێتەوە (ئەوڕەحمانی حاجی مارف: ٢٠٠٠ ، ٣). دەنگسازی بەشێوەیەکی گشتی دوو لق دەگرێتەوە ئەوانیش (فۆنەتیک و فۆنۆلۆژی)ن. فۆنەتیک ئەو لقەی زانستی زمانەیە، کە لە دروستکردن و گواستنەوە و وەرگرتنی دەنگەکانی زمان دەکۆڵێتەوە وەک دیاردەیێکی گشتی (وریا عومەر ئەمین: ٢٠٠٤ ، ٤٦)، واتە بریتییە لە وەسفی ئاخاوتن وەکو دیاردەی فیزیکی و چۆنیەتی بەرهەمهێنان و وەرگرتنی دەنگەکان (لەلایەن گوێگرەوە) (هـ. د. ویدۆوسن: ٢٠٠٨ ،١٤٧).

فۆنۆلۆژیش ئەو لقەی زانستی زمانە، کە لە یاسای دەنگەکانی زمان دەکۆڵێتەوە. ئەم دوو لقەی دەنگسازی هەریەکەیان ئامانج و پەیڕەوی تایبەتی خۆی هەیە لە شیکردنەوەدا، فۆنەتیک ڕوونکردنەوەمان دەداتێ لەسەر دەنگەکانی زمان، کە چۆن ئەم دەنگانە دروست دەبن و هەڵوێستی ئەندامەکانی ئاخاوتن (لێوەکان، ددانەکان، گەروو، دەم، پووک ... هتد) لەکاتی دروستبوونی ئەو دەنگانەدا چۆنە، لەگەڵ خستنە ڕووی چۆنیەتی گواستنەوەی شەپۆلە دەنگییەکان لە بۆشایی هەوا و گەیشتنی بە گوێی بیسەر، واتە فۆنەتیک تایبەتی و سیماکانی هەر دەنگێک ڕوون دەکاتەوە. (شرف الدین الراجحي و.. : ٢٠٠٣، ١٩٨) فۆنۆلۆژیش کارەکەی بریتییە لە جێگیرکردنی هەلومەرجەکانی دەرکەوتن و بەکارهێنانی ئەو دەنگانە لەگەڵ یەکتر، واتە دیراسەکردنی فۆنێم و پەیوەندییەکانی بە سیستەمی دەنگەوە [1].

### ١ -(ی) لە ڕووی فۆنەتیکەوە:

#### آ – دەنگی [ی] لە ڕووی فۆنەتیکی دەربڕینەوە:

دەنگی [ی] وەک بزوێن و نەبزوێن خۆی دەنوێنێت لە هەردوو شێوەکەدا لە ڕووی درکاندنەوە تایبەتمەندی خۆی هەیە:

یەکەم/ دەنگی [ی] وەکو بزوێن لە ڕووی درکاندنەوە خاوەنی ئەم تایبەتییانەی خوارەوەیە:

١- دەنگی [ی] لەبارەی چۆنییەتی جوولانەوەی زمان بە شێوەی ئاسۆیی بزوێنی ڕیزی پێشەوەیە، واتە لەکاتی گۆکردنی ئەم دەنگە زمان بە شێوەی ئاسۆیی بەرەو پێشەوە دەچێت (ئەوڕەحمانی حاجی مارف: ١٩٧٦، ٢٥).

٢- دەنگی [ی] لەبارەی ڕادەی هەڵبڕین و دانەواندنی زمانیشەوە – واتە لە شێوەی ستوونی جوولانەوەی زمان بە بزوێنی سەروو دەژمێردرێ، کە لە کاتی گۆکردنیدا زمان بەرەو سەروو هەڵدەکشێ.

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر سەیری ئەم سەرچاوەیە بکە: عاتف عەبدوڵڵا فەرهادی: ٢٠١٣، هەندێ لایەنی دەنگسازی شێوەزاری باڵەکایەتی لەسەر بنچینەی (Praat)، ئەکادیمیای کوردی، ل ١١ – ٥٣.

٣- دەنگی [ی] سەر بە بزوێنە درێژەکانە.
ئەلەفۆنی بزوێنی [ی] لە زمانی کوردیدا ئەمانەی خوارەوەن:
١- [ی] زۆر درێژە، هێزی لەسەرە لە کۆتایی وشە وەک (کوردی، نەوی).
٢- [ی] درێژە، لە ناوەندی وشەیە، وەک (تیر، نیوە).
٣-[ی] نیو درێژە، لە بڕگەی بێ هێز، وەک (کیسە).
٤- [ی] کورتە، پێش دوو نەبزوێن، وەک (بیست، دیت).
٥- [ی] زۆر کورتە، پێش نیمچە بزوێن، وەک (ماسییەکە).

دووەم/ دەنگی [ی] وەکو نەبزوێن لە ڕووی درکاندنەوە خاوەنی ئەم تایبەتییانەی خوارەوەیە:
١- لەڕووی (کپ) ی و گڕ(ئاوازەدار)ییەوە بەر دەنگە ئاوازەدارەکان دەکەوێت.
٢- لە ڕووی دەربڕینەوە سەر بە جۆری (خشۆکە).
٣- لە شێوەی دەربڕیندا دەنگێکی کەم دەنگە.
٤- دەنگی [ی] دەنگێکی زمانەکییە، واتە لە شێوەی دەربڕینیشدا ناوەڕاستی زمان بەشداری لەدەربڕینی دەکات.

## ب- دەنگی[ی ] لە ڕووی فۆنەتیکی فیزیکییەوە:

وەک باسمان کرد دەنگی/ی/ دوو شێوەی هەیە، بزوێن و نەبزوێن، کە لە ئەلف و بێی لاتینی دوو فۆرم و شێوەی جیاوازی هەیە[ی-i] بزوێن و [ی-y ] نەبزوێن. لەڕێگەی تاقیگەی دەنگییەوە بە بەراوردکردنی چەند وشەیەک کە دەنگی [ی-i] بزوێن لەگەڵ [ی-y ] نەبزوێنیان تێدابێت دەرکەوتووە کە لە سیما فیزیکییەکانی وەک (ماوەی خایەندراو، توندی دەنگ و پلەی دەنگ) لەیەک نزیکن، بەڵام جیاوازیشیان هەیە، بۆ نموونە لەڕووی ماوەی خایەندراوەوە بە شێوەیەکی گشتی [ی-i]ی بزوێن درێژترە لە [ی-y ]ی نەبزوێن، جگە لە کۆتایی وشە نەبێت بە پێچەوانەیە و [ی-y ]ی نەبزوێن درێژترە لە [ی-i]ی بزوێن.

لەڕووی توندی دەنگەوە [ی-y ]ی نەبزوێن لە سەرەتا و ناوەڕاستی وشە ڕادەکەی بەرزترە لە [ی-i]ی بزوێن، کەچی لە کۆتایی وشە بە پێچەوانەیە.
لە رووی پلەی دەنگەوە لە سەرەتا و ناوەڕاست و کۆتایی وشەدا بەگشتی پلەی دەنگی [ی-i]ی بزوێن بەرزترە لە پلەی دەنگی [ی-y ]ی نەبزوێن.
(عاتف عەبدوڵڵا فەرهادی: ٢٠١٣، ٢٧٢ – ٢٧٣).

**٢-(ی) لە ڕووی فۆنۆلۆژییەوە:**

- یاسا دەنگییەکانی فۆنێمی /ی/ لە زمانی کوردیدا:

یەکەم/ جێناوی لکاوی کەسی سێیەمی تاک لەگەڵ کاری ڕابردوودا خۆی بە قاڵبی (ی) دەردەخا بەم شێوەیەی خوارەوە:

١- ئەگەر ڕەگەکە بە نەبزوێن کۆتایی هاتبێ جێناوەکە بە بزوێن دەردەکەوێ وەک:

- کردی.
- ڕشتی.

٢- ئەگەر ڕەگەکە بە بزوێن کۆتایی هاتبێ جێناوەکە بە نەبزوێن دەردەکەوێ وەک:

- هێنای.
- درووی.

دووەم/ لە ئەنجامی لە یەکدانی فۆنیمەکان هەندێ دەنگ پەیا دەبێ یەکێک لەوانە دەرکەوتنی (ی)ە ، وەک:

١- لە ئەنجامی لێکدانی مۆرفیمەکان ئەگەر دوو بزوێن کەوتنە پاڵ یەک، بە شێوەیێکی گشتی (ی) لە نێوانیاندا دەردەکەوێ وەک:

- چەقۆ+ ە کە = چەقۆیەکە.
- مامۆستا+ ان = مامۆستایان.
- ڕێ+ ە کە = ڕێیەکە.

لە بەشی زۆری ناوچەی موکریاندا لە نێوان ناو و مۆرفیمی نە ناسراوی (ێک) دا (ی) نەبزوێن پەیدا دەبێ، وەک:

- پادشا + ی + ێک = پادشایێک.
- دێ + ی + ێک = دێیێک. (ئەورەحمانی حاجی مارف: ۱۹۷۹ ، ۲۰۵).

۲- دەرکەوتنی (ی) کە فەرمانی بێ هێز (ە) دەچێتە سەر ئەو وشانەی بە بزوێن کۆتابییان دێ ( وریا عومەر ئەمین : ۲۰۰٤، ۱۱۰) وەک:

- ئازاد مامۆستا — ە __________ ئازاد مامۆستایە.
- ئەوە دۆ — ە ___________ ئەوە دۆیە.
- پەنجەرە — ە ___________ پەنجەرەیە.

۳- دەرکەوتنی (ی) نەبزوێن لە نێوان دوو بزوێنی (ە) و (ێ) دا لە شێوازی فەرماندانـدا، بەتایبەتی لەگەڵ کاری (دان) دا ئەگەر بەرکاری ناڕاستەوخۆ بە جێناوێکی لکاو دەربڕا پێشبەندی (بە) دەبێتە پاشبەندێکی فەرمانی و قالبی (ێ) دەگرێتە خۆ (وریا عومەر ئەمین: ۲۰۰٤، ۱۵۲) وەک:

- کتێبەکانم بدەیێ.
- کەلوپەلەکەم بدەیێ.

**دووەم: ڕۆڵی (ی) لە ئاستی وشەسازیدا (مۆرفۆلۆژی):**

وشەسازی بریتییە لە لێکۆڵینەوەی ڕۆنانی وشە و چۆنیەتی کارکردنی مۆرفیمەکان لە هەردوو پرۆسەی وشە داڕشتن و وشە گۆڕکێدا. مۆرفیمی (ی) یەکێکە لەو مۆرفیمانەی کە ڕۆڵی سەرەکی هەیە لە زمانی کوردیدا بە شێوەیەکی بەربڵاو و ئاشکرا ڕۆژانە بەکاری دەهێنین کۆمەڵێک ڕۆڵ دەبینێ لەوانە:

**یەکەم/ مۆرفیمی /ی/ وەک مۆرفیمی بەندی داڕشتن (گیرەک):**

مۆرڤیمی/ی/ وەک بەندی داڕشتن بەشداری لە پێکهێنانی وشەدا دەکات بەم شێوەیەی خوارەوە:

- ڕۆڵی /ی/ وەک پاشگر :

۱- ناوی داڕێژراو

-ناو+ی = ناوی داڕێژراو وەک:

منداڵ+ ی = منداڵی

شیر+ی = شیری

- ئاوەڵناو+ ی = ناوی واتایی داڕێژراو

ڕاست+ ی =ڕاستی

شیرین+ ی = شیرینی

جوان+ ی = جوانی

بەرز+ ی = بەرزی

خۆش+ی = خۆشی

٢-ئاوەڵناوی داڕێژراو:

- ناو+ ی = ئاوەڵناوی داڕێژراو، (واتە (ی) دەچێتە سەر ناو، ڕەنگی ئەو ناوە بەدیار دەخات) وەک:

خاک+ ی = خاکی

گەنم+ ی = گەنمی

نارنج+ ی = نارنجی

- هەروەها (ی) دەچێتە سەر ناو بۆ بەخشینی نەسەب بەهۆی شوێنەوە (محەمەد مەعرووف فەتاح و سەباح ڕەشید قادر: ٢٠٠٦، ٧٨) وەک:

هەولێر+ی = هەولێری

جیهان+ ی = جیهانی

کەرکووک+ی = کەرکووکی

سۆران+ ی = سۆرانی

دهۆک+ ی = دهۆکی

- (ی) وەکو پاشگر بە هەندێ ناوەوە دەلکێت و ناوی پیشەیی دروست دەکات (دلاوەر شێخ محەمەد: ٢٠٠٧ ، ٦٢) بۆ نموونە:

شوان+ ی = شوانی

گاوان+ ی = گاوانی

باخەوان+ ی = باخەوانی

**دووەم/ مۆرفیمی /ی/ وەک مۆرفیمی کاتی ڕابردوو:**

- نانەکەم کڕی. ـــــــم کاتی ڕابردوو.

- دارەکەم بڕی.——— م کاتی ڕابردوو .
- وانەکەیان نووسی.______ م کاتی ڕابردوو.

**سێیەم/ مۆرفیمی /ی/ وەک جێناوی لکاو:**

- /ی/ جێناوی لکاو بۆ کەسی دووەمی تاک وەک:
- تۆ دەچی بۆ بازاڕ.
- تۆ باش دەخوێنی.
- /ی/ جێناوی لکاو بۆکەسی سێیەمی تاک وەک:
- ئەو نانەکەی خوارد.
- ئەو بردی.

لێرەدا دەتوانین بڵێین /ی/ بەتایبەتی بۆ کەسی سێیەمی تاک نووسەکە، چونکە یەکێک لە تایبەتییەکانی ئەوەیە، کە نووسەک گوێ بە وشە نادات و بنکە هەڵنابژێرێ و بە کەرتێکی ڕستەوە، بەتایبەتی بە گرێوە دەلکێ (محەمەد مەعرووف فەتاح و سەباح ڕەشید قادر: ٢٠٠٦، ٣٢)، بۆ نموونە نووسەکی کەسی (← ی) لەم ڕستانەدا هەرجارە بە شوێنێکەوە دەلکێ:

- پارەکەی برد. بە بەرکارەوە نووساوە.
- بۆ منی نارد. بە بەرکاری ناڕاستەوخۆوە نووساوە.
- بردی. بەکۆتایی کارەوە .
- هەڵی دەگرتن. بە مۆرفیمی بەندی داڕشتن (پێشگر).
- دەی کڕی. بە مۆرفیمی ڕووکارەوە (بەردەوامی).
- نەی دەکڕی. بە مۆرفیمی ناکردنەوە.
- زۆری گرت. بە ڕادەوە.
- لێی سەند. بە ئامرازی بەندەوە.

**چوارەم(ی) وەک ئامرازی خستنەسەر:**

ا- دەچێتە سەر ناو بەهەموو جۆرەکەیەوە وەک:

- ناوی تایبەتی ئازادی برام .
- ناوی گشتی خانووی گەورە.

- ناوی کۆمەڵ گەلی کوردستان.
- ناوی واتایی دوژمنایەتی ئێوە.
- ناوی بەرجەستە چاوی تۆ.
- ناوی سادە گوڵی جوان.
- ناوی داڕێژراو باخەوانی ئێمە.
- ناوی لێکدراو ڕەشەبای زستان.

ب- دەچێتە سەر ئاوەڵناو. وەک:

- گەورەی ئێوە.
- ڕەشی چاو.
- جوانی لادێ.

پ- دەچێتە سەر ژمارە وەک:

- بیست و یەکی ئادار.
- یەکی نیسان.
- دووی شوبات.

ت- دەچێتە سەر جێناو وەک:

- منی بێکەس.
- تۆی بێ هیوا.

ئێوەی ناپاک.

ج — دەچێتە سەر چاوگ وەک:

- گرتنی تۆ.
- خوێندنی کوردی.
- فرۆشتنی خانوو.

**سێیەم: ڕۆڵی (ی) له ئاستی ڕستەسازیدا (سینتاکس):**

سینتاکس دەستووری ڕیزکردن و دانەپاڵ یەکتری کەرەسەکان و دیاریکردنی ئەو لێکدانانەیە، کە پەسەندن لە زمانێکدا، هەر وەک دەزانرێت گەورەترین یەکەی لێکۆڵینەوە لە ئاستی سینتاکسیش ڕستەیە ، ڕستە

گەورەترین یەکەی (ڕێزمانی) زمانە. لە ڕووی ڕۆنانەوە سەربەخۆ بێت (محەمەد مەعرووف فەتاح، ١٩٩٠ ، ٩٨) ، واتە ڕستە لە کۆمەڵێک کەرەستەی دیاریکراو پێکدێت، کە بەگوێرەی چەند یاسایەک داڕێژراون، ئەو کەرەستە دیاریکراوانە هەندێکیان سەرەکین ، هەندێکیان ناسەرەکین، کەرەستە سەرەکییەکان ئەو بەشانەی ڕستەیە، کە لە پێکهاتەی هەموو ڕستەیەکدا بەشداری دەکەن و بە شێوەیەکی گشتی ڕستە لە ڕووی ڕۆنانەوە بێ ئەوانە دروست نابێ (ئەحمەد حەسەن فەتحوڵڵا: ١٩٩٠ ، ٨٠). واتە ئەو کەرەستانە ناتوانرێ لابدرێن، چونکە کار لە پێکهاتەی ڕستەکە دەکەن. کەرەستە ناسەرەکییەکانی ڕستەش ئەو بەشانەی ڕستەیە، کە لە پێکهێنانی هەموو ڕستەیەکدا بەشداری ناکەن، بەبێ هاریکاری کەرەستە سەرەکییەکانی ڕستە ناتوانن ڕستە پێکبهێنن. کەرەستەکان لەناو ڕستەدا چەند ئەرکێکی ڕێزمانی دەبینن، ئەرکەکانیش بریتین لە (بکەر، بەرکار، تەواوکار ... هتد).

(ی) یش یەکێکە لە کەرەستەکانی ڕستە کە ئەم ئەرکانەی خوارەوە دەبینێ:

<u>١- ئەرکی بکەر:</u>

- تۆ هاتی.———— (ی) جێناوی لکاوە بۆ کەسی دووەمی تاک (بکەرە).

- ئەو خواردی.———— (ی) جێناوی لکاوە بۆ کەسی سێیەمی تاک (بکەرە).

- ئەو خانووەکەی فرۆشت. (ی) جێناوی لکاوە بۆ کەسی سێیەمی تاک (بکەرە).

<u>٢- ئەرکی بەرکاری ڕاستەوخۆ:</u>

- دەی کوژم. (ی) جێناوی لکاوە بۆ کەسی سێیەمی تاک (بەرکارە). ڕستەکە لە بنچینەدا بەم شێوەیە: - من ئەو دەکوژم.

- ئێمە بۆتی ئەنێرین. (ی) جێناوی لکاوە بۆ کەسی سێیەمی تاک (بەرکارە). ڕستەکە لە بنچینەدا بەم شێوەیە: - ئێمە ئەو بۆ تۆ ئەنێرین.

- دەمبردی. (ی) جێناوی لکاوە بۆ کەسی دووەمی تاک (بەرکارە). ڕستەکە لە بنچینەدا بەم شێوەیە:

- من تۆم دەبرد.

**٣- ئەرکی بەرکاری ناڕاستەوخۆ:**

- لێی وەردەگرمەوە. (ی) جێناوی لکاوە بۆ کەسی سێیەمی تاک (بەرکاری ناڕاستەوخۆیە). ڕستەکە لە بنچینەدا بەم شێوەیە:- من شتەکە لە ئەو وەردەگرمەوە.

- بۆی دەکڕن. (ی) جێناوی لکاوە بۆ کەسی سێیەمی تاک (بەرکاری ناڕاستەوخۆیە). ڕستەکە لە بنچینەدا بەم شێوەیە:- ئەوان کتێبەکە بۆ ئەو دەکڕن.

- پێی دەدەم. (ی) جێناوی لکاوە بۆ کەسی سێیەمی تاک (بەرکاری ناڕاستەوخۆیە). ڕستەکە لە بنچینەدا بەم شێوەیە:- من شتەکە بە ئەو دەدەم.

**٤- ئەرکی دیارخەر:**

- دەستم شکاندی. (ی) جێناوی لکاوە بۆ کەسی دووەمی تاک (دیارخەرە). ڕستەکە لە بنچینەدا بەم شێوەیە:- من دەستی تۆم شکاند.

- ئۆتۆمۆبیلەکەی فرۆشرا. (ی) جێناوی لکاوە بۆ کەسی سێیەمی تاک (دیارخەرە). ڕستەکە لە بنچینەدا بەم شێوەیە:- ئۆتۆمۆبیلەکەی ئەو فرۆشرا.

- منداڵەکەی خنکا. (ی) جێناوی لکاوە بۆ کەسی سێیەمی تاک (دیارخەرە). ڕستەکە لە بنچینەدا بەم شێوەیە:- منداڵەکەی ئەو خنکا.

- شوێنی (ی) لە ڕستەی بە جێناو جێگیرکراودا:

مەبەست لە ڕستەی بە جێناو جێگیرکراو ئەوەیە، کە بەشەکانی ناو ڕستە بە تایبەتی بەشە سەرەکییەکانی وەک بکەر و بەرکار بەئاشکرا لە ناو ڕستەدا نایێت، بەڵکو جێناوە لکاوەکان ئەرکی بەشەکانی ناو ڕستە دەگێڕن و دەچنە سەر کارەکە (ساجیدە عەبدوڵڵا فەرهادی: ٢٠١٣، ٩٥). جێناوی لکاوی (ی)یش لەم جۆرە ڕستەیەدا بەپێی جۆری کارەکە لە ڕووی کات و لە ڕووی هێزەوە (تێپەڕ و تێنەپەڕ) شوێنی دەگۆڕێت بەم جۆرەی خوارەوە:

١- جێناوی لکاوی (ی) ، کە بۆ کەسی دووەمی تاک بەکاردێ ئەرکی بکەر دەبینێ لەگەڵ کاری ڕابردووی تێنەپەڕدا شوێنەکەی دواوەی کارە وەک:

- چووی. ڕەگ+ م (کات)+ (ی) بکەر. ( حاڵەتی ئەرێ).
- دەچووی. دە + ڕەگ+ م (کات)+ (ی) بکەر.
- نەدەچووی. نە+ دە + ڕەگ+ م (کات)+ (ی) بکەر. (حاڵەتی نەرێ).

٢- جێناوی لکاوی (ی) ، کە بۆ کەسی سێیەمی تاک بەکاردێ ئەرکی بکەر دەبینێ لەگەڵ کاری ڕابردووی تێپەڕدا شوێنەکەی پێش ڕەگی کارە ، بەرکار شوێنەکەی دواوەی کارە وەک:

- دەی زانی. دە + (ی) بکەر+ ڕەگ+ م (کات)+ (جێناو) بەرکار. (حاڵەتی ئەرێ).
- نەی دەزانی. نە + (ی ) بکەر+ دە + ڕەگ+ م (کات)+ (جێناو) بەرکار. (حاڵەتی نەرێ).

٣- جێناوی لکاوی (ی) ، کە بۆ کەسی سێیەمی تاک بەکاردێ ئەرکی بەرکار دەبینێ لەگەڵ کاری ڕابردووی تێپەڕدا شوێنەکەی پێش ڕەگی کارە، بکەریش شوێنەکەی دواوەی کارە وەک:

- دەی ناسم. دە + (ی) بەرکار+ ڕەگ+Ø م (کات)+ (جێناو) بکەر. ( حاڵەتی ئەرێ).
- نای ناسم. نا + (ی) بەرکار+ ڕەگ+Ø م (کات)+ (جێناو) بکەر. (حاڵەتی نەرێ).

## ئەنجام

گرنگترین ئەو ئەنجامانەی لە توێژینەوەکەدا بەدەستمان هێناون لەم خاڵانەی خوارەوەدا کۆدەبنەوە:

- (ی) وەک دەنگ بزوێن و نەبزوێنی هەیە کە لە هەندێ سیمای دەنگی لەیەک نزیکن، بەڵام لە ڕووی دەربڕین و فیزیکییەوە جیاوازییان هەیە.
- (ی) وەک فۆنیم ئەرکی گۆڕینی واتای وشە دەبینێت، ئەگەر لە جێگەی فۆنیمێکی تر دابنرێت.
- (ی) وەک مۆرفیمی بەندی دارشتن ڕۆڵێکی چالاکی لە پێکهێنانی وشەدا هەیە.
- (ی) وەک گیرەکی ڕێزمانی و نووسەک ڕۆڵی هەیە.
- (ی) یەکێکە لە کەرەستەکانی ڕستە کە ئەم ئەرکانە دەبینێ (بکەر، بەرکاری ڕاستەوخۆ، بەرکاری ناڕاستەوخۆ، دیارخەر).
- جێناوی لکاوی (ی) لە ڕستەی بە جێناو جێگیرکراودا بەپێی جۆری کارەکە لە ڕووی کات و لە ڕووی هێزەوە (تێپەڕ و تێنەپەڕ) شوێنی دەگۆڕێت.
- (ی) بەپێی ئاستەکان (دەنگسازی، مۆرفۆلۆژی، سینتاکس) لە زمانی کوردیدا ڕۆڵی جیاجیا دەبینێ.

**سەرچاوەکان:**

- ئەحمەد حەسەن فەتحوڵڵا، بکەر وەک بەشێکی سەرەکی ڕستە، نامەی ماستەر ، زانکۆی سەلاحەددین، ١٩٩٠.
- ئەورەحمانی حاجی مارف، زمانی کوردی لەبەر ڕۆشنایی فۆنەتیکدا، چاپخانەی کۆري زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٦.
- ئەورەحمانی حاجی مارف، ڕێزمانی کوردی ، بەرگی یەکەم (مۆرفۆلۆژی)، بەشی یەکەم، ناو، چاپخانەی کۆڕی زانیاری عیراق، بەغدا،١٩٧٩.
- ئەورەحمانی حاجی مارف، ڕێزمانی کوردی ، بەرگی یەکەم (مۆرفۆلۆژی)، بەشی پێنجەم، کردار، سلێمانی، ٢٠٠٠.
- تۆفیق وەهبی، دەستووری زمانی کوردی، جیزمی یەکەم، بەغدا، ١٩٢٩.
- دلاوەر شێخ محەمەد، شێوە و ئەرکەکانی (ی) له زمانی کوردیدا، گ. سابات، ژ ٤-٥ ئاداری ٢٠٠٧.
- ڕەفیق محەمەد محێدین شوانی، ئامرازی بەستنەوە لە زمانی کوردیدا، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٣.
- ساجیدە عەبدوڵڵا فەرهادی، چەند لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٣.
- سالح حسێن پشدەری، کورتەیەک لە ڕێزمانی کوردی، چاپخانەی بەغدا، بەغدا، ١٩٨٥ .
- شرف الدين الراجحي و سامي عياد حنا، مبادىء علم اللسانيات، دار المعرفة الجامعية، القاهرة، ٢٠٠٣.
- عەبدوڵڵا حوسێن ڕەسول، مۆرفیمە ڕێزمانییەکانی کار، نامەی دکتۆرا ، زانکۆی بەغدا، ١٩٩٥.
- عاتف عەبدوڵڵا فەرهادی، هەندێ لایەنی دەنگسازی شێوەزاری باڵەکایەتی لەسەر بنچینەی (Praat)، ئەکادیمیای کوردی، چاپخانەی حاجی هاشم – هەولێر ٢٠١٣.
- فارووق عومەر سدیق، وشەسازی لە زمانی کوردیدا، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی سێیەم، بەشی دووەم ١٩٧٥.
- کوردستان موکریانی، سینتاکسی ڕستەی سادە لە زمانی کوردیدا، دار الحرية ، ١٩٨٦.

- لێژنەی زمان و زانستەکانی لە کۆڕی زانیاری کورد، ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی، چاپخانەی کوردستان، هەولێر، ٢٠١١ .
- محەمەد مەعرووف فەتاح، زمانەوانی، هەولێر ، ١٩٩٠ .
- محەمەد مەعرووف فەتاح و سەباح ڕەشید قادر، چەند لایەنێکی مۆرفۆلۆژیی کوردی، چاپخانەی ڕوون، سلێمانی، ٢٠٠٦.
- مەسعود محەمەد، بەکارهێنانی (ی) لە ڕێزمانی کوردیدا، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی یەکەم، بەشی یەکەم، ١٩٧٣.
- نووری عەلی ئەمین، قەواعدی زمانی کوردی، بەغدا، ١٩٥٦.
- هـ. د. ویدۆوسن، سەرەتایەک بۆ زمانەوانی، و: د. هۆشەنگ فارووق، چاپخانەی خانی، دهۆک، ٢٠٠٨.
- وریا عومەر ئەمین، چەند ئاسۆیەکی تری زمانەوانی ، دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٤.

## خلاصة البحث

هذا البحث محاولة لتحليل **دور (ی) في اللغة الكوردية** وبحثها ووصفها من جوانب مختلفة، وذلك لأهمية دورها الجوهري في جميع المستويات اللغوية من حيث الاستعمال في اللغة الكوردية.

يعزى سبب اختيار هذا الموضوع إلى أهمية هذه الآلية اللغوية، ولعدم إجراء أية دراسة علمية بشأنها لحد الآن، تعالجها من الجوانب الصوتية والصرفية والنحوية، بمعنى آخر، لم يخصص لها أي نتاج علمي مستقل، باستثناء بعض الإشارات الطفيفة التي أوردها بعض النحويين بشكل متناثر بين طيات الكتب و المجلات ضمن موضوعات أخرى تناولت جانبا منها.

إن منهج البحث وصفي تحليلي واستقرئت مادة البحث ونماذجها في إطار اللهجة الوسطى للغة الكردية واستعمالاتها اليومية.

يتألف البحث من قسمين الى جانب المقدمة والنتائج. في القسم الأول عرضنا الجهود التي درست دور (ی) مع إجراء تقييم عام لها. أما القسم الثاني فعنون ب"دور (ی) حسب المستويات في اللغة الكوردية" منها المستوى الصوتي والصرفي والنحوي ( التركيبي).

ثم ختم البحث بملخص باللغتين العربية والإنكليزية وقائمة المصادر والمراجع المعتمدة.

## Abstract

The present paper, which is entitled 'The Role of /i-y/ in the Kurdish Language', is an attempt at analyzing and describing this sound from different perspectives. This sound plays a fundamental role in all linguistic levels in the Kurdish language. The selection of this topic is ascribed to its importance as well as the fact that no such study has so far been conducted; there has not been any study tackling the topic from phonological, morphological, and syntactic perspectives. However, some grammarians provide some simple notes about this topic in certain books and journals. But even those appear in the course of talking about some other topics.

The approach adopted here is a descriptive analysis of the central dialect of the Kurdish language.

The paper consists of two sections apart from the introduction and the conclusions: The first section is a study and an evaluation of the role of /i-y/. The second section concerns the role of /i-y/in all linguistic aspects in the Kurdish language, namely the phonological, morphological, and syntactic or structural.

# شێوازی سەرەوای
# غەزەلە کوردییەکانی مەحوی

**د.سیروان جەبار ئەمین**
فاکەڵتی ئاداب– زانکۆی سۆران

## پێشەکی
ناوونیشانی لێکۆڵینەوەکەمان بریتییە لە ((شێوازی سەروای غەزەلە کوردییەکانی مەحوی)) واتە چۆنییەتی مامەڵەکرنی مەحوی لەگەڵ هونەری سەروا.

شێوازناسیی سەروا واتە گەڕان بە دوای تایبەتمەندییەکانی سەروای شیعری شاعیرێکی دیاریکراو لە نێو دیوانەکەی. لەم لێکۆڵینەوەیەدا هەوڵدراوە بە شێوەیەکی ئاماری لەسەر بنەمای ژمارەی پیتەکانی سەروا، سەروای غەزەلە کوردییەکانی مەحوی بخرێتە بەر تیشکی لێکۆڵینەوە و تایبەتمەندییەکانی سەروای شیعرەکانی دەستنیشان بکرێت.

هۆی هەڵبژاردنی ئەم بابەتەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە مەحوی لە ڕووی سەرواوە خاوەن دەوڵەمەندترین دیوانە لە نێو شاعیرانی کلاسیکدا و زۆرترین ڕێژەی پیتەکانی بۆ ئەم مەبەستە بەکارهێناوە.

لە کۆتاییشدا ئەنجامەکانی لێکۆڵینەوەکە سەرەتا لە چوارچێوەی خشتەیەکی ئاماری خراوەتە ڕوو و پاشان لە چەند خاڵێکدا کۆکراوەتەوە.

وشە کلیلییەکان: سەروا، تایبەتمەندیی سەروا، شیعری مەحوی

### ١- پێناسەی سەروا
لە پێناسەی سەروادا هەیە دەڵێ: (( بریتییە لە دوو پیتی نەبزواو و پیتێکی بزواو کە لە نێوانیاندا دێت و دەکەوێتە کۆتایی دێڕە شیعر...))[1]، ئەمە یەکێکە لەو پێناسە کۆنانەی کە لە زمانی عەرەبیدا بۆ سەروا کراوە بەڵام پێناسەکە سروشتی زمانی عەرەبی تێدا لەبەرچاو گیراوە و بۆ گەیشتن بە

پێناسەیەک کە لەگەڵ سروشتی زمانی کوردیشدا بگونجێت، دەبێت بۆ پێناسەیەکی گشتگیرتر بگەڕێین.

لە پاش خستنە رووی پێناسەی سەروا لەلای زۆرێک لە نەتەوە جیاوازەکان و پاشان لەلای رەخنەگرانی ئەدەبی کوردی، لە کۆتاییدا بە لە بەرچاوگرتنی هەموویان پێناسەیەکی گشتگیر بە دەستەوە دەدات و تێیدا دەڵێت: ((سەروا بریتییە لەو دەنگە یا کۆمەڵە دەنگەی (کە هەندێ جار بە بڕگە و لای هەندێ بە تیپ ئاماژەی بۆ کراوە) لە کۆتایی وشە سەروادارەکان دووبارە دەبنەوە، ئەمە بە تایبەتی لە کۆتایی لەت یان دێڕە شیعر و هەندێ جار لە ناوەوەش دێ، هەروەکو دەشێ لە پەخشانیشدا هەبێ))[٢]. گەرچی ئەم پێناسەیە تارادەیەکی زۆر گشتگیرە و لەگەڵ سروشتی شیعر و زمانی کوردیشدا دەگونجێت، بەڵام بۆ بە وردی تێگەیشتنی پێویستمان بە زیاتر ڕوونکردنەوەی هەیە و لەم چەند خاڵەدا کۆکراونەتەوە[٣]:

یەکەم: دووبارەبوونەوەی یەک دەنگی بزوێنی درێژ یان چەند دەنگێک.

دووەم: دەنگە دووبارەبووەکان دەکەونە کۆتایی وشە سەروادارەکانەوە.

سێیەم: وشە هاوسەرواکان بە زۆری لە کۆتایی لەت یا دێڕە شیعردا دێن.

چوارەم: وشە هاوسەرواکان دەبێ مانایان جیابێ.

پێنجەم: سەروا ئەرکی مۆسیقی و دەلالیشی هەیە، جگە لە گرێدان و لێک دابڕاندنی پارچەکانی هۆنراوە.

### ١-٢- پێکهاتەی سەروا

لە پێناسەی سەروادا ئاماژە بەوە کرا کە سەروا بریتییە لەو چەند دەنگەی کە لە کۆتایی نیوە دێڕ یان دێڕە شیعردا دووبارە دەبێتەوە. ئەو وشەیەی کە دەنگەکانی سەروای تێدا دووبارە دەبێتەوە بە وشەی سەروا ناو دەبرێت[٤]. لەبەر ئەوەی مەرج نییە سەروا لە یەک دەنگ پێکبێت و زۆر جار بریتییە لە چەند دەنگێک بۆیە لە زانستی سەروادا پۆلێنکردنێک بۆ دەنگەکانی سەروا کراوە و هەر یەکەیان ناوێکی بۆ دانراوە.

لە زانستی سەروادا دەنگەکانی سەروا دابەش دەکرێن بەسەر سێ بەشدا کە ئەوانیش بریتین لە رەوی و پێش رەوی و پاش رەوی. رەوی باری

سەرەکیی ئاوازی شیعری لە ئەستۆدایە و لە پێناسەیدا هاتووە: ((دوا دەنگی بنچینەیی وشەی رەسەنی سەروایە و هۆنراوەی لەسەر بنیات دەنرێ و هۆنراوەکە هەر بە ناوی ئەوەوە دەکرێ بە تایبەت ئەگەر قیتعە و غەزەل و قەسیدە بێ))[٥] و لە زمانی کوردیدا جگە لە دەنگی بزوێنی کورت، سەرجەم دەنگەکانی دیکە دەتوانن ئەرکی رەوی بەجێ بگەیەنن.

پێش رەوی وەکو لە ناوەکەیدا بە دیار دەکەوێت بریتییە لە دەنگ یان ئەو دەنگانەی کە لە پێشەوەی رەوی دێن. ((تەنیا ئەگەر رەوی بزوێنی درێژ بێ پێویستی بە پێش رەوی نابێ، ئەگەر پێش رەوی دەنگێک یان چەند دەنگێک پەیرەو بکرێن لەبەر پێویستی نییە بەڵکو بۆ قووڵکردنەوەی ئاواز و بەهێزکردنی ترپە (ئیقاع)ی شیعرەکەیە))[٦] و ئاستی مۆسیقای پێبەرزتر دەبێتەوە.

دوا بەشی سەروا کە لە پاش رەوییەوە دێت بە پاش رەوی ناودەبرێت. پاش رەوی هەموو ئەو دەنگە زیادانە دەگرێتەوە کە لە ئەنجامی کردەیەکی مۆرفۆلۆژی و سینتاکسی بە رەوییەوە دەلکێن، واتە بەشێکی رەسەن و بنچینەیی وشەی سەروا نین. کەواتە رەوی ((ئەو دەنگە زیادانەیە کە وەکو مۆرفیمی رێزمانی بە کۆتایی وشەی سەرواوە دەلکێن، چونکە لە کوردیدا وشەی سەروا، بە شێوەیەکی رووت و رەسەنی خۆی بە رەوی کۆتایی دێ، تەنیا ئەگەر کۆتاییەکەی بزوێنی کورت بێ، جا کە لە رەوتی رستەی دێرە شیعردا زیادەیەکی رێزمانی پێوەلکا، ئەم زیادەیە بە پاش رەوی دەناسرێ))[٧] و لەم کاتەدا لەنگەری ئاوازی شیعرەکە لە رەوییەوە دەگوازرێتەوە بۆ سەر پاش رەوی کە دوا بەشی دێڕ یان نیوە دێڕە.

### ٢-١- شیعری مەحوی

مەحوی یەکێکە لە شاعیرانی شیعری کلاسیکی کوردی. مەحوی خاوەن حوجرە و خانەقا و بیریارێکی ئایینی بوو، ئەمەش بێ کاریگەری نەبووە لەسەر دنیای شیعریی ناوبراو چونکە بەشی زۆری شیعرەکانی خاوەن ناوەرۆکێکی ئایینی و عیرفانی و کاریگەر بە هەندێ لایەنی فەلسەفین و بێ گومان ناوەرۆکیش پەیوەندییەک لەگەڵ سەروا و رەهەندی واتایی سەروا دروست دەکات و کاریگەری لەسەر هەڵبژاردنی سەروا دەبێت.

لە ڕووی لایەنی هونەری شیعرەوە، مەحوی پابەندی یاساکانی شیعری کلاسیکی کوردی بووە و پەیڕەوی لەو بنەمایانە کردووە کە بوونەتە تایبەتمەندی بۆ شیعری کۆن، وەکو بەکارهێنانی کێشی عەرووز و یەکێتی سەروا (گەرچی چەند پارچە شیعرێکی جووت سەرواشی بە زمانی کوردی و فارسی هەیە) و هونەرەکانی ڕەوانبێژی و قاڵبە شیعرییەکانی وەکو غەزەل و تاک و چوارین و ...هتد.

لەگەڵ بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام، زمان و کەلتووری عەرەبی بە نێو نەتەوە موسـڵمانبووەکاندا بـڵاو بـوویەوە و لە زۆر ڕووەوە بـووە شوێنگرەوەی ئەوەی کە پێشتر هەبوو. ئەلف و بێی عەرەبی بووە ئەلف و بێی فەرمیی خوێندن و نووسین و زمانی نەتەوە تازە موسڵمانبووەکان پڕبوو لە وشە و زاراوەی زمانی عەرەبی، شیعر و نووسینیش لەم کارتێکردنە بەدەر نەبوو، و ئەم دیاردەیە مەحوی و شیعری کلاسیکی کوردیش لە خۆ دەگرێت و ئیدی شاعیران لەسەر بنەمای ئەلف و بێی زمانی عەرەبی سەروای شیعرەکانیان ڕێکدەخست و هەوڵیان دەدا سەرجەم پیتەکانی زمانی عەرەبی وەکو سەروا بەکاربێنن بۆ ئەوەی ببن بە خاوەنی دیوان.[٨].

### ٢-٢- سەروای شیعری مەحوی

سەروا بەشێکی سەرەکی و گرنگی شیعری کلاسیکیی کوردییە. شیعری کلاسیکیی کوردی لە ڕووی سەرواوە پەیڕەوی جۆری یەکێتی سەروای وەرگیراوە لە شیعری عەرەبی کردووە.

مێژووی هەبوونی سەروا لە زمانی کوردیدا ڕابردوویەکی کۆنی هەیە و بەشێک لە ڕەخنەگرانی ڕۆژئاوا ئاماژەیان بە هەبوونی سەروا کردووە لە زمانی ئاڤێستاییدا و پێیانوایە لە کۆندا شیعری لاتینی کاریگەریی ئەم سەروایەی کەوتووەتە سەر[٩].

بەشی هەرە زۆری شیعری نێو دیوانی مەحوی بریتین لە غەزەل کە سەد و سی و دوویان بە زمانی کوردین (حەفتا و پێنجیان بە زمانی فارسین) و تێیاندا پەیڕەوی سیستەمی یەکێتی سەروا کراوە و لە نزیکەی پەنجا غەزەلیشدا هونەری پاش سەروا بەکارهاتووە.

مەحوی وەکو هەموو شاعیرانی دیکەی شیعری کلاسیکی کوردی، شیعرەکانی و سەروای شیعرەکانی لەسەر ئەلف و بێی زمانی عەرەبی نووسیوە و پیتەکانی زمانی عەرەبی و تەنانەت ئەو پیتانەشی کە لە زمانی کوردیدا نین، بۆ سەروای شیعرەکانی هەڵبژاردووە و بۆ ئەم مەبەستەش پەنای بۆ هەندێ وشەی رەقی عەرەبی وەکو ((بەیاض)) ، ((حەدیث)) و ((واعیظ)) بردووە(١٠).

مەحوی یەکێکە لە شاعیرانی شیعری کلاسیکی کوردی کە زۆربەی پیتەکانی وەکو سەروا لە شیعرەکانیدا بەکارهێناوە و توانیویەتی بە سی و یەک پیت سەروا بۆ شیعرەکانی دروست بکات و پیتەکانی زمانی کوردی وەکو پیتەکانی ((ڵ)) و ((ژ)) و ((گ)) و چەند پیتێکی تایبەتی زمانی عەرەبی وەکو ((ض)) و ((ظ)) و ((ث))ی کردووەتە سەروا و بۆ ئەوەی وەکو وەستاکارییەکی ئەدەبیش توانیبێتی زۆرترین پیت بکاتە سەروا، لەو شوێنانەی کە سەروای بە هەندێ پیت دەست نەکەوتبێ هەوڵیداوە بە پاش سەروا ئەو پیتانەش لە نێو دیوانەکەیدا جێ بکاتەوە، بۆ نموونە لە بری سەروای پیتی ((ذ)) پاش سەروای ((مەلاذ))(١١) و لە بری سەروای پیتی ((چ)) پاش سەروای ((هیچ))(١٢)ی بەکارهێناوە.

بە شێوەیەکی گشتی توانیویەتی یەکێک لە دەوڵەمەندترین دیوانەکانی نێو شیعری کلاسیکی کوردی لە رووی سەرواوە بە هێنانەوەی سی و یەک رەوی کە ((بە پلەی یەک دێ لە ناو هەموو شاعیرەکان))(١٣)دا، پێشکەش بە خوێنەرانی بکات.

پێکهاتەی سەروا لە هەرسێ بەشی رەوی و پێش رەوی و پاش رەوی پێکدێت و سەروای شیعرەکانی مەحویش لە هەمان پێکهاتە دروست بووە و لە هەندێ شوێن تەنیا بە رەوی ئەرکی سەروا ئەدا کراوە و لە هەندێ شوێنی تریشدا پێش رەوی یان پاش رەوی و یاخود هەردووکیان بەیەکەوە بەشدارن لە دروستکردنی سەرواکەدا. ئەوەی کە بووەتە مایەی ئاڵۆزی بۆ ئاماژەکردن بەم لایەنەی سەروای غەزەلەکان جیاوازی پێکهاتەکەیە لە نێوان دێڕەکانی یەک غەزەلدا، واتە هەندێ جار سێ دێڕی جیاوازی یەک غەزەل خاوەن سێ پێکهاتەی جیاوازن و بۆ نموونە دێڕێک بە رەوی کۆتایی هاتووە و پێش سەروای لەگەڵدایە وەکو لەم دێڕەدا دەیبینین:

**دەمت چی؟ پڕ لە دوڕ، دورجێکی یاقووت**
**نیشانە و مۆری چی؟ خەططێکی زمڕووت      ل٨٠**

لێرەدا پیتی ((ت)) دوا پیتی ڕەسەنی وشەی سەروایە و دەبێتە ڕەوی و پیتی ((وو))یش پێش ڕەوییە، کەچی سەروای دێڕێکی دیکەی هەمان غەزەل لە ڕەوی و پاش ڕەوی پێکهاتووە وەکو لەم دێڕەدا بەرچاو دەکەوێت:

**لە غەمزەی چاوت ئەبرۆ داگرە و بەس**
**مەکە بۆ قەتڵی عاشق ڕەنجە، بازووت      ل٨١**

لێرەدا پیتی ((وو)) دوا پیتی ڕەسەنی وشەکەیە و دەبێتە ڕەوی و پیتی ((ت)) جێناوی لکاوە و لە ئەنجامی پرۆسەیەکی ڕێزمانییەوە بە وشەکەوە لکاوە و بەشێک نییە لە خودی وشەی سەروا و ئەرکی پاش سەروای بینیوە، بەڵام لەبەر ئەوەی کاری لێکۆڵینەوەکەی ئێمە ئامارییە و ژمارەی پیتە هاوبەشەکانی نێوان دێڕەکان دەکاتە کەرەستەی قسە لەسەر کردن بۆیە ئەم ئاڵۆزییەی پێکهاتەی سەروا ڕێگر نابێت لەبەردەم کارەکەدا.

## ٣-١- سەروای یەک پیتی ((یەکی))

سەروای یەک پیتی ئەو جۆرەی سەروایەیە کە تێیدا تەنیا یەک پیتی هاوبەش لە کۆتایی هەر دوو نیوە دێڕی یەکەم و نیوە دێڕە جووتەکانی غەزەل و قەسیدەدا دووبارە دەبێتەوە. ئەم جۆرە سەروایە، سەروایەکی زۆر بەهێز نییە بە بەراورد لەگەڵ سەروای چەند پیتییەکاندا چونکە تەنیا لەسەر بنەمای یەک دەنگی هاوبەش دروست دەبێت.

مەحوی لە غەزەلەکانی دیوانەکەیدا خاوەن حەڤدە غەزەلە کە سەرواکەیان لەسەر یەک پیت دروست بووە (ئەوانیش بریتین لە غەزەلەکانی لاپەڕە: ٢٢، ٢٥، ٣٥، ٥١، ٦٩، ١١٦، ١٤٥، ١٤٦، ١٥٢، ١٥٤، ٢١٣، ٢٣٠، ٢٤٤، ٢٥٠، ٢٦٢، ٢٩٥، ٣٢٣ ) بەڵام لە کۆی ئەو حەڤدە غەزەلە تەنیا دوو غەزەلیان بێ پاش سەروان یەکەمیان بریتییە لە سەروای پیتی بزوێنی ((ێ)) لە وشەکانی: بێ، هێ، تێ، یێ، دێ، وەکو:

**خەططی دەوری لێوی ئاڵت ئەی مەسیحا لام و بێ**
**هەر لە جامەی سەبز ئەچێ بۆ غەین و نوون و چیم و هێ      ل٣٢٣**

دووەمیان بریتییە لە سەروای پیتی بزوێنی ((وو)) لە وشەکانی: بوو، چوو، بوو، خوو، ((یسلو))، حاقوو، ((ماتوا))، بازوو، وەکو:

**لە دنیادا دڵ ئارامێک و ئارامی دڵێکم بوو**

**بە جارێ ماڵی وێرانم، ئەمیشم چوو، ئەویشم چوو     ل٢٦٢**

پازدە غەزەلەکەی دیکە دە غەزەلیان خاوەن سەروای پیتی بزوێنی ((ا))ن (لاپەڕە ٢٢، ٦٩، ١١٦، ١٤٥، ١٤٦، ١٥٢، ١٥٤، ٢١٣، ٢٣٠، ٢٩٥) واتە لە نێو سەروا یەک پیتییەکاندا مەحوی زۆرترین کات پەنای بۆ پیتی بزوێنی ((ا)) بردووە و ((تایبەتمەندی مۆسیقیی ئەم پیتەش لەوەدایە چونکە بزوێنێکی درێژ و نەبزواوە بۆیە زۆر لەگەڵ بابەتە شادەکاندا یەک ناگرێتەوە))[١٤] و مەحویش بۆ زۆر بابەتی ناشاد و پڕ لە نیگەرانی و نائومێدی سوودی لێ وەرگرتووە و بۆ نموونە دەڵێت:

**بێ کەس منم، کەسێ لە زوبانم بگا نییە**

**هەمدەم خودا نەناسن و دەم پڕ لە یا خودا     ل٣**

جگە لەم دە غەزەلە، سێیان پیتی بزوێنی ((ۆ)) (لاپەڕە ٣٥، ٥١، ٢٤٤) و دوویان پیتی بزوێنی ((وو)) (لاپەڕە ٢٥و ٢٥٠). سەرجەمی ئەم غەزەلانە بە یەک پیتەکەی سەروا کۆتاییان پێنەهێنراوە و بۆ زیاتر بەهێزکردنی مۆسیقای کۆتایی دێڕەکان هونەری پاش سەروا بەکارهاتووە وەکو لەم نموونانەدا دەبینرێن:

**وەک بولبول ئەو دڵە بە گوڵی ڕوو کە ڕوو دەکا،**

**پەروانەیە زیارەتی شەمع ئارەزوو دەکا     ل٢٥**

یان لە نموونەیەکی تردا هاتووە:

**کە تۆ غایب لە بەرچاوم دەبی، چم بێ لە تۆ غایب**

**قیامەت حاضری بەرچاومە، خۆمم لە خۆ غایب     ل٥١**

لە نموونەیەکی تردا دەڵێت:

**چبکەم، نە ئەو کەسەم کە کەسم بێ لە لا بە کەس**

**خۆشم نەگەیمە ئەو کەسە ئەو من بکا بە کەس     ل١٤٦**

### ٣-٢- سەروای دوو پیتی ((دووانە))

سـەروای دوو پیتـی بـریتییە لەو جـۆرە سـەروایەی کە لە دووبـارەبوونەوەی دوو پیتـی هـاوبەش پێکـدێت. زۆرتـرین جـۆری سـەروای مەحوی سەروای دوو پیتییە و لە کۆی غەزەلەکانی نێو دیوانەکەی نزیکەی نیوەی غەزەلەکانی خاوەن سەروای دوو پیتین کە ژمارەیان دەگاتە پەنجا و هەشـت غەزەل (کە بـریتین لە غەزەلەکـانی لاپەڕەکـانی: ١٣، ١٩، ٣٠، ٣٨، ٤٠، ٤٣، ٤٥، ٤٦، ٤٩، ٥٣، ٥٦، ٦١، ٧٢، ٧٦، ٧٨، ٨٠، ٨٢، ٩٠، ٩٢، ٩٨، ١٠١، ١٠٣، ١٠٥، ١١١، ١٢١، ١٢٧، ١٣٠، ١٣٣، ١٤٢، ١٥٠، ١٥٦، ١٦٢، ١٦٥، ١٦٧،ل١٧١، ١٧٤، ١٧٨، ١٨٥، ١٩٠، ١٩٤، ٢٠١، ٢٠٤، ٢٠٦، ٢٠٨، ٢١١، ٢١٥، ٢٢٢، ٢٢٤، ٢٣٥، ٢٣٨، ٢٣٩، ٢٤٤، ٢٥٣، ٢٦٠، ٢٩٩، ٣١٢، ٣١٥، ٣٢١).

سـەروای دوو پیتـی جیـا لەوەی لە ڕووی ڕێـژەوە زۆرتـرین سـەروای غەزەلەکـانی دیـوانی مەحـوی پێکـدەهێنێت، لە ڕووی ژمـارەی پیتیشـەوە زۆرترین پیتەکـانیش بـوونەتە دوا پیت لە سـەروای دووانەی دیوانەکەیدا کە ڕێژەیان دەگاتە بیست و هەشت پیت لە پیتەکانی زمـانی کوردی و عەرەبی پێکدێن وەکو پیتەکانی ((ء)) ، ((ا)) ، ((ب)) ، ((ت)) ، ((م)) ، ((ر)) ، ((ج)) ، ((ێ)) ،((ح)) ، ((خ)) ، ((د)) ، ((ز)) ، ((ش)) ، ((ە)) ، ((ع)) ، ((غ)) ، ((ف)) ، ((ق)) ، ((ک)) ، ((ل)) ، ((ڵ)) ، ((ۆ)) ، ((ی)) ، ((ژ)) ، ((ۆ)) ، ((ض)) ، ((ظ)) و ((ث)) و ...هتد.

لە نێـوان ئەم دوا پیتانەشـدا پیتـی ((ر)) بە پـلەی یەکەم دێـت و لە نـۆ غەزەلدا دووبـارە بـووەتەوە (غەزەلـی لاپەڕەکـانی: ٧٢، ١٢١، ١٢٧، ١٣٠، ٢٢٢، ٢٢٤، ٢٣٩، ٣١٥، ٣٢١)، بۆ نموونە دەڵێت:

**ئەوەندەی ئەهلی دنیان ئەهلی دنیا، تاقە ڕۆژێ گەر**

**بە قەڕنێ من ئەوەند ئەهلی خودا بم دەبمە پێغەمبەر** ل١٣٠

پیتـی ((م)) بە پـلەی دووەم دێت و شـەش جـار دووبـارە بـووەتەوە، بـۆ نموونە دەڵێت:

**غونچە دڵ بوونم لە حەسرەت لێوی تۆیە، غونچە دەم!**

**غونچەکەی تۆ مەر شیفا دا غونچەکەم، ئەی غونچەکەم!** ل٢٣٨

پیتـی ((ب))یـش بە پـلەی سـێیەم دێت و پێـنج جـار دووبـارە بـووەتەوە، دەڵێت:

**بە یادی ئەو لەبە، ئەی شۆخی ڕوومەت ڕۆژی مەهـ غەبغەب**
**لەبالەب ما لە نالەم سینە، هەروەک کۆتری لەبلەب ل٤٩**

هەر یەک لە پیتەکـــــانی ((ت)) (لاپەڕە ٥٦، ٧٨، ٨٠، ٨٢) ، ((ک)) (لاپەڕە ١٨٥، ١٩٠، ١٩٤، ٣١٢) و ((ل)) (لاپەڕە ٢٠٤،٢٠٦، ٢٠٨، ٢٩٩) چـــوار جـــار و پیتەکـــــانی ((ح)) (لاپەڕە ١٠١، ١٠٣) ، ((ق)) (لاپەڕە ٣٠، ١٧٨) ، ((ڵ)) (لاپەڕە ٢٠١، ١٣) و ((ۆ)) (لاپەڕە ٢٤٤، ٢٥٣) دوو جار و سەرجەم پیتەکانی دیکە لە یەک نموونەدا دووبارە بوونەتەوە.

بە بەراورد لەگەڵ سەروا یەک پیتییەکان، لە کۆی ئەو پەنجا و هەشت غەزەلەی مەحـوی کە خـاوەن سـەروای دووانـین تەنیـا حەڤـدە غەزەلیـان هونەری پاش سەروایان لەگەڵدا بەکارهاتووە و ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە سـەروای دووانە مۆسـیقایەکی بەهێزتـری هەیە لە چـاو سـەروای یەک پیتیدا، بۆ نموونە دەڵێت:

**کەم بوو وەک ئەو دەمە، صیدق ئەم دەمە هەم کەم بووە قات**
**فەرەحی نەک بەدوا بێ، غەم و هەم هەم بووە قات ل٦١**

## ٣-٣- سەروای سێ پیتی ((سییانە))

سەروای سێ پیتی یان سەروای سییانە بەو جۆرە سەروایە دەگوترێت کە لە سێ پیتی هاوبەش پێکدێت، واتە سێ پیتی هـاوبەش لە کۆتـایی وشـەی سەروادا دووبارە ببێتەوە.

لە پـاش سـەروای دووانە، سـەروای سـییانە بە پـلەی دووەم دێـت لە ڕووی ژمـارەی ئەو غەزەلانەوەی کە بەو جـۆرە سـەروایە نووسـراون کە ژمارەیان دەگاتە سی و حەوت غەزەل(کە بریتین لە غەزەلەکانی لاپەڕەکانی: ٥، ٧، ١٠، ١٦، ٢٧، ٣٣، ٣٦، ٦٣، ٦٦، ٧٤، ٩٥، ١٠٨، ١١٧، ١٢٥، ١٣٧، ١٨٣، ١٨٨، ١٩٨، ٢٢٠، ٢٣٣، ٢٥٦، ٢٦٨، ٢٧٢، ٢٧٤، ٢٧٧، ٢٨٠، ٢٨٣، ٢٨٧، ٢٩٠، ٢٩١، ٢٩٧، ٣٠٢، ٣٠٦، ٣٠٩، ٣١٠، ٣١٦، ٣١٩). دوای پیتی سەروای ئەم سی و حەوت غەزەلە تەنیـا لە چوارچێـوەی هەشـت پیتـی ((ە)) ، ((ی)) ، ((ا)) ، ((ێ))، ((ت)) ، ((م)) ، ((گ)) و ((ق))دا کـۆ بـووەتەوە. لە نێـوان هەشـت پیتەکەشـدا بزوێنـی ((ە)) بە پـلەی یەکەم کە لە یـازدە غەزەلـدا دووبـارە

بـــــــووەتەوە (لاپەڕە ٩٥، ١٣٧، ٢٥٦، ٢٦٨، ٢٧٢، ٢٧٤، ٢٧٧، ٢٨٣،٢٨٠، ٢٨٧، ٢٩٠)، بۆ نموونە دەڵێت:

**لە ڕێگەی مەهلەکەی عیشق ئەر بەڵاجۆ نیی، برا، لادە**

**ئەوی من چووم و لەوما دیی هەر ئاهـ و داد و فەریادە ل٢٦٨**

لە پاش بزوێنی ((ە))، پیتی بزوێنی ((ی)) بە پلەی دووەم دێت و لە دوا پیتی وشەی سەروای نۆ غەزەلدا دووبارە بووەتەوە (لاپەڕە ١٦، ٦٣، ١٠٨، ١٨٨، ٢٩٧، ٣٠٦، ٣٠٩، ٣١٦، ٣١٩)، بۆ نموونە دەڵێت:

**زاهید چییە، هەیە گەبەڵی ڕیش و تووکەسەر**

**ئاگر نەبێ، چبێ سەری دەرکا لە جەنگەڵی!**

**((مەحویی))! قەضا قسێکی خۆشی وت بە چاری ڕووس:**

**دوێنێ گەماڵە گەورەکە، ئەمڕۆ یەکێ دەڵی ل٣٠٨**

پاشـان پیتـی بزوێنـی ((ا)) بە پلەی سـێیەم دێت و لە شـەش غەزەلـدا دووبارە بووەتەوە (لاپەڕە ٥، ٧، ١٠ ٢٧، ٣٣، ٣٦) و لە غەزەلێکدا دەڵێت:

**بەجێ نایێ، دەبێ ڕوو کەینە سارا،**

**حەقی ئادابی مەجنوونیی لە شارا ل٧**

لە پاش ئەو سێ پیتەش، پیتی بزوێنی ((ێ)) بە پلەی چوارەم دێت کە لە چوار غەزەلدا دووبارە بووەتەوە (لاپەڕە ١١٧، ٢٣٣، ٣٠٢، ٣١٠) و بەمەش لە نێو سـەروا سـێ پیتییەکانـدا لە کـۆی سـی و حەوت غەزەل، سـی غەزەلیـان وشەی سەروایان بە پیتە بزوێنەکان کۆتاییان هاتووە.

دوا بە دوای بزوێنـی ((ێ))یـش هەر دوو پیتـی ((ت)) (لاپەڕە ٦٦، ٧٤) و ((م)) (لاپەڕە ٢٩١، ٢٢٠) دێـــن کە هەریەکەو لە دوو غەزەلـــدا دووبـــارە بـوونەتەوە و دواتـریش پیتەکـانی ((ر)) (لاپەڕە ١٢٥) ، ((ق)) (لاپەڕە ١٨٣) و ((گ)) (لاپەڕە ١٩٨) هەریەکەیان لە یەک غەزەلدا دووبارە دەبنەوە.

ڕێژەی بەکارهێنانی هونەری پاش سەروا لەگەڵ ئەم جۆرەی سەرواشـدا هاوشـێوەی سـەروا دوو پیتییەکـانە و بە هـۆی بەهێزیـی مۆسـیقای خـودی سەرواکە کەمتر پەنا بۆ پاش سـەروا براوە و لە کۆی سی و حەوت غەزەل تەنیا یازدە غەزەلیان پاش سەروایان لەگەڵدا بەکارهاتووە، بۆ نموونە دەڵێت:

**(خضر) ئەگەر چاوی حەیاتی بڕییە ئاوی حەیات**

**من لە خاکی دەری جانانەمە هەر چاوی حەیات ل٦٣**

**٣-٤- سەروای چوار پیتی**

سەروای چوار پیتی ئەو جۆرە سەروایەی کە لەسەر بنەمای چوار پیتی هاوبەش پێکدێت واتە چوار پیتی هاوشێوە لە کۆتایی وشەی سەروا دووبارە دەبێتەوە.

مەحوی لە کۆی غەزەلەکانی دیوانەکەیدا تەنیا هەشت غەزەلی بەم جۆرە سەروایە نووسیوە (کە بریتین لە غەزەلەکانی لاپەڕەکانی: ١٨٠، ١٩٢، ٢٢٦، ٢٢٨، ٢٤٢، ٢٧٠، ٣٠١، ٣٠٤). ئەو پیتانەی کە لەم جۆرە سەروایەدا بوونە دوا پیتی وشەی سەروا بریتین لە پیتی ((ی)) (لاپەڕە١٨٠، ٣٠٣) ، ((م)) (لاپەڕە ٢٢٦، ٢٢٨)،((ن)) (لاپەڕە ٢٤٢، ٣٠١) ، ((ک)) (لاپەڕە ١٩٢) و ((ە)) (لاپەڕە٢٧٠) و لە نێوان ئەم پیتانەشدا سێ پیتی یەکەم هەریەکە لە دوو غەزەلدا دووبارە بوونەتەوە، بۆ نموونە دەڵێت:

**چووە چوو، خۆ نەهاتوو نادیارە، حاڵە ماڵت بێ**
**بەس ئەم نەقدە بکە صەرفی غەمی موستەقبەل و ماضیی**
**ببینن گەر لە ساقیی ناز و عیشوێک، ئێمە دەبینین**
**بە مەی نۆشیی دەدەن فتوا بە مەستیی موفتیی و قاضیی** ل٣٠٥

جێی ئاماژەیە سەروای ئەم غەزەلە هەندێک کێشەی تێدا هەیە بە تایبەتی لە دێڕەکانی پێنجەم و شەشەم و حەوتەمدا. یاخود دەڵێت:

**لە باسی مەینەت و دەردی دەروونی بۆیە دەم نادەم**
**لە خوێناوی دڵی پڕ غەم کە سینەم مەوج ئەدا تا دەم** ل٢٢٦

لە دێڕێکی تردا دەڵێت:

**دوهاتی ئەورووپا وەک ئەهلی دێهات**
**لە چارەی دەردی عیشقا جوملە دامان**
**برا! مەردم دەوێ عەقڵی نەلەنگێ**
**بە لەنجەی ناز و عیشوەی نەونەمامان** ل٢٤٢

هەردوو پیتی ((ک)) و ((ە)) هەریەک تەنیا لە یەک غەزەلدا بەرچاو دەکەون. سەروای چوار پیتی بە هۆی دووبار بوونەوەی چوار پیت بۆخۆی مۆسیقایەکی بەهێزی هەیە بۆیە دەبینین لە کۆی ئەو هەشت غەزەلەی خاوەن سەروای چوار پیتین تەنیا دووانیان هونەری پاش سەروایان تێدا بەکارهاتووە، بۆ نموونە دەڵێت:

**ئەوی ئەمڕۆ بە دەوری تەختیایە هەلهەلەی مەخلووق**
**لە دەوری نەعشیا سبحەی دەبینیی وەلوەلەی مەخلووق** ل١٨٠

### ٣-٥- سەروای پێنج پیتی

سەروای پێنج پیتی بەو جۆرە سەروایە دەگوترێت کە پێنج پیتی هاوشێوە لە کۆتایی وشەی سەروای دێڕە شیعرەکاندا دووبارە بووبێتەوە. هەوڵدان بۆ هێنانەوەی کۆمەڵە وشەیەک بۆ سەروا کە پێنج پیتی هاوبەش لە کۆتاییەکەدا بوونی هەبێت کارێکی ئاسان نییە بۆیە نموونەی ئەم جۆرە سەروایە لە دیوانی شاعیراندا کەمترە بە بەراورد لەگەڵ سەرواکانی پێشوو.

مەحوی تەنیا لە هەشت غەزەلدا سەروای پێنجی بەکارهێناوە (کە ئەوانیش بریتین لە غەزەلەکانی لاپەڕەکانی: ٣، ٨٤، ١١٩، ٢٤٠، ٢٤٨، ٢٥٥، ل ٢٨١، ٢٨٥) و دوا پیتی سەروای ئەو هەشت غەزەلەش بریتین لە پیتەکانی ((ە)) (لاپەڕە٢٨١ و ٢٨٥) ، ((ن)) (لاپەڕە ٢٤٠و ٢٤٨) ، ((ا)) (لاپەڕە ٣)،((ت)) (لاپەڕە٨٤)، ((وو)) (لاپەڕە ٢٥٥) و ((ر)) (لاپەڕە ١١٩) و لە نێوان ئەم پیتانەشدا هەریەک لە پیتەکانی ((ە)) و ((ن)) لە دوو غەزەلدا دووبارە بوونەتەوە، بۆ نموونە دەڵێت:

**غائیب لە دیدە، چاوی سەرم، دڵمە پێتەوە!**
**دەستم بە ئاسمانەوە، چاوم بە ڕێتەوە** ل٢٨٥

یاخود لە نموونەیەکی تردا دەڵێت:

**بەهاری عومر ئەوا گەییە حوزەیران**
**کەچیی وەک کۆدەک ئێستە دەچمە سەیران** ل٢٤٠

هەر چوار پیتەکەی تر هەریەک تەنیا لە یەک غەزەلدا بەکارهێنراون. سەروای پێنج پیتی بۆخۆی یەکێکە لە سەروا بەهێزەکان لە ڕووی مۆسیقاوە بۆیە شاعیر لەگەڵ هیچ یەک لەم غەزەلانەدا هونەری پاش سەروای بەکار نەهێناوە.

### ٣-٦- سەروای شەش پیتی

سەروای شەش پیتی وەکو لە ناوەکەیدا بە دیار دەکەوێت لە دووبارە بوونەوەی شەش پیتی هاوشێوە لە کۆتایی وشەی سەروادا دروست دەبێت.

سەروای شەش پیتی یەکێکە لە سەروا بەهێزەکان و لە هەمان کاتدا یەکێکە لە سەروا دژوارەکان، چونکە دۆزینەوەی چەند وشەیەک کە بە شەش پیتی هاوبەش کۆتاییان پێهاتبێت بۆ دروستبوونی سەروا کارێکی ئەستەمە.

مەحوی لە هەموو غەزەلەکانیدا تەنیا یەک نموونەی لەم جۆرەی هەیە، واتە شاعیر تەنیا لە یەک غەزەلی دیوانەکەیدا سەروای شەش پیتی بەکارهێناوە، ئەویش وشەی سەرواکەی بە زنجیرە پیتی ((ەرکەوت)) کۆتایی پێهاتووە و تێیدا دەڵێت:

**وەکوو ڕۆژ ئەو مەهە لەو دوورە دەرکەوت**

**لەمێوە ئەشک و ئاهی ئێمە سەرکەوت** ل٨٧

دووبارە لێرەشدا غەزەلەکە تەنیا بە سەروا مۆسیقای کۆتایی بۆ دروست کراوە و هونەری پاش سەروای لەگەڵدا بەکارنەهێنراوە.

### ٣-٧- سەروای حەوت پیتی

سەروای حەوت پیتی واتە هەبوونی حەوت پیتی هاوبەش لە کۆتایی وشەی سەروای دێڕە شیعردا. ئەم جۆرە سەروایە بەهێزترین جۆری سەروایە لە نێو غەزەلەکانی دیوانی مەحویدا و سەبارەت بە شاعیریش ئەستەمترین سەروایە چونکە پێویستی بە گران و ماندووبوونێکی زۆر هەیە بۆ دۆزینەوەی کۆمەڵە وشە و دەستەواژەیەک کە بە حەوت پیتی هاوبەش کۆتاییان پێهاتبێت.

لە کۆی غەزەلەکانی مەحویدا تەنیا سێ غەزەلی لەم جۆرە بەرچاو دەکەوێت (کە بریتین لە غەزەلەکانی لاپەڕەکانی: ٢٦٤، ٢٦٦، ٢١٧)، یەکەمیان بە زنجیرە پیتی ((ێ|+|د|+|ە|+|گ|+|ر|+|بزرۆکە|+|م|= ێ دەگرم)) کۆتایی پێدێت و تێیدا دەڵێت:

**چ شۆخە ئاگرم تێ بەردەدات و پێم دەڵێ: یا شێخ!**

**بە خاشاکی دەوت شوعلە، عەصامە دەستی پێ دەگرم**

**کە سینەی ڕێشمی بەو تێغی نازە ئەنجن ئەنجن کرد**

**وتی: پەژموردەیە ئەم لالەزارە، ئاوی تێ دەگرم** ل٢١٩

دووەمیان بە زنجیرە پیتی ((ەربەستە)) کۆتایی پێهاتووە و دەڵێت:

**لە چاوی بەد خودا حیفظی بکا ئەو شۆخە سەرمەستە**

**سەریش ئەبڕێ، سەریشی لێ دەدا، هەی هەی چ سەربەستە** ل٢٦٤

سێیەمیان بە زنجیرە پیتی ((ەل بەستە)) کۆتایی پێهاتووە و دەڵێت:

**قەزا بێ دەستەڵاتت کا، چییە غەیری ڕەضا چارە؟**

**لە بەردەستی جەلابا ڕێوییێکە شێری پەل بەستە**

**بە خۆ کوشتن نەجاتی خۆ بدە ((مەحوی)) وەکوو فەرهاد**

**لە زۆری قەهرەمانی عیشق، ئەفەندم، هەر ئەجەل بەستە** ل٢٦٧

سەروای حەوت پیتی کە بەهێزترین جۆری سەروای غەزەلەکانی نێو دیوانی مەحوییە، لە هەر سێ نموونەکەدا بە تەنیا بەکارهاتوون و لە هیچ کامیاندا پاش سەروایان لەگەڵدا بەکارنەهاتووە.

## خستنە ڕووی ئەنجامە بەدەستهاتووەکان:






**ئەنجامەکانی:**

- مەحوی خاوەن سەد و سی و دوو غەزەلە بە زمانی کوردی و لە ڕووی ژمارەی پیتە هاوبەشەکانەوە، غەزەلەکانی خاوەن حەوت جۆرە سەروان: یەک پیتی، دوو پیتی، سێ پیتی، چوار پیتی، پێنج پیتی، شەش پیتی، حەوت پیتی.
- سەروای یەک پیتی و دوو پیتی خاوەن ئاستێکی نزمتری مۆسیقان و حەڤدە غەزەل لە غەزەلە کوردییەکانی مەحوی بە سەروای یەک پیتی و پەنجا و هەشت غەزەلی دیکەیان بە سەروای دوو پیتی نووسراون، بەم پێیەش کۆی هەردوو جۆرەکە دەکاتە حەفتا و پێنج غەزەل واتە زیاتر لە نیوەی کۆی غەزەلە کوردییەکانی.
- سەروای سێ پیتی لە ریزی ئەو سەروایانەیە خاوەن مۆسیقایەکی ئاست بەرزترە بە بەراورد بە سەروای یەک پیتی و دوو پیتی و مەحوی سی و حەوت غەزەلی بەم جۆرە سەروایە نووسیوە.
- سەروا چوار پیتی و پێنج پیتی و شەش پیتی و، حەوت پیتییەکان لە ریزی سەروا ئاست بەرزەکانن لە ڕووی مۆسیقاوە و مەحوی لە کۆی سەد و سی و دوو غەزەلی کوردی تەنیا بیست غەزەلی خاوەن ئەم جۆرانەی سەروان بەم شێوەیە: هەشت غەزەلی چوار پیتی و هەشت غەزەلی پێنج پیتی و یەک غەزەلی شەش پیتی و سێ غەزەلی حەوت پیتی.

**سەرچاوە و پەراوێزەکان:**

١- موسیقی الشعر بین الاتباع والاتباع، دکتور شعبان صلاح، دار الغریب للطباعة والنشر والتوزیع، قاهرة، ٢٠٠٧، ص٢٧٦.
٢- سەروا- لێکۆڵینەوەیەکی شیکاریی بەراوردە لە شیعری کوردیدا، عەزیز گەردی، دەزگای ئاراس بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، چاپی یەکەم، هەولێر، ١٩٩٩، ل٢٦.
٣- بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٧.
٤- سەروا، عەزیز گەردی، ل١٤٤.
٥- سەرچاوەی پێشوو، ل١١٢.
٦- سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٨.
٧- سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٩.
٨- بڕوانە: دیوانی مەحوی، لێکدانەوە و لێکۆڵینەوەی مەلا عەبدولکەریمی مدەرس و محەمەدی مەلا کەریم، ئنتیشاراتی کوردستان، چاپی یەکەم، سنە، ١٣٨١.
٩- واژەنامە هنر شاعری- فرهنگ تفصیلی اصطلاحات فن شعر و سبک و مکتب های آن، میمنت میرصادقی، کتاب مهناز، چاپ سوم ویراست سوم، تهران، ١٣٨٥، ص٢٣٦.
١٠- دیوانی مەحوی، ل٩٠، ١٥٧، ١٦٢.
١١- سەرچاوەی پێشوو، ل١١٦.
١٢- سەرچاوەی پێشوو، ل٩٨.
١٣- سەروا، عەزیز گەردی، ل١٢٥.
١٤- کارکرد هنری قافیه، اسحاق طغیانی و یوسف کرمی چمه و حسین سلیمانی، فصلنامه تخصصی سبک شناسی نظم و نثر فارسی، سال پنجم، شماره دوم، شماره پیاپی ١٦، تابستان ١٣٩١، ص٢٧٢.

## ملخص البحث

القافيـة جـزء اسـاس ومهـم فـي تشـكيل الشـعر الكـوردي الكلاسـيكي وجميـع الشعراء ملتزمين بها، ولكن هذا الالتزام لم يؤدي الى تشكيل لون واحد فقط، هذا مـن جهة ومن جهة اخرى لم يؤدي الى التشابه والتكرار لدى الشعراء بل كل شـاعر وفقـا لامكانيته الشعرية تعامل مع هذا الموضوع وتزينه واسلوبية القافية بمعنى البحث عـن خصوصـيات قافيـة الشـعر لـدى شـاعر معـين، وبحثنـا هـذا يتكـون مـن فصـلين، فصـل نظـري وفصـل تطبيقـي، وحاولنـا فيهـا ان نبـين القافيـة بشـكل احصـائي، حسـب عـدد الحـروف المشكلة منها القافية، وحاولنا ان نبحث عن قوافي الغزل (الاشـعار الكورديـة) للشـاعر الصـوفي محـوي (١٨٣١-١٩٠٦) وفـي الختـام بيننـا نتـائج هـذا البحـث بشـكل جـدول احصـائي، لكـي نصـل الـى كيفيـة تشـكيل القافيـة لـدى الشـاعر وخصوصـيات قوافيه.

## Abctract

Rhyme is one of the main and important components of Kurdish classical poetry and all the poets of Kurdish classic literature followed it, but following it didn’t put rhyme in a uniform form for all the poets in a way that creates similarity and repetition in their poetry. Each poet dealt with rhyme in his own style; according to his poetic abilities he used rhyme to beautify his poems.

Stylistic rhyme means searching for the characteristics of a poem's rhyme of a poet. In this research through statistical data, based on the number of the rhyme's letters, it has been attempted to shed a light on the rhymes of Kurdish lyrics of Mahwi, and focus on the characteristics of the rhyme of his poetry.

# ستاتیکای زمانی شیعری لە دیوانی (مۆسیقای نامۆیی) ی هاوژین صلیوە دا

**د. دەریا جەمال حەویز حەویزی**
بەشی زمانی کوردی – زانکۆی کۆیە

**پێشەکی :**

ئـەم لێکۆڵینەوەیـە بەناونیشـانی (سـتاتیکای زمـانی شـیعری لـە دیـوانی "مۆسیقای نامۆیی"ی هاوژین صلیوەدا)، لیکۆڵینەوەیەکی رەخنـەیی پراکتیکییـە، لە چوارچێوەیدا هەوڵدەدەین قسە لەسەر چەند لایەنێکی ستاتیکای زمانی شیعری بکەین، ئەویش بەنموونەی شـیعری لـە دوا بەرهـەمی شـیعری شـاعیری لاو هـاوژین صلیوەدا، کـە شـاعیرێکی لاوی کـوردە و خـاوەنی دوو بەرهـەمی شـیعری و چـەند کتێب و لێکۆڵینەوەیەکە لە بواری ئەدەب و رەخنەدا، دوا دیـوانی شـیعریی شـاعیر بریتییە لـە دیـوانی (مۆسـیقای نـامۆیی) کـە بریتییـە لـە دیـوانێکی شـیعریی ١٧٨ لاپـــەڕەیی، بەقـــەبارەی نیـــو لاپـــەڕەیی، کـــەوا کەرەســـتەی ســـەرەکیی ئـــەم لێکۆڵینەوەیە پێکدەهێنێت[1].

ئاشکرایە، شیعر بەشێکە لە دوو بەشە سەرەکییەکەی ئەدەب، کـەوا بـریتین لە شیعر و پەخشان، ئەوەی کە شیعر لە پەخشان جیا دەکاتەوە بریتییـە لەچـەند رەگەزێکی دیاریکراو کەوا خۆیـان لـە بـیر، ئەندێشـە و خـەیاڵ، کـێش و مۆسـیقادا دەبیننەوە، بۆ بەرجەستەکردنی ئەو رەگەزانەش زمان رۆڵی سەرەکی دەبینێـت، و یەکێك لە ئیشە سەرەکییەکانی شاعیریش بریتییە لە ئیشکردن لە بواری زماندا بـۆ ئەوەی جوانی و ستاتیکایەك بداتە شیعرەکەی، ئەم کارەش پێویستی بەلێهاتوویی شاعیر هەیە، واتە پێویستە شاعیر لە زمان شارەزا بێت، تا شیعر بنیات بنێـت، لـە مێژووی ئەدەبی کوردیشدا، ئەو کەسانەی کەوا ئەو بەهرە و لێهاتووەیـان هـەبووە زۆرن، و بەو هۆیەوە شیعری جوانیان پێشکەش بەخوێنەرانی کـورد کـردووە، ئـەو شیعرانەش بەزمانێك نووسراون، کـە لـە دەربـڕین و داڕشـتندا جیـابووە لـە زمـانی ئاسایی خەڵك، ئەوەیە ئەو زمانەی کە بەزمانی شـیعری ناسـراوە، و ئـەو زمانـەش

خـاوەنی جـوانی و سـتاتیكای تایبـەت بەخۆیـەتی، كـەوا بابـەتی سـەرەكی ئـەم لێكۆڵینەوەیە پێكدەهێنێت.

لێكۆڵینەوەكـە لـەم پرسـیارەوە دەسـتپێدەكات: ئایـا زمـانی شـیعریی ئـەو شاعیرە لە چ ڕوویەكەوە لە شاعیرانی قۆناغی پێش خـۆی تێپـەڕی كـردووە؟ ئایـا زمانی شیعرەكانی هەر لاساییكردنەوە و دووبـارە كردنـەوەی شـاعیرانی تـرە یـان جیاوازە؟ بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە ئەم لێكۆڵینەوەیە هاتە كایەوە.

ئامانجی ئەم لێكۆڵینەوەیە بریتییە لە تیشك خستنە سەر ئەو تایبەتمەندی و تازەگەرییانـەی بـەزمانی شـیعریی ئـەم دیوانـە شـیعرەوە دیـارن، بـەم هۆیـەوە دەریدەخەین ئەو شـاعیرە توانیویـەتی چـەند تازەگەرییـەك لـەڕووی بـەكارهێنانی زمانەوە ئەنجامبدات، و بەهۆیانەوە ستاتیكایەكی جیـاواز بـەزمانی شـیعری دەقـە شـیعرییەكانییەوە دەردەكـەون، ئەمـەش وەك وەڵامێـك دەبێـت بـۆ ئـەو بـیروڕا هەڵەیـەی كـە زۆرجـار شـاعیرانی لاو بەلاسـاییكەرەوەی شـاعیرانی قۆنـاغی پـێش خۆیان سەیر دەكرێن، لە دووتوێی لێكۆڵینەوەكەدا چەند لایەنێك لەزمانی شـیعریی ئەم بەرهەمە دەستنیشان دەكەین، كە تازەگەری و جیاوازییـەكیان بـەم بەرهەمـە بەخشیوە، و ئەوەندەی ئێمە ئاگاداربین لەمـەوپێش لـە شـیعری هـیچ شـاعیرێكی كوردا نەبینراون. هۆی هەڵبژاردنی ئەم لێكۆڵینەوەیە بۆ هـەمان هۆكـاری سـەرەوە دەگەڕێتەوە، و بریتییە لە هەوڵدان بـۆ دەرخسـتنی ئـەم تازەگەرییانـەی زمـانێكی شیعریی جیاوازی بەم دەقە شیعرانە بەخشیوە و بەهۆیەوە لە بەرهەمی شـاعیرانی تر جیایان دەكاتەوە.

لێكۆڵینەوەكە لە سێ بەشی سەرەكی پێكدێت، بەشـی یەكـەم بەناونیشـانی (چەمك و زاراوەی ستاتیكا و زمانی شیعری) تێیدا تیشك خراوەتە سـەر، چـەمك و زاراوەی ستاتیكا و زمانی شیعری، و قۆناغەكانی زمانی شیعری، و سەرچـاوەكانی زمـانی شـیعری، لـە بەشـی دووەمـدا بەناونیشـانی (سـتاتیكای ڕوخسـاری شـیعر) ئاماژە بەو لایەنە ستاتیكییانە كراوە كە لە فۆڕمی دەرەوەی شیعردا دەردەكەون، ئەویش لـەژێر چـەند تەوەرێكـدا ڕێكخـراوە، كـە بـریتین لـە سـتاتیكای ناونیشـان، مۆسیقای ناوەوە، لە بەشی سێیەمیشدا بەناونیشانی (ستاتیكای ناوەڕۆكی شیعر) هەریەكە لەبابەتـەكانی ( وێنـەی شـیعری، ئـابووریيكردن لـە زمانـدا، دەقئـاوێزان) شــیدەكرێنەوە. دواتــریش ئــەنجامی لێكۆڵینەوەكــە و لیســتی سەرچــاوەكان و پوختەی لێكۆڵینەوەكە بەهەردوو زمانی عەرەبی و ئینگلیزی خراوەتە بەرچاو.

## بەشی یەکەم
## چەمك و زاراوەی ستاتیکا و زمانی شیعری

**یەکەم – ناساندنێکی گشتی:** ئاشکرایە زمان هۆیەکە بۆ لەیەکگەیشتن لەنێوان مرۆڤەکاندا، هەروەها زمان مەرجی سەرەکییە بۆ دروستبوونی کۆمەڵگاکان، تا ئەو ڕادەیەی دەگوترێت« کۆمەڵ بێ بەکارهێنانی زمان بەڕێوە ناچێ و زمانیش گرینگترین ئامێری بەستن و لەیەکتر گەیشتنی ئادەمیزادە. هیچ چالاکییەکی مرۆڤ نییە، کە لەدەربڕینی بیر و مەبەست، هەست و نەست پێشکەوتن و گەشەکردنیدا زمان بەشداری تێدا نەبێ»[2]، شیعریش تا توانای ئەوەی هەبێت سەرنجی وەرگر بۆ خۆی کێش بکات، ئەوا پێویستە بەزمانێکی جوان نووسرابێت، ئەو جوانییە لە ئەدەب و فەلسەفەدا بە (ستاتیکا) ناسراوە، «ئیستاتیك Aesthetics لقێکە لە فەلسەفە گرنگی دەدات بەلێکۆڵینەوە و ڕوونکردنەوەی چەمکی (جوانی) وەکو ڕوخسارێکی جیاکەرەوەی کارەکانی هونەر ئەو سەرەتا دروست و ساغانە پێشنیاز دەکات کە حوکومدانە ئیستاتیکەکان پشتیان پێدەبەست. ئیستاتیکا خەریکی شیکردنەوەی ئەو چەمك و چارەسەرکردنی ئەو گیروگرفتانەیە کە لەکاتی لێخوردبوونەوەی بابەتی ئیستاتیکییەکاندا پەیدا دەبن. وە لەلایەن خۆیانەوە هەموو ئەو بابەتانە دەگرنە خۆیان کە تاقیکردنەوەیەکی ئیستاتیکی دەدەن بەدەستەوە»[3]، لێرەدا قسە هاتە سەر فەلسەفە، بۆیە پێویستە بزانین، « زاراوەی فەلسەفە لە بنەڕەتدا لە یۆنانییەوە هاتووە، بەواتای حەزکردن لەزانین، لەسەر ئەم بنەمایە فەیلەسووف ئەو کەسەیە کە دۆستی زانینە philos دۆست، Sophia زانین، کەوا جیا دەکرێتەوە لە خەڵکی تر بەهەوڵدانی بۆ لێکۆڵینەوە لەهەموو جۆر و شێوازەکانی زانیندا »[4]، یان بەشێوەیەکی ڕوونتر دەتوانین بڵێین:« فەلسەفە لە یۆنانیی کۆندا، فیلۆسۆفیا، واتە عیشقی خاتوو سۆفیا، عیشق خانمی حیکمەت خانمی سۆفیا، کەواتە فیلۆسۆفیا بریتییە لە لێکۆڵینەوە لە ڕەهەندە قووڵەکانی بوون»[5] کاتێك کە قسە دێتە سەر باسی ستاتیکا (جوانناسی) وەك لقێکی فەلسەفە و هۆکاری دەستنیشانکردنی ناونیشانی لێکۆڵینەوەکەمان بەم شێوەیەیە، ئەو هۆکارە بۆ ئەوە دەگەڕێنینەوە، « جوانناسی پەیوەستە بەدیاریکردنی جوانی بەشێوەیەکی

گشتی و دەركەوتنی لە هونەردا، بەتایبەتی ڕادەی كاریگەری بەسەر وەرگردا ))(٦)، شیعریش جۆرێكە لە هونەر كەوا پێویستە بۆ دروستبوونی كۆمەڵێك بنەمای جوانبەخشین هەبن، یەكێك لەپێكهاتە و بنەماكانی دروستبوونی شیعریش وەك چالاكییەكی مرۆڤایەتی بریتییە لەو زمانەی شاعیر شیعری پێ دەنووسێت، هەروەك **سەباح ڕەنجدەری** شاعیر دەڵێت:(( زمان ناوەندی پێكەوە گونجاندن و كۆكەرەوەی ڕەگەزە پێكهێنەرەكانی شیعرە. هیچ شیعرێكیش بەبێ بیركردنەوەی زمان ناتوانێت بوونی سەربەخۆیی خۆی دیاری بكات، زمان بیر دەكاتەوە، ئەوجا شیعر دەخولقێت... ))(٧)، بۆیە بۆ كۆكردنەوەی هەردوو ڕەگەزی جوانی و زمانی شیعری ناونیشانی ستاتیكای زمانی شیعری هاتەكایەوە، كە پێمان وایە ئەو بەرهەمە شیعرە دەتوانێت ئەم دوو لایەنەی تێدا بدۆزرێتەوە.

لێرەدا پێویستە ئاگاداری ئەوەبین زاراوەكە بەهەڵە نەگەیەنین، چونكە لە ڕاستیدا (( زمانێكی تایبەت بەشیعر بوونی نییە كە شاعیران قسەی پێبكەن (بەرهەمیان پێ بنووسن) وەك ئەوەی كە زمانێكی تایبەت بەمۆسیقا بوونی هەیە و لە هەموو وڵاتانی دونیادا میوزیككاران دەیخوێنن و فێری دەبن، كەواتە دەستەواژەی (زمانی شیعر) بەو ڕەهاییە ڕاست نییە بەكاربێت لەبەر دوو هۆكار: ١- زمانێكی تایبەتی شیعر بوونی نییە وەك زمانێكی تایبەتی مۆسیقا، بۆیە دەتوانین بڵێین زمانی مۆسیقا بەڵام ناتوانین بڵێین زمانی شیعر. ٢- دیاردەی شیعر لەدەرەوەی زمان بوونی هەیە، لە دونیای هونەر و تەنانەت لە سروشتدا شیعر بوونی هەیە، هەر لە هەڵفڕینی باڵندەیەكەوە تا تابلۆی شێوەكارێك. بۆیە كاتێك كە كەرەستەیەك لە كەرەستەكانی وەك (زمان، تابلۆ، سەما، وێنە...) تێكەڵ بەشیعر دەبن و ئەوە دەبێ وشەی شیعر وەك وەسفكردن و تایبەتكردن بخەینە پاڵیان و بڵێین (زمانی شیعر، تابلۆی شیعری، سەمای شیعری، وێنەی شیعری) ))(٨)، بەپێی ئەم لێكدانەوەیە بێت، زمانی شیعر هەڵەیە و زمانی شیعری پەسەندترە، ئەم زمانە بەیەكێك لە پێكهاتەكانی بنیاتنانی شیعر دادەنرێت، و ((كتێبە ڕەخنەییەكانیش بۆ ناونان و پێكهاتەی بنیاتی ڕەگەزەكانی دەق بەشێوەی جۆربەجۆر دەستنیشانی ئاستی بنیاتی دەقیان كردووەو بەشێكیان بەچوار پێكهاتە ڕایان گەیاندووە، وەك: ١- زمان ٢- ئاواز ٣- وێنە ٤- بابەت،

بۆیه زمان بەتایبەتی زمانی شیعری لەنێوان ڕەگەزەکانی بنیاتی شیعردا، جۆرە سیمایەکی تایبەتی دەداتە دەق و شیعرییەت پێك دێنێ و بەسەر زمانی ئاساییدا تێدەپەڕێت و پەیوەستبوونی خۆی لەگەڵ وێنەوە دەرەخسێنێ و لەئەنجامی گونجاندنی وشە و دەنگ ئاواز دەداتە دەق ))[9]، ئەم گرنگی پێدانەش بەزمان وەك پێکهاتەیەکی شیعر، لەدێر زەمانەوە لای فەیلەسووفانی ڕۆمان و یۆنانی کۆن دیاردەکەوێت، بۆ نموونە: (( **هۆراس** لەبواری زمانی شیعر گرنگی بە (وشە) داوەو ئاگاداری شاعیر دەکاتەوە کە وشەکانی سڕ و مردوو نەبن. کاتێك ئەرکی شیعر دەربڕین و ڕوونکردنەوەیە، دەبێ وشەکانیشی بەردەوام زیندوو و پڕ واتا و ژیان بن، لەم بوارەوە زمان بەدار دەچوێنێت و وشەکانیشی بەگەڵای دار دەچوێنێ، بەدرێژایی ساڵەکان ))[10]، واتە پێویستە شاعیر لە هەڵبژاردن و ڕیزکردنی وشەکانیدا وردبێت، تا دەقێك بێتە ئاراوە خوێنەر بتوانێت چێژ و سوودی لێوەربگرێت، هەر بەهەمان شێوە لای فەیلەسووفانی یۆنانیش، (( بایەخدان بەزمانی شیعر و جیاکردنەوەی لەزمانی ئاسایی خەڵك و دیاریکردنی سروشت و خاسیەتە تایبەتەکانی ئەو زمانە هەر لەکۆنەوە لەلایەن **ئەفلاتوون و ئەرستۆوە** باس کراوە و لێی کۆڵراوەتەوە، ئینجا ئەو باس و لێکۆڵینەوانە لەگەڵ سەرهەڵدانی قوتابخانە ئەدەبی و ڕەخنەییەکان پەرەیان سەندووە و فراوان بوونە. ئەفلاتوون بەپێی تیۆری زانین و تیۆری ڕەوشت هەڵوێستی خۆی بەرامبەر بەشاعیران دیاریدەکات و هەڵوێستێکی توندوتیژیان بەرامبەر دەنوێنێت، وە لەچەند شوێنێکی کۆمارەکەیدا باس لە تەئسیر و کاریگەری شیعر دەکات لەسەر خەڵك. ئەمەش هەر خۆی لەخۆیدا ئەوە دەگەیەنێت کە ئەفلاتوون جۆرە تایبەتییەکی داوەتە شیعر و هەر زوو هەستی بەو جیاوازییە کردووە کە شیعر بەهۆی قاڵبە هونەرییەکەوە پەیدای کردووە و گەیشتۆتە ئەو ڕایەی کە بەنەمانی ئەو قاڵبە هونەرییە لەپەخشانێکی ڕووت بەولاوە شتێکی تری لێ دەرناچێت ))[11]، واتە ئەفلاتوون بەو ڕاستییە گەیشتووە کە کۆمەڵێك پێکهاتە هەیە بۆ بنیاتنانی شیعر و بە لەدەستدانیان شتێك نامێنێت کە بەشیعر ناوبنرێت، دیارە یەکێك لەم پێکهاتانەش بریتییە لەزمانی شیعری، هەروەها دوای ئەفلاتوون ئەرەستۆش لەبارەی زمانی شیعرییەوە دواوە،(( ئەرستۆ پێی وایە زمانی شیعری لەزمانی ئاسایی جیایە و بۆ

ئەوە دەچێت کە شاعیر مافی ئەوەی هەیە زمانێکی تایبەت بەکاربهێنێت، کە لەزمانە ئاساییەکەی ناو خەڵك دوور بێت، هەروەها پێی وایە کە زمان لەشیعردا دەبێت مانای ڕوون بێت نابێ پەڕپووت بێت ))[١٢]، کەواتە بەڕای ئەرەستۆ شیعر خاوەنی زمانێکی نائاساییە، بەڵام سەرەڕای ئەمەش پێویستە شاعیر بەزمانێك بنووسێت کەوا جێگەی تێگەیشتن و چێژبەخشین بێت بۆ خوێنەری دەق.

سەرەڕای ئەو تایبەتمەندییانەی باسکران، پێویستە لەبایەخی زمانی شیعریی کەم نەکەینەوە، چونکە لەڕاستیدا ((زمانی شیعری هەر لەزانینی هەزارەها وشەدا کورت ناکرێتەوە، بەڵکو پێویستە ئەو وشانە لەقاڵبی وەهادا دابڕێژرێت کە گونجاو بێت لەگەڵ دەلالەت و دەربڕین و مەبەست، تاوەکو بگەین بەکارێکی هونەریی داهێنەر کە دووربێت لە ئاڵۆزی و ناڕێکی، هەموو شاعیرێك خاوەنی فەرهەنگێکی وشەیی و دەربڕینی تایبەت بەخۆیەتی، کەوا هەردەم لە زیهنیدا دەخولێتەوە و زاراوەکانی دووبارە دەبنەوە کەوا زۆرجار بەهۆیەوە لە شاعیری تری جیادەکەینەوە ))[١٣]، ئەو دەربڕین و گوزارشتانە زمانێکی تایبەت بەشیعری ئەو شاعیرە دەبەخشن، کە بەهۆیەوە جیادەکرێنەوە.

هەموو ئەم بۆچوونە جیاوازانە لەوەدا یەکدەگرنەوە، کەوا (( شاعیر لە بنیاتنانی وێنەی هونەریدا ئەو زمانە بەکاردێنێ ك ەزمانێکی پوختەکراوە و جیایە لەزمانی قسەکردنی ڕۆژانە، زمانێکە لەڕووی تێگەیشتنەوە پانتاییەکی فراوان داگیر دەکات و خۆی دوور دەخاتەوە لەزمانی ناوچەیی تەسك، کە تێگەیشتنەکەی بەژمارەیەکی دیاریکراوەوە بەستراوەتەوە. بەڵکو زمانێکی بەپێزی بەپیتی دەوڵەمەند بەکاردێنێ ئەوساش ڕوخسارێکی جوان و ناوەڕۆکێکی بەپێز بەوێنەکە دەبەخشێ ))[١٤]، بەهۆی بوونی ئەم تایبەتمەندییانە، دەتوانین لەبارەی زمانی شیعرییەوە بڵێین ((زمانی شیعر توانستی ئیحا و نیگا بەخشینێکی سەیری هەیە، ئەم دیاردەیە لەزمانی ئاساییدا بەدی ناکرێت. بەو پێودانگە زمانی شیعر و زمانی ئاسایی، لەپێکهێنان و بونیات و یاساکانەوە، تا دەگاتە دەلالەت بەخشین، دوو جەمسەری دوور لەیەکتر و جیاوازن. سەرەڕای جوانکاری و کاریگەری پڕ لە تاسە، ڕاچڵەکینی جیاوازیان هەیە:بەبارتەقای توانستی زمانی ئاسایی بۆ قسەکردن، لەئەدەب و زمانی شیعردا، کاری جوانی داهێنەرانە و سەرکەوتوو ئەنجام دەدرێت،

ئەمە بۆ بوونی زمانی ئاسایی پاساوێك نییە ⁾⁾[١٥]، هەر بەم هۆیەوە دەبینین زۆرجار زمانی شیعری وەك جۆرێك لەجۆرەکانی زمان سەیر دەکرێت، بۆ نموونە **د. ئیدریس عەبدوڵلا** دوای ئەوەی زمان دابەش دەکات بۆ سێ جۆر (زمانی سروشتی، زمانی گشتی، زمانی تایبەتی)[١٦]، لەبارەی زمانی تایبەتییەکەوە کە بەهەمان واتای زمانی شیعری بەکاریهێناوە دەڵێت: ⁽⁽ زمانی تایبەتی: ئەو زمانەیە، کەڕێژەی لادانەکانی زیاترە، یان نزیکە لەڕێژەی دەربڕینەکانی زمانی سروشتی، ئەو لادانانەش بەرهەمی کاری تاکەکەسینە، شاعیر و ئەدیبە داهێنەرەکان بەرهەمی دێنن، خاوەنەکانیان دیارە و لەهەموو سەردەم و کۆمەڵگایەکدا بەهۆکاری جۆراوجۆر دێنە بەرهەم، گرنگترین ئەو هۆکارانە بریتین لە: مەعریفە، توانای داهێنان، حەزی خۆ جیاکردنەوە، کێش و سەروا... هتد⁾⁾[١٧]، ئەمانە ئەو مەرجانەن کە پێویستە هەبن بۆ دروستبوونی زمانێك کە بەزمانی شیعری ناوبرێت.

لە کۆتایی ئەم باسەدا، دەشێت بۆ زیاتر ناساندنی زمانی شیعری، لێکدانەوەیەکی خودی شاعیر **هاوژین صلیوە** سەبارەت بەزمانی شیعری بەنموونە وەربگرین، تا بزانین خاوەنی ئەو دەقە شیعرییانەی کەرەستەی لێکۆڵینەوەکەمان پێکدەهێنێت، چۆن لەزمانی شیعری دەڕوانێت، هەروەکو لەوەڵامی پرسیاری رۆژنامەنووسێکدا سەبارەت بەجیاوازیی نێوان زمانی ئاسایی و زمانی شیعری دەڵێت: ⁽⁽... ئەگەر بڵێین (با گەڵای درەختان دەلەرێنێتەوە) ئەوە قسەی ئاساییە، کە وتمان (لەگەڵ سەمفۆنیای با پۆپەی درەختەکان کەوتنە سەماکردن) ئەمەیان زمانێکی شاعیرانەیە، چونکە دوو وێنەی لەخۆ گرتووە، وێنەی یەکەم (سەمفۆنیا خواستراوە بۆ با)، وێنەی دووەم جووڵانەوەی پۆپە و گەڵای درەختەکە وەك مرۆڤێك پیشاندراوە کە لەگەڵ مۆسیقای خۆش کەوتبێتە سەماکردن، وێنەی دووەم بەشێوازی بەکەسکردن دروست بووە و وێنەیەکی وەسفییان دروست کردووە ⁾⁾[١٨]، ئەم لێکدانەوەیەی شاعیر هەموو ئەو خاسیەت و تایبەتمەندییانە ڕوون دەکاتەوە، کەوا دەدرێتە پاڵ ئەو زمانە تایبەتەی بەزمانی شیعری ناودەبرێت.

**دووەم– قۆناغەکانی زمانی شیعری کوردی:**

دیارە ئەو زمانە شیعرییەی ئەمڕۆ لەشیعری هاوچەرخی کوردیدا دەبینرێت، بەچەند قۆناغێکی مێژووییدا تێپەڕ بووە چەندین گۆڕانکاری بەسەرداهاتووە تا بەو جۆرەی ئەمڕۆ گەیشتووە، و ئەگەر بەدواداچوونێك بۆ شیعری کوردی بکەین بەدرێژایی قۆناغەکانی مێژووی ئەدەبی کوردی، دەبینین (( لەشیعری کلاسیکیی کوردیدا، زمانێکی تێکەڵ بەوشەکانی عەرەبی و فارسی و تورکی بەکارهاتووە، ئەویش لەئەنجامی کارتێکردنی ڕۆشنبیریی ئەو نەتەوانە لە ڕۆشنبیریی کوردی و شاعیر وشەی هەموو شیعری ڕۆژهەلات و زمانانی ڕۆژهەلات بەمولکی خۆی دەزانیێ، لەبەرئەوە وشە (موفرەدات)ی ناو شیعری کوردیی ئەو سەردەمە، لەکوردی و عەرەبی و فارسی و تورکی و زۆر تەعبیر و ئیستلاحی ئیسلامی تێکەڵە))[(١٩)]، ئەم تێکەلاوییە بەزمانی بێگانە بەدرێژایی سالانێکی دوورودرێژ بەسەرجەم شیعری کلاسیکییەوە دیارە، لەم بارەیەوە د. **عیزەدین مستەفا ڕەسول** دەلێت: (( ئەگەر بەپێی پلەکانی گۆڕانی زمانی شیعری قۆناغ بۆ مێژووی ئەدەبی کوردی دابنێین، ئەبێ دابەشکردنەکەمان بەم چەشنە بێت:

١. پلەی یەکەم کە زمانێکی کوردیی لەئەمڕۆ نەچووە و چەند نموونەی گومان لێکراو نەبێ نموونەی تریمان نییە و لای هەندێك ئەگونجێ زمانی ئاوێستاش بەوێنەی ئەم پلەیەی ئەدەبی کورد دابنێن.

٢. بەکارهێنانی زمانی ناکوردی لەنووسینی شاعیر و نووسەرە کوردەکاندا، کە تاچەند چەرخ هەر عەرەبی بووە و لە چەرخەکانی دواییدا فارسی و تورکیشی چۆتە پاڵ.

٣. گەڕانەوە بۆ سەر زمانی کوردی و بەکارهێنانی زمانێك بۆ شیعر کە چوارچێوەکەی کوردی بێت و وشەکانی بەکارتێکردنی ئەدەبیاتی ئیسلامی تێکەڵ بن لە وشەی کوردی (بەزۆری) و وشەی گەلانی موسوڵمانی دراوسێ و کوردیی هاوبەشی ناو هەموو کورد لەپاڵ ڕەگەزی تاقە دیالێکتێکی کوردی کە تێیدا دیاربێ.

٤.بۆ ماوەیەكی كەم بەكارهێنانی زمانێكی كوردیی تێكەڵ بەوشەكانی ئەدەبیاتی عوسمانی ـ واتە وەرگرتنی ئەو وشە عەرەبی و فارسی و توركییانەی لە ئەدەبیاتی توركی عوسمانیدا بەكاردەهاتن ››[٢٠].

دوای ئەم قۆناغانەی باسكران، بەتایبەتی دوای تازەكردنەوەی شیعری كوردی و لەسەر دەستی ئەو شاعیرانەی بەڕابەرانی تازەكردنەوەی شیعری كوردی دادەنرێن، زمانی شیعری گۆڕانكاری بەرچاوی بەخۆیەوە دیت، و دواتریش بەچەند قۆناغێك زمانی شیعری گەیشتە ئەو پلەیەی ئەمڕۆ دەبینرێت، ئەم گۆڕانكارییانەش بەهۆی ئەمەوە بووە، كە ‹‹ زمانی شیعری وەكو بنیاتێكی سەرەكی هەمیشە لای شاعیران وەكو گرفتێكی گەورەی خۆیان سەیریان كردووە بەردەوام گەڕاون بەدوای جوانترین زمانا كە جیاواز بێت لەزمانی پێشوویان و شیعریەتی پێبخەنە نێو چوارچێوەیەكی هونەرییەوە، ئاماژە و دەلالەتی زۆر بگرێتە خۆی و لەپانتایی فراوانی خەیاڵ و ئەندێشەدا وێنەی بێهاوتا لەڕێگەی زمانی شیعری نوێیانەوە بهێننە بەرهەم››[٢١]، لە قۆناغێكی تریشدا كە بەشیعری هاوچەرخ ناودەبرێت، جۆرێكی تر لە زمانی شیعری جیاواز لەقۆناغی پێشوو هاتەكایەوە، هەرچەندە سەبارەت بەم گۆڕانكارییانەی كە بەسەر زمانی شیعریدا هاتووە، نووسەر و ڕەخنەگرانی ئەم بوارە ڕای جیاوازیان هەبووە، و‹‹ لەگەڵ گۆڕانی زمانی شیعری كوردی وە بەتایبەتی لەڕووی بەكارهێنانی كوردییە پەتییەكە، لەناو ڕەخنەی ئەدەبی كوردیدا دوو هەڵوێست بەرامبەر بەزمانی شیعری نوێی كوردی دروست بوو، هەڵوێستێكیان داوای ئەوەی دەكرد زمان لە وشە و زاراوە و دەربڕینەكانی زمانە غەیرە كوردییەكان پاك بكرێتەوە و ڕووبكاتە كەرەستە خۆماڵییەكە و خۆی بەوشە و زاراوە كوردییە ڕەسەنەكان ببەستێتەوە، هەڵوێستێكیشیان بەپێچەوانە داوای سوود وەرگرتن لە وشە و زاراوەكانی زمانە غەیرە كوردییەكانی دەكرد و هیچ زەرەر و زیانێكی لەم وەرگرتنەدا نەدەبینی بەڵكو بەپێچەوانەوە پەرەسەندنی هەر زمانێكی بەبوونی ئەو پەیوەندییە دەبەستەوە كە زمانە نەتەوەییەكە لەگەڵ زمانانی تردا پەیدای دەكرد ››[٢٢]، واتە بەلای هەندێكیانەوە ئاساییە تاڕادەیەك وشەو زاراوەی زمانە بێگانەكان بخزێتە ناو دەقی شیعری كوردییەوە، هەرچەندە هۆكارەكانی ئەو بەكارهێنانە بۆ وشە و زاراوەی بێگانە جیابوو لەو هۆكارانەی

بەسەر شاعیرانی کلاسیکی کوردیدا سەپێنرابوون، بەدەربڕینێکی تر: (( ئەگەر شاعیرانی کلاسیك وەکو پێویستی‌یەکی شیعر هانایان بۆ وشەی جگە لە کوردی بردبێت، کە دەبوایە زمانەکەیان تێکەڵ بێت ئەوا شاعیرانی هاوچەرخ بەبێ پێویستی دەرەوە بۆ بوونی ئەم جۆرە وشانە، خۆیان ئارەزووی بەکارهێنانیان دەکەن، لەنیوەی دووەمی هەشتاکان بەسەرەوە وشەی عەرەبی و وشەی هەندێ زمانی تر بەدی دەکرێن، وەك: (فستان، تەسریحە، یەئس، موسافیر، بەردی سجیل، سەراب، میحراب، فیردۆس، قودسیەت، غەرق، خیانەت، وەهم، عەبەس، ... هتد) کە هەندێکیان پاشماوەی زمانی کلاسیکن، یان وشەی بێگانە نموونەی (دانس، ڕیستوان، سۆنات، سەمفۆنیا، ڤالس، واگۆن، ئەلبوم... ))[٢٣]، بیانووی پەیڕەوکەرانی ئەم بۆچوونە ئەوە بوو کە پێیان وایە: (( زمان بەهۆکارێك دادەنرێت بۆ گواستنەوەی هەست و نەست و ڕوویەکی گەش و دیاری شیعریشە، پێویستە زمان بەپێی سەردەم و بارودۆخ نوێ بکرێتەوە هەروەکو چۆن شیعر بەپێی قۆناغەکانی گەشەکردنی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی لەگۆڕان و گەشەکردندایە و خۆی نوێ دەکاتەوە ئاوهاش زمان پێشدەکەوێت و پێویستی بەنوێکردنەوە هەیە. ڕەخنەگران پێیان وایە کە پێویستە شاعیر ئەو زمانە بەکاربهێنێت کە لەمیللەت نزیك دەبێتەوە و هاوچەرخ بێت ))[٢٤]، کەواتە پێویستە زمانی شیعری لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی تر گۆڕانکاری تێدا دەرکەوێت، دەرکەوتنی ئەو وشە بێگانانەی کە لەزمانی ئاسایی قسەکەرانی کورددا کەمتر بەدی دەکرا بەشێوەك لەم گۆڕانکارییە لەزمانی شیعری دەبینن.

سەبارەت بەزمانی شیعری و گۆڕانکارییەکانی بەپێی قۆناغ و سەردەمەکان **عەبدولخالق یەعقووبی** لە وەڵامی پرسیارێکی تایبەت بەزمانی شیعری دەڵێت: ((... زمان دەتوانێ بەپێی کات و سەردەم بەردەوام لەحاڵی گۆڕان و گەشەکردن و تازەکردنەوەی خۆیدا بێت، یانی ئەو زمانەی کە بۆ نموونە نەوەی ئێستا بەکاری دێنیچت ڕەنگە ئەو زمانە نەبێت کە نەوەی داهاتوو بەکاری دێنن، چونکە نەوەکانی داهاتوو لەوانەیە خەم و کەڵکەڵەی خۆیان هەبێت و بۆ ئەم خەم و کەڵکەڵەیەیان زمانی تایبەتی خۆیان بدۆزنەوە، بەڵام ئەوەی لای من گرنگە ئەوەیە کە ئێمە بتوانین لە چوارچێوەی هەر زمانێك کە بەکاری دێنین بۆ فیکری خۆمان

ئەوەندە شێوە بەکارهێنانەکەمان دروست و مەنتیقی بێت، کە خوێنەر تێمان بگات بەپێی ئەو فیکرەی کە بەدەستەوە دەدەین، زمانەکەش دەرەقەتی وەدەرخستنی ئەو فیکرەیە بێت، بۆ نموونە تۆ لەدەقێکی شیعریدا کە بتەوێ بچیتە ناو ناخی جیهانەوە، بچیتە ناو ناخی مرۆڤەکانەوە، ناتوانی ئەو جۆرە زمانە پەخشان ئامێزە بەکارببەی کە هەر لەئاستی ڕووکەشی شتەکان دەگیرسێتەوە، یا بۆ نموونە لەجیهانی نووسینی تیۆری و ڕەخنەدا تۆ ناتوانی ئیتر باس لە شاعیرێك بکەی وەکو ئەو شێوە باسکردنانەی ڕەخنەگران و شیکەرەوانی نەوەکانی پێشوومان بەکاریان دێنا، هەروەك بۆ شاعیرێك دەیانوت (ئەستێرەی پرشنگداری ئاسمانی ئەدەب) یا (کەسێك کە ئەسپی خۆی تاوداوە لە بواری شیعری کلاسیکدا))[٢٥]، بێگومان بۆ سەلماندنی ئەم لێکدانەوەی سەرەوە ئەگەر بۆ نموونە چاوێك بەکتێبی ڕەخنەیی مێژووی ئەدەبی کوردی (عەلائەدین سوجادی)دا بخشێنین، زاراوە و دارشتنی لەم شێوەیەی سەرەوە دەبینین[٢٦]، بەڵام لەنووسین و دارشتنی ئەم سەردەمەدا ئەم دەربڕینانە پەسەند ناکرێت.

**سێیەم– سەرچاوەکانی زمانی شیعری هاوچەرخی کوردی:**

سەبارەت بەسەرچاوەکانی دروستبوونی ئەو زمانە شیعرییەی ئەمڕۆ لای شاعیرانی هاوچەرخی کوردی دەبینرێت، بیر و ڕای جیاجیا بەدیدەکرێت، بەڵام هەموو ئەمانە لەو بۆچوونەدا کورت دەکرێنەوە، کە پێی وایە(( سامانی وشەی شاعیرانی هاوچەرخ لەچەندین سەرچاوەی جیاجیاوە هەڵقوڵاوە گرنگترینیان: ١. پاشماوەی زمانی کلاسیك. ٢. زمانی هاوچەرخ، ئەو وشە نوێیانە لە قۆناغی ئێستای کۆمەڵگادا بەکاردەهێنرێن. ٣. وشە میللییەکان و بابەتەکانی فۆلکلۆر، هەڵگری وشەی ڕەسەنی زمان. ٤. وشە و دەستەواژەی نێو فەرهەنگی شاعیرانی بێگانە، یا هەر زمانی خەڵکی بێگانە لە ئاکامی فێربوون و ئاشنایەتی ڕاستەوخۆی هەندێ لە شاعیران لەگەڵ زمانەکاندا، لە هەشتاکان بەسەرەوە. ٥. وشە و دەستەواژەی نێو زانستە جۆراوجۆرەکان، نموونەی زانستی دەروونزانی، کۆمەڵناسی... هتد))[٢٧]، هەموو ئەو سەرچاوانە بەیەکەوە زمانێکی شیعریی جیاوازیان لە شیعری هاوچەرخی کوردیدا هێنایە کایەوە، سەرەڕای ئەوەش

دەتوانین سەرچاوەیەکی تری ئەم زمانە بگەڕێنینەوە بۆ توانا و لێهاتوویی شاعیر لە داتاشینی وشەی تازە،(( دوای ئەوەی وشەکانی فەرهەنگی شاعیر بەهاکانیان لەدەست دەدەن، بیر لە وشەی تر دەکەنەوە، ئەگەر ئەو وشانەی دەیانەوێ، لە دەوروبەری خۆیاندا نەیدۆزنەوە هانا بۆ داهێنانی وشەی تازە بابەت دەبەن، لە چەشنی (مۆمستان، خۆڵستان، بەفرنووس، بەفرکوژ، خوێنە کۆلا، شەونماوی، ژینهەڵوەرین، سەماگا، وێرانستان... هتد))[٢٨]، ئەو وشە و زاراوانە لە زمانی ئاساییدا بەدی ناکرێت، بەڵام بە بەکارهێنانیان لە شیعردا زمانێکی تایبەت بەدەقی شیعری دەبەخشرێت.

## بەشی دووەم
## ستاتیکای ڕوخساری شیعر

### یەکەم- ستاتیکای ناونیشانی دەق:

ناونیشان بەشێکی گەورەی ستاتیکای دەق پێکدەهێنێت، ناونیشان یەکەم پلیکانەیە کەوا خوێنەر بەرەو دەقی ئەدەبی پێیدا سەردەکەوێت، یان وەك دەروازەیەکە کەوا خوێنەر لێیەوە بەرەو ژوور دەچێت، بۆیە پێویستە ناونیشان سادە و ڕوون بێت، تا خوێنەر بەئاسانی بگات بەو نهێنی و مەبەستانەی دەقەکە لەخۆی دەگرێت، جوانی و ستاتیکای دەقی شیعر لە ناونیشانەوە دەردەکەوێت، ناونیشان ڕۆڵێکی گرنگ دەگێڕێت لە ڕۆشنکردنەوەی ڕێگەی بەردەم خوێنەر، تا بەئاسانی بەرەو دەق هەنگاو بنێت، و بەقووڵایی دەقە ئەدەبییەکەدا شۆڕبێتەوە، (( بەشێوەیەکی گشتی، ناونیشان جا ناونیشانی لێکۆڵینەوە بێت، یان دەقێکی ئەدەبی، بەپێی شوێنە جوگرافییەکەی کە هەمیشە لە بەشی سەرەوەی باسەکە، یان دەقەکەدا دەبێت. زۆرجار بووەتە جێگای سەرنج و بایەخ پێدانی خوێنەر، چونکە یەکەمین برگە و وشە و دەستەواژە و دێرە کە دەکەوێتە بەر دیدەی خوێنەر و هەر زوو ـ بەر لە ناوەڕۆك ـ سەرنجی خوێنەر بەلای خۆیدا ڕادەکێشێت، هەربۆیەشە لە سەردەم و قۆناغی جیاجیادا، هەریەك لە نووسەر و خوێنەر، چۆنێتی و چەندایەتی داڕشتنی ناونیشانیان لەبەرچاو گرتووە ))[٢٩]، هەر لەسەر ئەم بنەمایە، لەم تەوەرەیەدا قسە لەو تایبەتمەندییانە دەکەین کە لەناونیشانی

دەقە شیعرییەکانی ئەم دیوانە شیعرەدا بەرچاو دەکەون، ئەمەش بەهۆی ئەوەی ((ناونیشان لە رەخنەی نوێدا لایەنێکی گرینگ لە ستراتیژییەتی تێکست پێکدەهێنێ و دەبێتە دەروازەیەك بۆ چوونە نێو جیهانی هەر تێکستێکی ئەدەبی و، خوێنەر لەوێوە بەرەو رەهەندە نادیارەکانی دەق هەنگاو هەڵدەنێت، بۆیە دەگوترێت (ناڤونیشان وەکو ئێکەم کلیلا دەستبەکاربوونێ دهێتە هژمارتن، تاکو برێکا وێ بشێنن، برەنگەکی سیموتیکی نهێنیێن تێکستێ ڤەکەین))[٣٠]، هەروەك دەبینین ناونیشانی ئەم دیوانەش بەهەمان شێوە کلیلی دەقەکەی پێکدەهێنێت، و لە ناونیشانەکەوە بەرەو ئەو نهێنییانە دەچین کە لە سەراپای دەقە شیعرییەکاندا بەدیدەکرێن، بۆیە لە سەرەتادا قسە لە ناونیشانی سەرەکی بەرهەمەکە دەکەین، وەك دەبینین (مۆسیقای نامۆیی) ناونیشانێکی تازە و سەرنجڕاکێشە و سەرنجی خوێنەر بەلای دەق ڕادەکێشێت، ئەم ناونیشانە ناونیشانێکی شیعرییە، چونکە مۆسیقا وەك هونەرێکی دەنگی مێژوویەکی زۆر دێرینی هەیە لەژیانی مرۆڤایەتیدا، و مرۆڤ بەبیستنی مۆسیقا تەزوویەك بەلەشی دادێت، و خۆشی و چێژی پێدەبەخشێت، و مۆسیقا وەك هونەرێك نزیکترین هونەرە لە شیعرەوە، بەهۆی سروشتی هەردووکیان، کەوا هەردووکیان بەهەستی بیستن وەردەگیرێن و کار لە خوێنەر دەکەن، بەڵام بەکارهێنانی زاراوەیەکی لەشێوەی (مۆسیقای نامۆیی) بەسەریەکەوە، زاراوەیەکی تازەیە و ئەوەندەی ئێمە ئاگاداربین لەمەوپێش لەئەدەبی کوردیدا بەکارنەهاتووە، نامۆیی زاراوەیەکی کۆمەڵایەتی و فەلسەفییە، کەوا ئەمڕۆ بەشێوەیەکی بەرچاو پەرپوەتەوە ناو بواری ئەدەب و رەخنەی ئەدەبی، و((زاراوەی نامۆیی بۆتە باوترین چەمکی سەردەم، کە قسە و باسی زۆری لەبارەی دەکرێ، چەندین پێناسەی تەمومژاوی لەدەوری خۆیدا کۆکردۆتەوە، هۆکارەکەشی ئەوەیە، ئەم بارە ناتەندروستە لەم سەردەمە پڕ کێشمە کێشمەیە بۆتە دیاردە ))[٣١]، هەرچەندە وەك زاراوە بەشێوەیەکی سادە و گشتی نامۆیی زیاتر بە واتای ئەو دڵتەنگی و نائومێدییە دێت کەوا کەسی دوورە وڵات، وەك هەست و سۆزێك بۆ زێدی خۆی هەستی پێدەکات، بەڵام سەرەڕای ئەوەش زیاتر لەجۆرێك بۆ نامۆیی دیاری دەکرێت، و دەتوانین بەشێوەیەکی گشتی سەبارەت بە جۆرەکانی تری نامۆیی بڵێین:ــ(( ئەم حاڵەتە کاتێك هەستی پێدەکرێت، کەوا

كەسەكە هەر لەناو وڵاتدا دەژی، بەڵام بەهەر هۆكارێك بێت توانای ئەوەی نییە بەشداری بكات لەبنیاتنانی وڵاتەكەی، و تەواوكردنی كەموكورتییەكانی، بۆیە هەست بەبێزاری و نائومێدی دەكات. هەندێكجاریش نامۆیی هەستێكە كە مرۆڤ لەگەڵ دڵ و دەروونی خۆیدا، واتە لەگەڵ خودی خۆیدا هەستی پێدەكات، ئەمەش بەكاریگەری چەند هۆكارو بارودۆخێكی جیاجیا دێتە كایەوە، كەوا لەشێوەی كۆت و بەندێك دێنە سەر ڕێگەی ژیان و مرۆڤ وا لێدەكەن بەرامبەر بەژیان ڕەشبین و نائومێد بێت، و بەهۆیەوە نەك بەرامبەر دەوروبەر، بەڵكو لەگەڵ خۆشیدا نامۆ بێت، هەموو ئەوانەش لای شاعیران وەك هەر مرۆڤێكی تر دەردەكەون))[٣٢]، ئەم دوو جۆرەی لەدوا پێناسەدا دەركەوتن بریتین لە نامۆیی لەناو وڵات، و نامۆیی مرۆڤ لە خودی خۆی، لەم بەرهەمە شیعرییەدا ئەم هەستانە بەدی دەكرێت، هەروەكو لەچەند دێری دواتردا ڕوون دەبێتەوە، و شاعیر سەركەوتوو بووە لە دەستنیشانكردنی ناونیشانی (مۆسیقای نامۆیی) بۆ بەرهەمەكەی، سەرەڕای ناونیشانی دیوانەكەش، شاعیر لەدەقێكی شیعریدا لەژێر ناونیشانی (ترۆپكی نامۆیی) هەمان زاراوەی نامۆیی دەكات بەناونیشان، و ئەم هەستە بەرجەستە دەكات و دەڵێت:

**من كەسێكی گەلیٚ نامۆم،**
**زۆرجار دەڵێم ئەو وڵاتە جیٚ دەهێڵم و**
**دەڕۆم دەڕۆم ؟!**
**دواتر كە زۆر ڕادەمێنم**
**دەڵێم ئاخر كە ڕۆیشتم، نامۆیی دووریش دەمكوژیٚ،**
**ناڕۆم ناڕۆم؟!**
**با لە خولگەی سەری خۆم نامۆبم،**
**نەك لە دووری وڵاتی خۆم.** [٣٣] ل. ١٥٠

لەم دەقە شیعرییەدا نامۆیی مرۆڤ لەگەڵ خودی خۆی دەبینرێت، ((دەكرێت لێرەدا قسە لەبارەی نووسەرێكەوە بكەین كە بۆ خۆی كائینێكە نەك هەر لەدەرەوەی سنوورەكانی نیشتمان، بەڵكو لەناو جەرگەی نیشتمانیشدا و زۆربەی جاران ئەو هەر نامۆ و ناتەبایە بە شتە باوەكان، مەنفای نووسەر لە چەمكە

فیزییەکەوە مەرج نییە لەدەرەوەی سنوورەکانی نیشتمانەوە دەستپێدەکات، زۆرجاران نیشتمانیش بۆ خۆی دەبێتە مەنفا بۆ نووسەر))[٣٤]، **هاوژین** ی شاعیر لەم دەقەدا، تا ئێستا هەر لەسنووری وڵات و زێدی خۆیەتی، بەڵام کاتێك بەنیازی کۆچ دەبێت، لەبڕیارەکەی پاشگەز دەبێتەوە، چونکە وا هەستدەکات، لەهەر شوێنێك بێت، لەناو وڵات و لەدەرەوەی ئەوا ئەو هەستە بەرۆکی بەرنادات، چونکە هەستی نامۆیی لەگەڵ ناخیدا تێکەڵ بووە، و هەرگیز ئومێد و گەشبینییەك بەخۆیەوە نابینێت، بۆیە بڕیاری مانەوە دەدات و لەناو وڵات بەدیار نامۆیی خۆیەوە ژیان بەسەر دەبات، ئەم بەرجەستەکردنەش بۆ ئەم جۆرەی نامۆیی، دەگەڕێتەوە بۆ توانا و لێهاتوویی شاعیر، چونکە وەك نووسەر ڕەخنەگری هاوچەرخی کورد **فازیڵ** شەورۆ دەڵێت: ((تا مرۆڤ ڕۆشنبیرتر و ڕووناکبیرتر بێت، باشتر تێدەگا چەندە نەفام و پاشەگردان و گۆشەگیرە، لە تێگەیشتنی بوون و گەردوون و فەنابووندا. لێرەدا، نامۆبوونی ڕۆشنبیر گەشە دەکا. ڕاڤەکردنی (**هیگل**) بۆ ئەم دیاردەیە ئەوەیە کە لەم ڕەوشەدا ڕوحی مرۆڤی فەشەل دەهێنێ لەگەڵ خودی خۆی لە جیهانە مەوزووعییەکەی کە تێیدا دەگوزەرێنێ))[٣٥]، دیارە شاعیر لەم ڕووەوە توانای خۆی بەدەرخستووە و جوان مەبەستەکەی پێکاوە، هەر بەم هۆیەوە بە بەکارهێنانی ستاتیکا لەزمانی شیعر ئەو ناونیشانەی بەدەق بەخشیوە، کە هەم لەگەڵ دەقەکە و هەم لەگەڵ ناونیشانی سەرەکیی بەرهەمەکە هاوتەریب دەبن.

بێگومان ئەگەر زیاتر بەدەقە شیعرییەکانیشدا قووڵبینەوە، چەندین ناونیشانی دەقی شیعر بەرچاو دەکەون کەوا جێگەی سەرنجن، و گرنگی و بایەخی خۆی دەبێت بۆ گەیاندنی پەیامی شاعیر بە وەرگر، چونکە ((ناونیشان بێجگە لە ئەرکی سەرنجڕاکێشان و ئاماژەکردن بۆ خودی تێکست، خۆیشی وەکو بابەت و وەکو تەوەر لەدوتوێی دەقی ئەدەبیدا بەرجەستە دەبێت و ڕەنگ دەداتەوە، بەوپێیەش پێکهاتەی ناونیشان نیشانەکانی سیمۆتیکای زمانە، بۆیە دەبێ لێکۆڵەر خوێندنەوەی تایبەت بۆ نیشانەکان و چۆنیەتی بەکارهێنانیان بکات، تاوەکو لەڕێگای کردنەوەی ئەو ئاماژ و نیشان گەلە بەرەو شیکردنەوەی تێکستەکە هەنگاو هەڵبگرێت و لەدوا شیکردنەوەشدا دەشێ بگوترێت کە ناونیشان دەبێتە ناسنامەیەك بۆ دەق و ئەو ڕۆڵە بەجێ دەگەیەنێت))[٣٦]، هەروەکو لەم چەند نموونە شیعرییەی خوارەوەدا ڕاستیی ئەو لێکدانەوەیان بۆ دەردەکەوێت:

١. **ئەو دەقانەی بێ ناونیشانێكی دیاریكراون:** له مۆسیقای نامۆییدا، چەند دەقێكی شیعری دەبینرێن، كەوا هیچ ناونیشانێكی دیاریكراویان نییه، تەنها له كەوانەیەكی داخراودا چەند خاڵێكی لەدوای یەكتر دەبینرێت، چونكه لەدەقی تازه و هاوچەرخدا مەرج نییه لەهەموو حاڵەتێكدا ناونیشان ڕستەیەكی ئاسایی و كورت بێت، ‹‹ بەڵكو دوور نییه ناوونیشان نیشانەیەك بێت له نیشانەكانی خاڵبەندی، یان هێمایەكی بواری ئەندازه و بیركاری و كیمیا بێت، یان تەنیا دانانی چەند خاڵێك بێت ››(٣٧)، ئەم بابەتەش لەم دیوانەدا دەدۆزرێتەوه، بۆ نموونه:

(.....)
**جەستەم پارچەیەكه له ئازار و**
**پارچەیەكه له مۆسیقای نامۆیی**
**گیتارێكه**
**هەر غوربەت و**
**هەر فرمێسك و**
**هەر ناڵه ناڵ و**
**هەر هەنسك و**
**هەر هەناسەی غەریبی دەژەنێ.** ل. ٢٩

لێرەدا شاعیر بێ ناونیشانێكی دیاریكراو دەقەكەی پێشكەش دەكات، ئەویش بۆ ئەوەی دەروازەیەك بۆ خوێنەر بهێڵێتەوه، تا خوێنەر بكات بەكەسێكی چالاك بەدەوری دەقدا، كاتێك وەرگر تەواوی دەقەكەی پێدەگات، و بەپێی ئەو پەیامەی له سەراپای دەقەكەدا هاتووه ناونیشانێك بۆ دەقەكه دیاریدەكات. شاعیر لەو دەقەدا دەیەوێت لەگەڵ ناونیشانی كۆشیعرەكەیدا بەرامبەر بوەستێت، و بۆ خوێنەری دەقی ڕوون دەكاتەوه، كەوا كەسی قسەكەر سەراپای لەشی ئازاری هەیه، و لەشێوەی ئامێرێكی گیتار دەردەكەوێت، بەڵام ئەو ئامێره ئاوازی غوربەت و ئاوازی فرمێسك و گریان دەژەنێت، واته گیتاری لەشی ئەو تەنها لەگەڵ ئێش و ئازار و نەهامەتی و خەمناكیدا ئاشنایه، و هیچ ئاوازێكی تر پێشكەش ناكات، ئەوەی لەم دەقەدا دەبینرێت بەبێ بوونی ناونیشانێكی دیاریكراو ئەو پەیامه دەگەیەنێت، كەوا كەسی قسەكەر هەست بەخەم و ئازارێكی زۆر دەكات و

بەهۆیەوە لـە گیتارێك دەچـێت کـە تـەنها ماتـەم دەگێڕێـت، و هەریەکـە لەئێمـەی خوێنەریش هەر جۆرە ئازارێك لـە دڵ و دەروونمانـدا هەسـت پێبکـەین، دەتـوانین بەخەیاڵ بیکەین بەناونیشان بۆ دەقەکـە، هـەروەها نموونـەی تـری هاوشـێوە لـەو دیوانە شیعرییەدا دەبینرێت[٣٨].

**٢. ئەو دەقانەی ناونیشانەکەی هەمان دێری یەکەمی دەقە شیعرەکەیە:**

لەم بەرهەمەدا چەند دەقێکـی شـیعری بەرچـاو دەکـەون، کـەوا ناونیشـانی دەقەکـەیان بریتییـە لـە ڕسـتەیەکی دیـاریکراو، ئـەو ڕسـتەیە لـە دێـری یەکـەمی دەقەکەدا دووبارە دەبێتـەوە، ئـەوەش جۆرێك تایبەتمەنـدی و مۆسـیقا و ئاوازێـك بەشیعرەکە دەبەخشێت:

**( تا چاو بڕکا خۆشم دەوێی )**

**تا چاو بڕکا خۆشم دەوێی**

**ئەی شا کچی چاو پەلکە گیا،** ل. ١٩

لـەم دەقـەدا شـاعیر ڕووی قسـەی کردۆتـەوە کەسـێکی خۆشەویسـتی، دەیەوێت خۆشەویسـتیی خـۆی بـۆ دەربڕێـت، لـە ناونیشـانی دەقەکـەوە لـە ڕێـی ڕستەیەك ڕادەی خۆشەویستییەکەی دەخاتەب ەرچاو کەبریتییە له (تـا چـاو بڕکـا خۆشم دەوێی)، لەم دەربڕینەوە ئاشکرای دەکات خۆشەویستییەکەی تـا سـنووری توانای بینینی چاوەکانی پەرە دەسێنێت، هەمان ڕستەی ناونیشان لـەنیوە دێـری یەکەمدا دووبارە دەبێتـەوە، ئـەوەش سـتاتیکایەکی جـوانتر بەشـێواز و مۆسـیقای دەق دەبەخشـێت، نموونـەی تـر لـەم سـتاتیکایە لەدرێـژەی دیوانەکـەدا بـەدی دەکرێت[٣٩]، سەبارەت بەمۆسیقای شیعریش ئەوا دواتر زیاتر لەبارەیەوە دەدوێین.

**٣. ئەو ناونیشانانەی کە لەگەڵ بابەتی دەقەکەدا دەگونجێن:**

لەو دیوانەدا چەند دەقێك هەن، کەوا شاعیر ناونیشـانێکی تایبـەتی پێـداون، ئەو ناونیشانە لەگەڵ ئـەو بابـەت و ناوەڕۆکـە گونجـاوە کـەوا دەقەکـە بەخۆیـەوە دەبینێـت، بـۆ نموونـە لـەژێر ناونیشـانی ( **بـووك و زاوا** ) دەقێکـی شـیعر بەرچـاو دەکەوێت:

**کاتێ دوو ڕووبار پێکدەگەن،**
**لە حەژمەتی ڕێی غوربەتا**
**باوەش بەیەکتری دەکەن،**
**تێر یەکتری دەمژن و تێر ماچ دەکەن،**
**کەف و کوڵ و زووخاو و خوێن تێکەڵ دەکەن.** ل. ١٠٨

لەم دەقەدا شاعیر وێنەی دوو ڕووبار دەکێشێت، ئەم جۆرە وێنەکردنە لە شیعری کوردیدا شتێکی تازە و نامۆیە، هەروەکو **لەتیف هەڵمەت** لەپێشەکی مۆسیقای نامۆییدا لەبارەی ئەم حاڵەتانەوە دەڵێت: ((بەلای منەوە گرنگترین خەسڵەتی شیعر خەیاڵ بەرینی و دروستکردنی وێنە بە وشە و دۆزینەوەی بابەتگەلێکە کە شاعیرانی دی نەیاندۆزیوەتەوە... و لەم ڕوانگەیەوە کاك (هاوژین صلیوە) شیعریەتی داوە بەزۆربەی کەرەستە و بوونەوەری پەراوێزخراو شتە ون و گومناوەکان و بابەتە نادیارەکانی گەردوون و سروشت و لەگەڵ شیعریدا بەجۆرێکی شێوەکاری بیرو مەبەستەکانی خۆی دەربڕیوە.. و لەهەندێ شیعریشدا کامیرای پێیە و وێنەی بابەتەکان دەگرێ و بەڕتووشکارییەکی ئەوتۆ و جیاوازەوە دەیانخاتە ڕوو، کە لە وێنەی شتە گیراوەکە ناچێت و وەکو شتێکی نوێ دێتە کایەوە))[(٤٠)]، وەك لەم دەقەدا دەبینرێت، شاعیر شێوەی دوو ڕووبارمان بۆ دەکێشێت، ئەو دوو ڕووبارە لەشێوەی دوو کەس لە دوو ڕەگەزی جیاواز پیشاندراون، کە لەکاتی سەرەتای هاوسەرگیریدان، لەم حاڵەتەدا کە بەیەکەوە بەبووك و زاوا دەناسرێن، ئەو دوو ڕووبارەش لێرەدا کۆمەڵێك خاسیەتی بووك و زاوایان پێدراوە، وەك لەدێری یەکەمدا دەبینرێت، کەوا دوو ڕووبارەکە باوەش بەیەکدا دەکەن لەبەرئەوەی لەدوورەوە هاتوونەوە و دووبارە بەیەکگەیشتوون، ئەم هەڵوێستە هاوشێوەیە لەگەڵ ڕەفتاری بووك و زاواکان، لەدێری دواتردا ڕووبارەکان یەکتری دەمژن و یەکتری ماچ دەکەن، ئەمەش لای خوێنەر ئاشکرایە، کەوا هەمان کردەی سێکسییە، کەوا بووك و زاواکان بەرامبەری یەکتری دەینوێنن، لەدوا دێری نموونە شیعرییەکەشدا، دوو ڕووبارەکە بەخوێن تێکەڵ دەبن، ئەوەش هاوشێوەی ئەو جووتبوونەیە کەوا لەنێوان هاوسەرەکاندا دێتە کایەوە، هەروەك چۆن دوو هاوسەرەکە کەفوکوڵەکەیان دادەمرکێتەوە، دوو ڕووبارەکەش بەم

شێوەیە ئاوێتەی یەکتر دەبن و بەباران گەورەتر دەبن، چونکە دووبارە تێکەڵ بوون، ئەوەش هێمایە بۆ خۆشەویستییەکی پاك، وەك دەگوترێت لە یاسای خۆشەویستیدا ١+١=١ بەپێچەوانەی هەموو کۆکردنەوەیەکی تر، کەواتە شاعیر سەرکەوتوو بووە لەناونانی دەقەکەی، چونکە کۆمەڵێك خاڵی هاوبەش لەنێوان دوو رووبارەکە و بووك و زاوادا دەبینرێن، هەمان شێوە لەدەقێکی تردا بەناونیشانی (بیرکاری) دا، کەوا هەمان شێوەی ناونیشانی تێدا پەیرەو کراوە و هەمان هاوکێشەی بیرکاریش لەخۆ دەگرێت :

**گوڵ+هەنگ= شیری زەرد**

**گیا+مانگا= هەنگوینی سپی**

**خۆر+مانگ= شەو بە ڕۆژ**

٢+٢=٤

**من+یار=١** ل. ١٣٠

لەم نموونەیەدا ناونیشان زاراوەیەکە کە پەیوەستە بەو بابەتەی کە لەتێکڕای دەقەکەدا هاتووە، و کۆمەڵێك هاوکێشەی بیرکاری بەدوایەکدا ڕیز کراون کەوا هەر ناونیشانێکی وەك ( بیرکاری) لە دەقێکی لەم شێوە دەوەشێتەوە، لەهەریەك لەنیوە دێرەکانی ئەم کۆپلە شیعرەدا هاوکێشەیەکی بیرکاری بەرچاو دەکەوێت، لەنیوە دێری یەکەمدا گوڵ و هەنگ بەیەکەوە کۆدەکرێنەوە و هەنگوینێکی زەرد دروستدەکەن، بەڵام لەنیوە دێری دووەمدا گیا و مانگا پێکەوە کۆبکرێنەوە شیر بەرهەم دەهێنن، ئەم شیرە لە بنەڕەتدا سپییە، بەڵام لەنێوان نیوەدێری یەکەم و دووەمدا جێگۆڕکێیەك ئەنجامدراوە و لە یەکەمدا شیری زەرد و لەدووەمدا هەنگوینی سپی بەپێچەوانەی ڕەنگی ڕاستەقینەی خۆیان خراونەتە ڕوو، ئەو جێگۆڕکییەش تەنها بریتییە لە ستاتیکایەکی تری زمانی شیعری کە بەم هونەرکارییانەوە بنیاتنراوە، لەنیوەدێری سێیەمدا خۆر و مانگ بەیەکەوە دیاردەیەکی هاوبەشییان لێ پێکهاتووە، کە بە شەوبەڕۆژ ناونراوە، شەوبەڕۆژ وەك زاراوەیەك واتای شەو و ڕۆژ بەیەکەوە دەگەیەنێت، و دەرکەوتنی ئەو زاراوایە ستاتیکایەکی تری زمانی شیعرییە، نیوەدێری دواتریش هاوکێشەیەکی ئاسایی بیرکارییە و دوو لەگەڵ دوو دەبێتە چوار، بەڵام لەهەموو ئەوانە گرنگتر ئەو

هاوکێشەیەیە کە لەدوا نیوەدێردا دەبینرێت، شاعیر وای پیشاندەدات کەوا شاعیر لەگەڵ یار کۆبکرێتەوە، ئەوا هەرچەندە یەك لەگەڵ یەکی تردا کۆدەکرێتەوە، بەڵام بەپێچەوانەی هەموو یاسا بیرکارییەکان ئەم کۆکردنەوەیەی یەك و یەك لە ( ئەو + یار) دا نابێت بە دوو، بەڵکو لەئەنجامی خۆشەویستیدا ئەوەندە ئاوێتەی یەکتر دەبن، لەبری ئەوەی دوو کەس دەربکەن ئەوا هەردووکیان دەبن بەیەك کەس، ئەو لێکدانەوەیە لەزمانی ڕۆژانەدا دیاردەیەکی نائاساییە، بەڵام بۆ بەدەستهێنانی ستاتیکایەك بە زمانی شیعری لێهاتوویی شاعیر دەردەخات.

هەروەها لەدەقێکی تردا و بەناونیشانی (هەناسە شیعر)، چەند کۆپلەیەکی کورت لەژێر ئەو ناونیشانەدا کۆکراونەتەوە، هەروەکو دەڵێت:

**١- باڵەکانی پەپوولە**
**بەشیلەی گوڵ تاتۆ کراون**
**بۆیە هێند ناسك و شیرینن.**
**٢- خۆرەتاو عیشقی سێبەرە**
**لەهەرکوێ بێ لەتەنیشتی ئامادەیە و**
**ڕوومەتی یەکتر ماچ دەکەن.**
**٣- هەنگ نابەڵەدە لە سێکس،**
**ژیانی هەنگوینی بەفلسێك.** ل. ١٦٨

ئەم دەقە شیعرە لەبنەڕەتدا بریتییە لە شانزدە کۆپلەی لەم شێوەیە و تەنها سێ کۆپلەی لێ خراوەتە بەرچاو، هەریەك لەم کۆپلانە بەتەنها وێنەیەك پێکدەهێنن، کە لەڕووی واتاییەوە هیچ کەموکورتییەکی تێدا نابینرێت، بەڵام لەبەرئەوەی هەریەك لە کۆپلەکان بەتەنها واتایەکی تەواو دەدات بەدەستەوە، بۆیە شاعیر هەریەکەیان بەهەناسەیەك ناودەبات ، دیارە لەهەڵبژاردنی ئەم ناونیشانەشدا سەرکەوتوو بووە، چونکە ناونیشانێکی گونجاوە بۆ ئەو کۆپلە شیعرە کورتانەی کەوا لەشێوەی هەناسە وەرگرتنێك دەردەکەون، و ناونیشانی لەم شێوەیەش تازە و دەگمەنە[41]، بۆیە ئەمەش بەستاتیکایەکی تری زمانی شیعری ئەژمار دەکرێت، و نموونەی تریش لەم شێوەیە لە دیوانەکەدا بەدی دەکرێت[42].

٤. **ئەو ناونیشانانەی کە تەنها بریتین لە یەك وشە** : لە دیوانی مۆسیقای نامۆییدا چەند دەقێکی شیعری بەرچاو دەکەون، کەوا ناونیشانەکانیان تەنها لەیەك وشە پێکهاتووە، هەمان وشەش لە سەرەتای دێری یەکەمی ئەو دەقە شیعرییە دووبارە دەبێتەوە، ئەمەش ئاواز و مۆسیقاییەکی جوان و دەگمەن بەدەقەکە دەبەخشێت، بۆ نموونە :

**( ئەم...)**

**ئەم دار خۆخە**

**کچە ڕەشئەسمەرێکی هەرزەکاری جوانە،**

**ئەوەتانێ هەزارەها مەمکی تورت و ناسکی**

**لەژێر ستیانی گەڵاجاڕ حەشارداوە.**

**ئەم دار هەنارە چەند جوانە،**

**ئەوەتانێ هەزار لێوی سووری گرتووە.**

**ئەم دار سێوە چەند عاشق و میهرەبانە**

**ئەوەتانێ سەدان دڵی سوور و عاشق**

**کردوویانە بەهێلانە.** ل. ٢١

ناونیشانی ئەم دەقە شیعرە وەك دەبینرێت، تەنها بریتییە لە یەك ئامرازی ئاماژە بۆ نزیك ئەویش بریتییە لە ( ئەم)، بەڵام بەدوای ئامرازەکە چەند خاڵێکی بەدوای یەکدا هاتوو ڕیزکراون، ئەویش وەك نیشانەیەك بۆ ئەوەی کەوا ڕستەیەکە و تەواو دەکرێت، لە سەرەتای دەقە شیعرەکەشدا، ئەم ئامرازە دووبارە دەبێتەوە و ڕستەیەکی تەواو پێکدەهێنێت، کەوا بریتییە لە وەسفکردنی درەختی خۆخ، کەوا بەکچە ئەسمەرێك دەچوێنرێت، بەهەمان شێوە لەنیوە دێرەکانی پێنجەم و حەوتەم و دواتریش هەمان ئامرازی ئاماژەکردن کەوتۆتە پێش وەسفکردنی درەختەکانی دارهەنار و دارسێو و هەریەکەیان وێنەیەکی شیعری جوانی پێکهێناوە، کەوا هەموویان هەر بەئامرازی (ئەم ) دەستپێدەکەن و بەهەمان شێوەی ناونیشانەکە دووبارە دەبێتەوە، ئەم نموونەیە تاکە نموونەی ئەم جۆرە ناونیشانە نییە لە دیوانەکەدا، بەڵکو چەند نموونەیەکی هاوشێوە دەبینرێت[٤٣].

**٥. ئەو ناونیشانانەی ڕەهەندێکی فەلسەفییان هەیە:**

فەلسەفە وەك زاراوەیەك بریتییە لە پرسیارکردن لەبارەی ژیانەوە، ((فەلسەفە وەك چالاکییەکی عەقڵی بریتییە لە تێڕامان و بیرکردنەوە لە کۆی ئەو شتانەی کە ئێمە ڕووبەڕوویان دەبینەوە، یان لە تەکیاندا دەرگیرین، بە لەبەرچاوگرتنی یاخود چاو بڕین لە زانینی دوا هۆکانیان))[٤٤]، شاعیر لەم بەرهەمەیدا چەند دەقێکی دیاریکراوی هەیە، کە دەکەوێتە قاڵبی فەلسەفەوە، و ناونیشانی دەقیش هەر پەیوەستە بەم بوارە، بۆ نموونە:

**( دووالیزم )**

**ئاسمان پێدەشتێکی بەرینە،**
**خۆرەتاو کانیاوێکی ڕوونە،**
**هەورەکان چیا و گردۆڵکەن**
**ئەستێرەکانیش کەو و سوێسکەن.**
**زەوی ئاسمانێکی بەرینە،**
**چیاکان هەور و هێڵن،**
**کانییەکان مانگە شەون،**
**پەلەوەر و ئاژەڵەکان**
**ئەستێرەی درەوشاوەی تێکەڵن.**

**

**ئەمشەو پرسەی ئەپۆلۆ بوو لە ماڵەکەم،**
**چی شیعر بوو وەکو فوارە دەڕژا**
**بۆ مەرگی ئەو.** ل. ٣٠

هەروەك گوترا، ناونیشانی گرنگی خۆی هەیە، و(( ڕەخنەی ئەدەبیی هاوچەرخ، لەژێر کاریگەریی لێکۆڵینەوەکانی زمانناسیی دەق و سیمبۆلۆژیادا گرنگی بە بونیاد و پێکهاتەی خودی ناوونیشان و چۆنێتی پێوەندیی بەدەقەکەیەوە داوە و ناوونیشانی وەکو ڕەگەزێکی سەربەخۆی پێکهاتەی بونیادی هونەری دەق لەقەڵەم داوە))[٤٥]، شاعیر هەوڵی داوە ئەم گرنگییە بەناونیشان ببەخشێت، بۆیە ناونیشانێك هەڵدەبژێرێت کە لەگەڵ دەقەکەیدا زیاتر سەرنجی

خوێنەر بۆ خۆی کێش بکات، ناونیشانی ئەو دەقە شیعرە لە زاراوەیەکی فەلسەفییەوە وەرگیراوە، ((دووالیزم ، الثنائیة، Dualism))[٤٦]، بەواتای دوو جەمسەر، دووانە، ئەم دەقە شیعرەش لە دوو کۆپلەی جیا پێکهاتووە، هەردوو کۆپلەکە تەواوکەری یەکترن، بۆیە شاعیر زاراوەیەکی فەلسەفیی گونجاوی بۆ دەقە شیعرەکە هەڵبژاردووە، سەرەڕای ئەوەش ئەپۆلۆ لە بیر و هزری یۆنانیی کۆندا خواوەندی شیعر بووە، ئەو خواوەندەی ئیلهام بەشاعیر دەبەخشێت، بەڵام لەم دەقەدا ئەپۆلۆ لەبری ئەوەی ئیلهام ببەخشێت خۆی مردووە، ئەوەش لایەنێکی تری دووالیزمییە کە زمانی شیعرەکەی جوانتر کردووە.

لە پێناسەی فەلسەفەدا دەگوترێت، فەلسەفە بریتییە لە(( تێڕامان لە واقیعی بنەڕەتی شتەکان، شتەکان بۆ هەن، لەکوێوە دێن؟ بۆ؟ ژیان مانای چی و بۆ و چۆن؟ فەلسەفە مەعریفەیەکی باڵایە، کە لەڕێگەوەی ئێمەی مرۆڤ موجازەفەی ئەوە دەکەین بەقووڵایی شتەکاندا، ڕەگ و ڕیشەی شتەکاندا شۆڕبینەوە و لەڕێگای مەشق پێکردنی عەقڵەوە، بۆ زانینی سروشتی واقیع))[٤٧]، شاعیر لە دەقێکی شیعرییدا هەمان پرسیار سەبارەت بە بوون دەکات:

**( پرسیار ؟)**

**ئەی خوایە ئەو پەرداخە ئاوەی دەیخۆینەوە،**

**دەبێ چەند جار گەشتی کردبێ ؟**

**چەند ماسی و بۆق خواردبێتیانەوە ؟**

**چەند جار بووبێتە میزی حوشتر ؟**

**چەند جار بووە بە تەرزە و کڕێوە و بەفر و باران ؟**

**چەند ڕووبار و دەریاچەی زل زلی بینیوە ؟** ل. ٤٧

دیارە ئەو لێکدانەوانەی لە دڵ و دەروونی شاعیردا هەن و ئارەزووی وەڵام وەرگرتنیان دەکات پرسیارگەلێکی فەلسەفین، بۆیە دەستنیشانکردنی (پرسیار؟) وەك ناونیشان بۆ دەقەکە ستاتیکایەکی تری زمانی شیعرییە کەوا شاعیر دەیخاتە بەرچاوی ئێمەی خوێنەر، هەروەها لە دەقێکی شیعری تریشدا هەمان بابەتی فەلسەفی بەرچاو دەکەوێت، بەڵام لە ڕووی ناونیشانەوە ناکەوێتە ژێر ئەم تەوەرەی باسەکەمان بۆیە بەپێویستمان نەزانی بیخەینە بەرچاو[٤٨].

**دووەم- مۆسیقای ناوەوە:**

یەکێك لە بنەما سەرەکییەکانی دروستبوونی شیعر، بریتییە لە بوونی ئەو کێش و مۆسیقایەی لە شیعردا هەیە و لە پەخشاندا نییە، ((پێوەندیی نێوان ئاواز و هۆنراوە، یەکێك بووە لە تێڕوانینە ڕەخنەییە دێرینەکان و کەم و زۆر لە بەرهەمی ڕەخنەگراندا ڕەنگی داوەتەوە. دیارترین هۆی ئەم گرنگی پێدانەش لەوەدا بووە کە هەردووکیان سەربەو چەشنە هونەرەن کە بەهونەرە دەنگییەکان ناودەبرێن، تەنانەت لەگەڵ پێناسەکردنی ئاوازدا، دەستنیشانی چەمکە وێژەییەکەش دەکرێت و بەو نەغمانەی دادەنێن کە ئەدیبان و بەتایبەتی شاعیران لە هۆنراوەکانیاندا پێکیدەهێنن و دەیکەنە ڕەگەزێکی سەرەکیی بنیاتی بەرهەمەکانیان و شاکاری هونەری پێ ئەنجام دەدەن))[٤٩]، ئاواز و مۆسیقای دەرەوەی شیعر زیاتر لەگەڵ شیعری کلاسیکی کوردی و ئەو شیعرانەی لەسەر کێشی عەرووزی نووسراون دەردەکەون، بەڵام لەشیعری هاوچەرخدا زیاتر مۆسیقای ناوەوە ڕۆڵی سەرەکی دەبینێت، ((زاراوەی مۆسیقای ناوەوە زاراوەیەکی نوێیە لە بواری ڕەخنە و لێکۆڵینەوە شێوازییەکاندا و لە کتێب و سەرچاوە کۆنەکان بەرچاو ناکەوێت، لەگەڵ ئەوەی زۆر لەبارەشیەوە نووسراوە، تا ئێستا نەتوانراوە، وەکو چەمکێکی دیاریکراو دەستنیشان بکرێ، وەکو پێناسەش مۆسیقایەکی شاراوە و نادیارە، لەئەنجامی هەڵبژاردنی ئەو وشانە پەیدا دەبێت، کە شاعیر بەکاریان دێنێت لە داڕشتنی دەقەکە، و ئەو ڕێکەوتن و گونجانەی لەنێوان پیت و وشە هەڵبژێردراوەکاندا هەیە، کەواتە مۆسیقای ناوەوە لەئەنجامی چنینی دەقی ئەدەبی هەڵدەقوڵێ، چۆن شاعیر ئەو وشە و ڕستانە لەتەك یەك ڕیز دەکات و بەکاریان دێنێت، ئەمەش لەنووسەرێکەوە بۆ نووسەرێکی تر دەگۆڕێت و هەرکەسەو بەپێی شێوازی خۆی مامەڵە لەگەڵ ئەو کەرەستانە دەکات...))[٥٠]، لەم بەرهەمە شیعرەدا چەند لایەنێکی ستاتیکی لە مۆسیقای ناوەوە بەدی دەکەین، بەڵام ئەم مۆسیقایە بەهۆی چەند هونەرێکەوە دروستدەبێت، کە بریتین لە (کەرتکردن، ڕەگەزدۆزی، دووبارەکردنەوە) بۆیە بەپێی ئەم هونەرانە بابەتەکەمان شیدەکەینەوە:

١. **كەرتكردن:** كەرتكردن هونەرێكی ڕەوانبێژییە، و بریتییە لە پارچەكردنی وشەكان بۆ چەند پیتێك و دەركەوتنی پیتەكان بەدوای یەكتریدا، شاعیر لە نموونەی ئەم هونەرەدا لەدەقێكدا بەناونیشانی ( وەرە گیانە... ) دا دەڵێ:

**وەرە بۆ لام،**
**بۆ نێو دڵم،**
**بۆ**
**نێو**
**دڵم.**
**ب**
**ۆ**
**ن**
**ێ**
**و**
**د**
**ڵ**

م.    ل. ٢٦، ٢٧

وەك دیارە لەم كۆپلەیەدا، شاعیر لە سەرەتادا دەستەواژەی (بۆ نێو دڵم) بەسەریەكەوە پیشاندەدات، دواتر هەمان دەستەواژە بەشێوەی كەرتكراوەیی ڕیز دەكات، كە لە خوێندنەوەدا مۆسیقایەكی تایبەتی بەشیعرەكە بەخشیوە، و ئەو مۆسیقایە لایەنێكی تری ستاتیكای زمانی شیعری پێكدەهێنێت.

٢.**ڕەگەزدۆزی:** ئەمەشیان هونەرێكی ترە كە ڕۆڵێكی گرنگ دەبینێت بۆ دروستبوونی مۆسیقای ناوەوەی شیعر، و بەشێوەیەكی سەرەكی بەسەر دوو جۆردا دابەش دەكرێت:-

أ. **ڕەگەزدۆزیی تەواو:** جۆرێكی ڕەگەزدۆزییە، (( بریتییە لە بوونی دوو وشە، لەشێوەدا وەك یەك و لە واتادا جیاوازبن. ئەمەش جوانییەكی گەورە و چێژێكی خۆش بەخوێنەر و پێش ئەو بەشاعیریش دەبەخشێت، چونكە هەستی كردووە فەرهەنگی وشەكانی دەوڵەمەندە...))[٥١]، هەروەكو لە دەقە شیعری (شیعرێكی بونیادگەری) دا دەبینرێت:

**قورگی وشك بوو لەتێنان،**
**سكی دەكوشێ بۆ لەتێ نان ،**
**فەقیر نازانێ لە تێ نان ؟!**
**ئاخ لەتێنان، ئاخ لەتێ نان، ئاخ لە ت ێ ن ا ن.** ل. ١٠٣

لەم كۆپلەیەدا زیاتر لە جارێك زاراوەی (لەتێنان) دووبارە بۆتەوە. ئەم سێ وشەیە هەموویان هاوشێوەن لە پێكهاتەدا، هەرچەندە شێوازی نووسینەكەشیان جیایە، بەڵام هەریەكەیان واتایەكی جیاواز لەوەی تر دەبەخشێت، لەڕستەی (قورگی وشك بوو لەتێنان)دا، (لەتێنان) بەشێوەزاری ناوچەی هەولێر و كۆیە، بە واتای (لە تێنووان) دێت، هەروەكو لەواتای ڕستەكە بەسەریەكەوە زیاتر ڕوون دەبێتەوە، واتە شاعیر تێنووی ئاوە و بەهۆیەوە قورگی وشك بووە، لە ڕستەی دووەمدا (سكی دەكوشێ بۆ لەتێ نان)، (لەتێ + نان) بەواتای یەك پارچە نان دێت، واتەی ڕستەكە ڕوونە، لە ڕستەی سێیەمدا (فەقیر نازانێ لەتێنان)، هەمان وشەی لێكدراوی پێشوو، بەڵام بەواتایەكی جیاوازتر لە دووانەكەی تر دەبینرێت، لێرەدا (لەتێ نان) بەواتای كردەی سێكسی دێت، واتە ئەوانەی هەژارن تەنانەت نازانن چێژ لە سێكسیش ببینن، بەم شێوەیە ئەو وشە لێكدراوە لە هەر جارێكدا واتایەكی جیاواز دەبەخشێت، بەڵام هەموویان هەمان داڕشتنیان هەیە، ئەوەش ڕەگەزدۆزیی تەواو پێكدەهێنێت، كەوا بەهۆیەوە مۆسیقای ناوەوەی دەقەكەی جوانتر كردووە، ئەوەش لێهاتوویی شاعیر دەردەخات لە بەدەستهێنانی لایەنێكی تری ئێستاتییكی زمانی شیعری.

ب. **ڕەگەزدۆزیی ناتەواو:** ئەمەشیان جۆرێكی ڕەگەزدۆزییە، و(( بریتییە لە بوونی دوو وشە، كە یەك، یان زیاتر لە مەرجێكی ڕەگەزدۆزیی تەواو لە دەست دەدات، واتە بەشێكی گرنگی ڕەگەزدۆزییە، لە دوو وشە پێكدێت، كە تا ڕادەیەك لێكچوون لە نێوانیاندا هەیە، بەڵام لێكچوونەكە تەواو نییە، لە واتاشدا هەردوو وشەكان لە یەكتری جیاوازن و هەریەكەو واتای سەربەخۆی خۆی هەیە))[٥٢]، هەروەكو لە دەقە شیعری ( وەرزەكان) دا دەبینرێت:

**فرۆژگای کەمالیات وەرزی بەهارە**
**پڕ لە گوڵی ڕەنگاوڕەنگی شووشە عەترە،**
**پڕ لە سوراووی خونچەی گوڵ،**
**پڕ لە ئاوێنەی جۆگەلەی ئاو**
**پڕ لە کوللەی نینۆك بڕ،**
**پڕ لە شانەی مارەزیوە و**
**تۆقەی پەپوولە،**
**پڕ لە هەوری گەواڵەی**
**ڕێژنە بارانی نیگای کچی شۆخ،**
**پڕە لە خۆرەتاوی جوانی، پڕە لە ڕەنگی تێر و تۆخ،** ل. ١١٦

لەدوا دێری ئەم نموونە شیعرییەدا، هەردوو وشەی (شۆخ، تۆخ) بەرچاو دەکەون، ئەم دوو وشەیە هەریەکەیان لە سێ دەنگ پێکهاتوون، لەم سێ دەنگەدا دووانیان لەهەردوو وشەدا دووبارە دەبنەوە، تەنها دەنگی یەکەم لە وشەی یەکەمدا بریتییە لە (ت) و لە وشەی دووەمدا بووە بە( ش)، ئەم جیاوازییە بچووکە دوو وشەکە دەکات بە ڕەگەزدۆزیی ناتەواو، و بەهۆیەوە مۆسیقایەکی جوانتر و ستاتیکایەکی تر بەزمانی شیعریی ئەم دەقەوە دەردەکەوێت.

٣. **دووبارەکردنەوە:** هونەرێکی تر کە دەبێتە هۆی هاتنەکایەی مۆسیقای ناوەوە و هۆکارێکە بۆ دروستبوونی ستاتیکای زمانی شیعری، بریتییە لە دووبارەکردنەوە، (( دووبارەکردنەوە شێوازێکی ئەدەبییە، لەناو شیعردا بوونی زۆرە، کاردانەوەیەکی ڕاستەوخۆ و زۆر بەهێزی هەیە لەسەر مۆسیقای ناوەوەی شیعر، چونکە شاعیر لە ئەنجامی ئەم دووبارەکردنەوانە جۆرە ئاواز و ئاهەنگێکی تایبەتی بۆ شیعرەکەی دەستەبەر دەکات. زۆربەی ئەو بنەمایانەی بەشداری لەدروستبوونی مۆسیقای دەرەوە و ناوەوەی شیعردا دەکەن بەشێوەیەکی گشتی پشت بە بنەمای دووبارە بوونەوە دەبەستن...))[٥٣]، ئەم هونەرە لایەنێکی تر لە ستاتیکای زمانی شیعری ئەو دەقانە پێکدەهێنێت، چونکە(( دووبارەکردنەوە تەکنیکێکی هونەری بەرزە، هێز و توانا بەشیعر دەدات و ڕێنموونی دەکات بۆ دامەزراندنی وزەیەکی دەنگی هێمادار کە لەخزمەتی شیعرەکەیدا دابێت. بۆیە

پێویستە لەسەر شاعیر کە زۆر بە لێهاتوویی مامەڵە لەگەڵ دووبارەکردنەوەی دەنگ و وشە و گرێ و دەستەواژەکاندا بکات و بە شێوەیەکی سەرکەوتووانەی وا بەکاریان بهێنێت کە ببێتە سەرچاوەی هەڵقوڵانی تام و چێژێکی بەهێزو ورووژێنەر بۆ خوێنەر و بیخاتە ناو چوارچێوەی هێزێکی موگناتیسی و سەرنجی بۆلای خۆی ڕابکێشێ))[٥٤]، لە دیوانی مۆسیقای نامۆییدا زۆرجار شاعیر پەنای بردۆتە بەر بەکارهێنانی ئەم هونەرە، بۆ نموونە لە دووبارەکردنەوەی ڕستەدا دەشێت بگەڕێینەوە بۆ نموونەیەکی شیعری بەناونیشانی (تا چاو برکا خۆشم دەوێی) وەك لە سەرەتای ئەم لێکۆڵینەوەیەدا دەردەکەوێت، لەوێدا دەبینرێت کە ئەم ڕستەیە لە ناونیشان و نیوەدێڕی یەکەمدا دووبارە کراوەتەوە، و دووبارەکردنەوەکە جوانییەکی بەمۆسیقای ناوەوەی دەقەکە بەخشیوە، هەروەها بۆ نموونەی دووبارەکردنەوەی دەستەواژە دەڕوانینە دەقێکی شیعری بەناونیشانی (من مەسیحیم) :

**من مەسیحیم تا ئەو کاتەی**<br>
**صەلیبەکەی عیسای مەسیح**<br>
**لەسەر قوبەی تاقە کەنیسەیەکی**<br>
**جیهانا مابێ.**<br>
**من مەسیحیم تا ئەو کاتەی**<br>
**یەك پەیڤی شیرین و جوان**<br>
**یەك هەڵوێستی بەزەیی و لێبووردەیی**<br>
**لەجیهانا مابێ.** ل. ١٧

وەك دیارە دەستەواژەی (من مەسیحیم) جگە لەوەی ناونیشانی دەق پێکدەهێنێت، لە سەرەتای هەموو کۆپلە شیعرەکاندا دووبارە دەبێتەوە، ئەوە نموونەیەکی ڕوونە بۆ دووبارەکردنەوەی دەستەواژە، کەوا هۆکارێکە بۆ دروستبوونی مۆسیقای ناوەوەی دەق و بەخشینی ستاتیکایەکی جیاواز بەزمانی شیعریی دەقەکە. بۆ دووبارە کردنەوەی وشەش دەشێت ئەم نموونەیەی خوارەوە نموونەیەکی گونجاو بێت:

**بەیانییان خۆر خونچە گوڵێکی زەردە**
**وردە وردە دەکرێتەوە و دەگەشێتەوە و**
**بۆن و بەرامە و جوانی خۆی دەپرژێنێ،**
**ئێواران پەڕەپەڕە**
**بەسەر شان و ملی دەشت و کێوەکاندا هەڵدەوەرێ.** ل. ١٧٥

لــە نیــوەدێڕی دووەمــدا وشــەی (وردە) دوو جــار بەدوایەکــدا دووبــارە کراوەتەوە، هەروەها لە نیـوەدێرەی چـوارەمدا دیسـان دووبارەکردنـەوەی وشـەی (پەڕە) دەبینرێت، ئەم دووبارە کردنەوەیەی لەهەردوو شوێندا دەبینرێت، جۆرێـك مۆسـیقای تایبـەتی بـەدێڕە شـیعرەکان بەخشـیوە، کـە ئـەمیش بنەمایـەکی تـری ستاتیکای زمانی شیعری بنیاتناوە[٥٥].

## بەشی سێیەم
## ستاتیکای ناوەرۆکی شیعر

**یەکەم– وێنەی شیعری:** پێکهاتەیەکی تـری شـیعر کـەوا بەرێژەیـەکی زۆر پەیوەستە بە توانا و لێهاتوویی شاعیر لە زماندا بریتییە لە وێنەی شیعری، چونکە شیعر بەبێ وێنە دروست نابێـت. ئاشـکرایە ((هـەموومان ڕۆژانـە چـەندین دیـاردە و دیمــەنی جــوان و ســەرنجڕاکێش هەســت پێدەکــەین و وێنــەی ئەمانــە لــە بــیر و هۆشماندا جێگیر دەبێت، بـەڵام شـاعیر هەسـتێکی ناسـکتری هەیـە. بۆیـە توانـای ئــەوەی هەیــە ســوود لــەم دیمەنانــە وەربگرێــت و لەشــێوەی وێنــەی شــیعریدا دەریانببڕێــت. ئەمــە بــووە هــۆی ئــەوەی گرنگــی و بایــەخی وێنــەی شــیعری لەلێکۆڵینەوە ڕەخنـەیی و ئەدەبییەکانـدا ڕۆژبـەڕۆژ بـەرەو هەڵکشـان بچێت))[٥٦]، بەدەربڕینێکی تر لەبارەی وێنەی شـیعرییەوە دەگوترێـت: ((ڕۆژانـە مێشـکی مـرۆڤ چەندین وێنەی تێدا گەڵاڵە دەبێ و زانیاری لەبارەیانـەوە وەردەگـرێ و جاروبارێـك لەکاتی پێویستیدا ئەو جۆرە وێنە هەڵگیراوانە لە هەست و نەستی مرۆڤدا بریسـکە دەداتەوە و مرۆڤی هۆنیار یان نووسەر بە شێوەیەکی جوان و کاریگەر ڕەمزی ئـەو وێنانــە جــارێکی تــر دەخــوڵقێنێ و بەرجەســتەی دەکاتــەوە))[٥٧]. لــەم دیوانــە شــیعرییەدا چــەند نموونەیــەکی وێنــەی شــیعری جــوان و ســەرنجڕاکێش بەرچــاو

دەکەون، کە دەشێت نموونە لەچەند جۆرێکی وێنەی شیعری لەڕووی بنیاتەوە تێدا بدۆزینەوە، هەموو ئەو وێنانەش لەسەر بنەمای ستاتیکایەکی بەهێزی زمانی شیعر بەدیهاتوون:

١. **وێنەی درامی :** لەم جۆرەیاندا شاعیر وێنەیەکی شیعری لەسەر بنەمای دراما پێشکەش بەخوێنەر دەکات، واتە ((وێنەی درامی دەتوانرێ بەوە پێناسە بکرێت کە شانۆگەرییەکی شیعری یا پەخشانییە کە لە ناویا دیالۆگ مەزەندەی هەندێ جۆری جیاوازی ململانێی ئادەمیزادمان بۆ دەکەن. شیعری شانۆیی ڕووناکی دەخاتە سەر گەلێ جۆر لە دژەکان کە لە گەردووندا بڵاون سەرەڕای ئەوەش هەڵدەسێ بەوێنەکێشانی کردەکان وێنە کێشانێکی زیندووی ڕاستەوخۆ، بەڵام کەسەکانمان پێشکەش ناکات تەنیا لەڕێگەی ناڕاستەوخۆوە نەبێت لەدووتوێی جووڵە و کرداردا))[٥٨]، شاعیر دەیەوێت وێنەیەك دەرببڕێت، بەڵام ئەو وێنەیە پشت دەبەستێت بەو ڕەگەزانەی کە دراما پێکدەهێنن، گرنگترین ڕەگەزەکانی دراماش بریتین لە دیالۆگ و مەنەلۆگی ناوەوە، دیالۆگ گفتوگۆی نێوان دوو کەسە و مەنەلۆگی ناوەوەش ئەو ئاخاوتنەیە کە مرۆڤ لەگەڵ خودی خۆی ئەنجامی دەدات، هەر کاتێك بنیاتی شیعرەکە ئەم ڕەگەزانەی تێدا دەربکەوێت ئەو کاتە وێنە شیعرییەکە بە وێنەی درامی ناودەنرێت، لەم دیوانە شیعرەشدا، چەند نموونەیەکی ئەو جۆرەی وێنەی شیعری بەدی دەکرێت، بۆ نموونە لەدەقێکدا کە ناونیشانەکەی هەر بە ( شانۆگەری ) دەرکەوتووە دەڵێت:

**کەنارییەکی هونەرمەند لەسەر پژاڵی درەختێکەوە**
**وتی : بێزەوقییە کارمامزەکەی جیرانمان**
**مێردی بە پیرە ئەسپێك کرد !**
**_ پیرەگایەك سووی بۆوە و وتی :**
**شانسی هەیە !**
**_ پیرە مەڕێك وتی نا !**
**زستانەکەی تووشە و**
**پیرە ئەسپیش**
**کادینێکی گەورەی هەیە.**

لەم کۆپلەیەدا کە بەشێکی دەقە شیعرەکەیە و چەند بەشێکی تریشی ماوە، سێ کارەکتەر دەردەکەون کەوا دیالۆگ لەنێوانیاندا دەردەکەوێت، ئەو کارەکتەرانەش بریتین لە (کەناری، پیرە گا، پیرە مەڕ)، ئەم دیالۆگە ڕەگەزێکی گرنگی بنیاتی دراما و شانۆیە و بەهۆی بەرجەستەکردنی ئەم ڕەگەزە لەدەقێکی شیعریدا جۆرێك وێنەی شیعری بەدیهاتووە، کە بە وێنەی درامی ناودەبرێت، بەدەستهێنانی ئەو جۆرە وێنەیەش بەخاڵێکی تری ستاتیکی زمانی شیعری دادەنرێت.

٢. **وێنەی چیرۆکی** : چیرۆك بەشێکی تری ئەدەب پێکدەهێنێت، بەڵام زۆرجار هونەرکارییەکی تر لە زمانی شیعریدا دەکرێت و شاعیر ڕەگەزەکانی چیرۆك دەهێنێتە ناو دەقی شیعرییەوە، ئەو کاتە وێنەیەك دروستدەبێت کە بریتییە لە وێنەی چیرۆکی، (( زۆرجار شاعیر ڕووداوێك دەکاتە تەوەری سەرەکیی شیعرەکەی وێنە گشتییەکەی لەسەر ئەو بنچینەیە بنیات دەنێ بەهۆی گێڕانەوەی بەشەکانی ڕووداوەکە و دیالۆگەوە و بە وەسفکردنی دیمەنەکانی وەسفکردنێکی زۆر وردی شوێنی ڕووداو و بارودۆخەکەمان بۆ دەکات بە بەکارهێنانی خەیاڵی بەرزەفڕ لە دووتوێی لێکچواندن و خواستن و بەکەسکردن و بەرجەستەکردن ))(٥٩)، ئەو جۆرە وێنەیەش لە مۆسیقای نامۆییدا بەرچاو دەکەوێت، هەروەکو لە دەقێکی شیعرییدا بەناونیشانی (چیرۆکە شیعر) دەڵێت:

**دەنکە گەنمێك بەدیل گیرا لەلایەن کۆترێکەوە،**
**گەلێ ترسا و باش دەیزانی کە**
**ئەمشەو ڕوحی دەردەچێ،**
**لە بەختی ئەو کە ئێوارە کۆتر گەڕایەوە هێلانە،**
**ڕێوییەك پەلاماری دا و پارچە پارچەی کرد**
**دەنکە گەنم لە سیقلدانی کۆترەکە کەوتە خوارێ،**
**بۆدوا ڕۆژێ مێرووولەیەك دۆزییەوە و هەڵیگرت و**
**ویستی بۆ ناو شارەکەی ببا،**
**کاتێ بەسەر درەختێ کەوت دەنکە گەنم کەوتە خوارێ و**
**بەنێو خۆڵدا خۆی شاردەوە،**
**هەر کەباران داباری سەری دەرهێنا بۆ هەتاو و وردە وردە گەشەی کرد.** ل. ١٥٧

له خوێندنەوەی ئـەم دەقـە شـیعرییەدا هەسـت بـەبوونی ڕووداوێك دەكـەین كەوا لەشێوەی چیرۆكێكدا، بەڵام لەقاڵبی دەقێكی شـیعریدا خراوەتـە ڕوو، هـەموو ئـەو ڕووداو و بەسـەرهاتانەی بەسـەر دەنكـە گـەنمێك و كـۆتر و ڕێویـدا هـاتوون، هەموویان له چیرۆكدا بەرچاو دەكەون، بەڵام بەهۆی بەكارهێنانی ستاتیكای زمانی شیعری بووه بەهۆی بەرجەستەكردنی ئەم جۆره وێنەیه له دەقێكـی شـیعریدا كـه بەوێنەی چیرۆكه شیعر ناودەبرێت[٦٠].

٣. **وێنەی كاریكاتێری:** ئەم جۆره وێنەیەش جۆرێكی تازه و هاوچەرخە، لەم جۆرەیاندا (( به ڕێگەیەكی ساده تیشك دەخاتـه سـەر كێشـه و خواروخێچییەكانی كۆمـەڵگا بـەبێ ئـەوەی ڕق و كینـه لـەدڵی خـەڵك بچـێنێت زۆر بەنـەرمی خـۆی دەخزێنێتـە دڵـی بینەرانـەوه و مەبەسـتەكەی خـۆی دەپێكێـت زەردەخەنەیـەك بەبینـەر دەدات و كێشەكەشـی بـۆ ڕوون دەكاتـەوه ))[٦١]، لـه دیـوانی مۆسـیقای نامۆییدا نموونەی لەم جۆره دەبینرێت، بۆ نموونه:

**(كاریكاتێر)** :
**له كەناری چەمێكەوه**
**ڕوانینم لكا بەقووڵایی ئاوەكەوه،**
**كیسەڵێكم بینی دەخشی ،**
**بەنێو گژو گیای بنەوه،**
**وامزانی پیرەژنێكه**
**له دەشت و دۆڵ**
**وێڵه بەدوای كاردی و كەنگرەوه.** ل. ٥٥

لەم كۆپلەیەدا شاعیر وێنەی كیسەڵێك لەكاتی خشیندا دەردەكەوێت، بـەڵام شـاعیر ئـەم كیسـەڵه لەشـێوەی پیرێژنێكـدا دەبینێـت كـەوا بـەدوای گـژوگیادا دەگـەڕێت، ئـەم وێنەكردنـە وێنەیـەكی كاریكاتێرییـە و لایـەنێكی تـری سـتاتیكای زمانــی شـیعری پێكـدەهێنێت، و نموونــەی تــریش لــەم جـۆره لــه دیوانەكـەدا دەبینرێت[٦٢].

٤. **وێنەی شێوەكاری** : بـۆ ئـەوەی زمـانی شـیعری زیـاتر سـتاتیكای پێـوه دیاربێت، هەندێك جار شاعیر وێنەیەكی شیعری لەشـێوەی تابلۆیـەكی شـێوەكاریدا

بنیاتدەنێت، (( شاعیر وا ناسراوە وەك منداڵ هەموو ڕەنگ و شێوەکانی خۆش دەوێت و ئارەزوو دەکات یارییان پێبکات ))(٦٣)، لەنموونەی ئەم جۆرە وێنەیەدا دەقێکی شیعری بەناونیشانی ( چەپکێکی شیعری شێوەکاری ) لەمۆسیقای نامۆییدا دەبینین:

**ئەم دار قەیسییە چەند عاشقە،**
**ئەوەتانێ پۆلێ بولبولی**
**زەرد و سوور و نارنجی**
**بەلق و پۆپی خۆیان هەڵواسیوە.** ل. ١٠٦

وەك دەبینین لەم کۆپلەیەدا کەوا بەشێکە لە دەقە شیعرەکە، شاعیر دارێکی قەیسی بەعاشق ناودەبات، ئەو لێکچواندنە وێنەی شیعری دروستکردووە، بەڵام جیا لەمەش لەدێرەکانی دواتردا، ئاماژە بەپۆلێ پەپوولەی ڕەنگاوڕەنگ دەکات، ئەمانە ڕەنگیان زەرد و سوور و پرتەقاڵییە، دەرکەوتنی ئەو کۆمەڵە باڵندەیە بەو ڕەنگە جیاوازانە، جۆرێك وێنەی شیعری دەخوڵقێنێت، کە بەشیعری شێوەکاری دەناسرێت، و ئەم وێنەکێشانەش ستاتیکایەکی تری زمانی شیعرییە کە لەم دیوانەدا دەبینرێت.

**دووەم_ بەکارهێنانی زاراوەی تایبەت بەتەکنەلۆژیا:** ئاشکرایە ئەمڕۆ تەکنەلۆژیا هەموو ژیانی مرۆڤی ئەو سەردەمەی داگیرکردووە، کەم کردە و چالاکی ڕۆژانەمان هەیە پەیوەست نەبێت بە بەرهەمەکانی تەکنەلۆژیاوە، بەو هۆیەوە لەم دیوانە شیعرەدا چەند زاراوەیەکی تایبەت بەتەکنەلۆژیا جێگەی خۆیان دەکەنەوە، و بەهۆیەوە لایەنێکی تری ستاتیکای زمانێکی شیعری دەهێننە کایەوە، بۆ نموونە:

**مەسجێکم بۆ هات لەلای یارم**
**وێنەی گوڵ و دڵێکی سووری ڕازاوە،**
**کە سەیرم کرد دڵم بۆ دڵەکە لێدا و**
**تێرتێر بۆنی گوڵەکەم کرد.** ل. ١٦٧

لە سەرەتای ئەم کۆپلەیەدا زاراوەی (مەسێج) دەردەکەوێت، کەوا لە بنەڕەتدا زاراوەیەکی ئینگلیزییە و Message بەواتای نامە دێت، لەم سەردەمەی

ئێمەدا بەواتای ئەو نامەیە بەکاردێت کەوا لەڕێگەی مۆبایلەوە لەنێوانماندا ئالۆگۆڕ دەکرێت، بەکارهێنانی ئەم زاراوەیە لەشیعردا جۆرێك لەتازەگەرییە لەزمانی شیعریدا و لەمەوپێش و لای شاعیرانی تر دەرنەکەوتووە، سەرەڕای ئەوەش لەنموونەیەکی تردا دەڵێ:-

**زمان ماوسی کۆمپیوتەرێکە،**

**کلیك لەسەر هەموو شتێك دەکات.** ل. ٧٨

ئاشکرایە بەشێك لە بەشە سەرەکییەکانی کۆمپیوتەر بریتین لە (ماوس) و (کلیك)، ماوس لەزمانی ئینگلیزیدا Mouse بەواتای مشك دێت، لەبەرئەوەی ئەو بەشەی کۆمپیوتەر لەشێوەی مشك دەردەکەوێت، بۆیە هەر ئەم زاراوەیەی بۆ بەکاردێت، لەسەر ماوس دوگمەیەك هەیە کەکۆنترۆڵی چالاکییەکانی کۆمپیوتەر دەکات و بە(کلیك Click) ناسراوە، شاعیر ئەو دوو زاراوەیەی هێناوە و لەلێکچواندنێکدا بەرامبەر زمان بەرامبەریان دەکات، ئەو بەکارهێنانە جۆرێکە لە ستاتیکا کەبە زمانی شیعریی ئەو دەقە شیعرەوە دیارە[٦٤].

**سێیەم – ئابووریکردن لەزماندا:** لەزمانی شیعریدا پێویستە چەند بنەمایەك هەبن تا لەزمانی ئاسایی جیابکرێتەوە، گرنگترینیان ئەوەیە زمانی شیعری زوو خۆی نادات بەدەستەوە، واتە بەپێچەوانەی زمانی ئاسایی، «کاتێك مرۆڤ زمان بەکاردەهێنێت دەیخاتە ژێر یاسای ئابووریی زمان، واتە گەیاندنی زۆرترین زانیاری کە لەتوانادا هەیە بەبەکارهێنانی کەمترین هێز و وزە، ئەو یاسایە پەیوەندیی نێوان مرۆڤ بەزمانەوە ڕێکدەخات، ئەویش بە بەکارهێنانی کەمترین وزەی ماسوولکەیی لەکاتی ئاخاوتندا»[٦٥]، ئەم حاڵەتە بەئابووریکردن لە زماندا ناودەنێین، ئابوری وەك زاراوەیەك بریتییە لە «زاراوەیەکی یۆنانی Ecos بە واتای ماڵ، Nomos ڕێکخستن، واتە ڕێکخستنی ماڵ، وەك زاراوەش ئابووری بەشێکە لە زانستە کۆمەڵایەتییەکان کەوا بایەخ دەدات بە بەرهەم و دابەشکردنی بۆ بەکارهێنان لەئێستا و داهاتوودا لەنێوان ئەندامانی کۆمەڵگادا»[٦٦]، ئابوریکردنیش لە زماندا بەو واتایە دێت، کەوا خاوەنی دەقی ئەدەبی بتوانێت بەکەمترین وشە و دەربڕین زۆرترین ئامانج بپێکێت، بەشێوەیەك کەوا پێویستە وەرگری دەقی ئەدەبی (خوێنەر بێت یان بیستەر)، پێویست ناکات بەئاسانی و بێ بەکارهێنانی

وزه، بەسەرجەم نهێنییەکانی دەقە ئەدەبییەکە بگات، بەڵکو بەپێچەوانەوە جۆرێك وزە پێویستە بۆ تێگەیشتن لەو واتایەی شاعیر دەیەوێت بیگەیەنێت، «زاراوەی ئابووری لەخوێندنی زمانەوانیی هاوچەرخدا زۆر دەردەکەوێت، لای هەندێك لە زمانناسان بریتییە لە بەکارهێنانی وزەی دەربڕین و ماسوولکەیی، کەوا بەتیۆری سانایی ناوی دەبەن، لای هەندێکی تر فراوانتر دەبێت بۆ هەوڵی ماسوولکەیی و هەوڵی هزری، هەر بۆیە چەند زاراوەیەك هەیە کە پەیوەستن بەئابووریکردن بە وشە، کە بریتین لە کرتاندن و لابردن، سووککردن و کورتبڕی»[٦٧]، **هاوژین صلیوەی** شاعیریش لەم بەرهەمەدا هەمان هونەرکاری پەیڕەو دەکات، و کەمترین وشە بۆ دەربڕینی زۆرترین واتا و مەبەست بەکاردەهێنێت، ئەم هونەرکارییەش بەچەند شێوەیەك دیاردەکەوێت، کەوا گرنگترینیان بریتین لە :

١.**کورتبڕی** : یەکێك لەو هونەرانەی ئابووریکردن لەزماندا دێنێتە کایەوە، بریتییە لە هونەری کورتبڕی، « کورتبڕی لە ڕەوانبێژیدا ئەوەیە کە مانای زۆر بە وشەی کەم دەربڕێ. واتە ئەگەر مانا و وشەکان بەرانبەر بکرێن وشەکان لە ماناکە کەمتر بن و تەرازووەکە بەلای ماناکەدا بێ، ئەمەش یا بەهۆی لابردنی هەندێ وشە دەبێ کە لابردنەکەیان کارناکاتە سەر ماناکە، یا بەتایبەتی ـ قصر ـ کردنەوە دەبێ»[٦٨]، یان بەدەربڕینێکی ساکارتر دەگوترێت:«هەر کاتێك وتە و دەربڕینەکە کەمتر بوو بە بەراورد بەو واتایە زۆرەی دەیگەیەنێت، ئەوا کورتبڕییە»[٦٩]، لەم بەرهەمە شیعرییەدا لەچەند شوێنێکدا ئەم هونەرە بەکارهاتووە، دیارترینیان ئەو نموونانەن کەوا لەسەر بنەمای کورتبڕی جۆرێکی بەهێزی هونەری لێکچواندن هاتۆتە کایەوە، کە ئەویش بریتییە لەلێکچواندنی ڕەوان، لێکچواندن هونەرێکە لە هونەرەکانی ڕەوانبێژی و« هۆیەکە بۆ دەرخستنی خاسیەتێك یان چەند خاسیەتێکی شتێك یان کەسێك و هاوبەشیکردنی لەگەڵ شتێك یان کەسێکی تر، لە ڕێگەی ئەو هاوبەشییەوە وێنەیەکی لێچواندن دێتە بەرهەم کە لە خودی شتەکە خۆی ڕەوانتر و ئاشکراترە »[٧٠]، چەند پێکهاتەیەك بەشداری دەکەن لە دروستبوونی ئەم هونەرەدا کە بەبنەڕەتەکانی لێکچواندن ناودەبرێن، و «بنەڕەتەکانی لێکچواندن چوارن: لێچوو، لەوچوو، ئەوزرای لێکچواندن، ڕووی

لێکچواندن. دوو لایەنەکەی بریتییە لە: لێچوو و لەوچوو، ئەوانە دوو لایەن و دوو بنەڕەتیان پێ دەگوترێت، بەڵام ئامراز و ڕووی لێکچواندن تەنها بنەڕەتن، جیاوازیی نێوانیان ئەوەیە: بەبێ بنەڕەت لێکچواندن دروست دەبێت بەڵکو نەبوونی باشترە لە بوونی، بەڵام بێ دوو لایەنەکە لێچواندن بوونی نابێت ››[٧١]، ئەو جۆرەی کە لێرەدا کورتبڕی دروستکردووە، لەو جۆرەیە کەوا لە چوار بنەڕەتەکەدا دووانیان دەرکەوتوون، ئەوەیان پێی دەگوترێت لێکچواندنی ڕەوان، ‹‹ هەر کاتێك ڕووی لێکچوون کەمتر دەردەکەوێت، ئەوا بۆ تێگەیشتن پێویست بەکاری هزری هەیە و بەم شێوەیە کاریگەرتر دەبێت لەدەروونـدا لەو دەربڕینەی کەوا بەڕوونی دەرکەوتووە،...واتە تەنها دوو لایەنە دەربکەون لە لێکچواندندا››[٧٢]، یان بەدەربڕینێکی تر:‹‹ ئەمەیان لەهەموو جۆرەکانی تر بەهێزترە، تەنها لە لێچوو و لەوچوو، دروست دئەبێ و بەس، ئەوزار و لێکچواندن باسیان ناکرێت، ئەوەش دەبێ کە لەوچوو بکرێتە موزاف و بدرێتە پاڵ لێچوو، وەکو: (بەهەشتی دڵداری، دۆزەخی دووری، داری ئازادی...››[٧٣]، هەروەکو لەدەقی شیعری ( تا چاو برکا خۆشم دەوێی) دەبینرێت:

**لە نغرۆ بوونەوەی قاقای گریانم**

**فرمێسکێکت بۆ دەڕێژم**

**جوانتر بێ لە یاقووتی سووری لێوانت** ل. ١٩

لەم نموونەیەدا لێوی شۆخێك بە یاقووتی سوور ناودەبرێت، واتە لێوەکە: لێچووە، یاقووتی سوور: لەوچووە، ڕووی لێچکوون کە سوورییە دەرنەکەوتووە، ئامرازی لێکچواندن دەرنەکەوتووە. ئەم دەرنەکەوتنەی ڕووی لێکچوون و ئامرازی لێکچواندن، بووە بەهۆی دروستبوونی بەهێزترین جۆری لێکچواندن کەوا لێکچواندنی ڕەوانە، ئەو لێکچواندنەش بەهۆی کورتبڕی و بەهۆی لابردنی دوو بنەڕەتی لێکچواندن هاتۆتە کایەوە، هەروەکو کاتێك ڕستەکە بخەینەوە سەر باری ئاسایی خۆی پێویستە بگوترێت ( لێوەکانت وەك یاقووت جوانن لە سووریدا)، بەڵام شاعیر بەهۆی کورتبڕی ئابووریکردنی لە زماندا ئەنجامداوە، ئەمەش ستاتیکایە لەزمانی شیعریدا.

له نموونەیەکی شیعری تردا، دیسان کورتبڕی لە دروستبوونی لێکچواندندا دەردەکەوێت، هەروەکو دەڵێ:

**ستیانەکانت هێلانەی جووت کۆترن،**
**جووت کۆتری خڕپن و سپی،**
**جووت کۆتری دەنووك سوور و سپی خڕپن.**
**لەسەر دڵەی هێلکەیەکی کۆنەساڵ کڕکەوتوون،** ل. ٨٤

لێرەدا شاعیر لەبڕی ئەوەی بەشێوەیەکی سادە و ساکار بڵێ:( مەمکەکانت وەك کۆترن)، لێکچواندنێکی لەجۆری ناوەندی یان ناوەنجی هێناوەتە کایەوە، ((لێکچواندنی ناوەنجی: ئەوەیە کە لەگەڵ لێچوو و لەوچوو یا بەس ئەوزار هاتبێ، یا بەس لێکچوون))(٧٤)، لەم نموونەیەدا (جووتە مەمك: لێچووە، جووتە کۆتر: لەوچووە، ڕووی لێکچوون: خڕپنی و سوورییە، بەڵام ئامرازی لێکچواندن دەرنەکەوتووە)، ئەمەش شتێکی ئاساییە و دەشێت ڕووبدات، چونکە (( ڕووی لێچوون و ئامرازی لێچواندن دەکرێت یەکێکیان یا هەردووکیان لابرێن بەبێ ئەوەی ئەو لابردنە لێچواندنەکە بگۆڕێت و بیکات بەشێوازێکی تر لە شێوازەکانی ڕوونبێژی))(٧٥)، ئەمەش جۆرێك لەکورتبڕی تێدایە، کە بریتییە لە دەرنەکەوتنی ئامرازی لێکچواندن، بەم هۆیەوە ئابووریکردن لە زماندا هاتۆتە کایەوە، کە بەستاتیکا لەزمانی شیعری دادەنرێت، لێرەدا شایانی ئاماژەپێکردنە لەدەقێکی شیعریی شاعیری هاوچەرخ **قوبادی جەلی زادە** وێنەیەکی هاوشێوە دەردەکەوێت، کە لەژێر ناونیشانی (مەمك) دا دەڵێ:-

**ئەگەر ستیان**
**باڵی مەمکی نەکردایە،**
**هەموو بەیانییەك**
**لەگەڵ پۆلێ کۆترا هەڵدەفڕی و**
**ئێوارانیش**
**دەگەڕایەوە هێلانەی**
**سینە!** (٧٦)

لێرەشدا بەهەمان شێوە، مەمك وەك کۆتر دەرکەوتووە، ئەم لێکچواندنەی مەمك بەکۆتر لای هەردوو شاعیر، بەڵگەی کاریگەربوونی هاوژین صلیوەیە بەقوبادی جەلی زادە، ئەوەش لێهاتوویی ئەو شاعیرە لاوە دەردەخات، کەوا لەتوانایدا هەبووە، وێنەیەکی هاوشێوەی شاعیرێکی نەوەی پێش خۆی بنیات بنێت.

٢. **تاکەدێڕ:** لەم دیوانە شیعرەدا چەند لایەنێك لەئابووریکردن لەزماندا دەبینرێت، یەکێك لەمانە بریتییە لە دەرکەوتنی تاکەدێڕێکی شیعری کەوا ڕستەیەکی تەواو و واتادارە و بەتەنها وێنەیەکی شیعری پێکدەهێنێت، دەرکەوتنی ئەو جۆرە هونەرکارییە تایبەتمەندییەکی تری زمانی شیعری ئەم دیوانە شیعرەیە، بۆ نموونە:

**ئاگر باشترین میوەی زستانە** ل. ١٣٣

لەم نموونەیەی سەرەوەدا، ئاگر بەمیوەیەك دەچوێنێت کەوا لە وەرزی زستاندا لەهەموو میوەکان باشترینە، دیارە لای هەمووان ئاشکرایە لە وەرزی زستاندا بوونی ئاگر پێویستترە لەخواردنی میوەکان، بۆیە شاعیر ئەو بایەخەی پێداوە و ئەم جۆرە لێکچواندنەی لێ دروست کردووە، ئەو هەموو بیر و مەبەستەش تەنها لەچوارچێوەی یەك ڕستەی سادەی واتادار خراوەتە ڕوو، واتە بەکەمترین وشە و بەپەیڕەوکردنی ئابوورییەکی گونجاو لەزماندا زۆرترین واتا و مەبەست بەخوێنەر دەگەیەنرێت. لە نموونەیەکی تری هاوشێوەدا دەڵێت:

**فرمێسك خوێنی سپیی زامی دەروونە.** ل. ١٧٦

لەم نموونە شیعرەدا، بەهەمان شێوەی نموونەی پێشوو، لەیەك تاکە دێڕدا کەوا ڕستەیەکی سادە و واتادارە، بەکەمترین وزە زانیارییەکی پڕ و تەواو پەخشکراوە، لێرەدا فرمێسك بەخوێنێکی سپی ناونراوە، واتای نموونەکە بەسەریەکەوە ئەوە دەبەخشێت، کەوا چۆن کاتێك جەستە زامدار دەبێت خوێنی لێ دەتکێت، بەهەمان شێوە ئەو کاتەی دەروونمان زامدارە فرمێسك لەبری خوێن دەڕێژین و ئەو فرمێسکە وەك خوێن دەڕژێت، بەڵام خوێنێکی سپی، وەك دیارە واتا و بیرۆکەیەکی زۆر و تەواو لەیەك تاکەدێڕدا بەرجەستە کراوە، ئەوەش تازەگەرییەکی تری زمانی شیعرییە کەوا لەم دیوانە شیعرەدا دەردەکەوێت.

**چـوارەم – دەقئـاوێزان:** هـەر لەسـەردەمی فەیلەسـووفانی یۆنـانی کۆنـدا، ئـەفلاتوون و ئەرەسـتۆ، و دوای ئـەوانیش خـەڵکی تـر، بایـەخیان بەکاریگـەری و لاسـاییکردنەوە داوە و شـرۆڤەی جیاجیایـان بـۆ کـردووە، زۆرجـاریش ئـەو کاریگەرییەی شاعیرێك بەسەر ئەوی تردا لـە شـێوەی دەقئاوێزانـدا دەردەکـەوێت، ((دەقئاوێزان لە ساکارترین پێناسـەدا ئەوەیـە کـە دەقێکـی ئـەدەبی چـەند دەقـی پـێش خـۆی لـە شـێوەی وەرگـرتن و تێهەڵکێشـکردن و تـەلمیح و ئامـاژە لـەخۆ دەگرێت ئەمانەش لەگەڵ باگراونـدی دانـەر و دەقـە ڕەسـەنەکەیدا تێکـەڵ دەبـن و پێکەوە دەقێکی تازە بەرهەم دێنن))[77]، جێگەی ئاماژەپێکردنە کەوا دەقئـاوێزان هونەرێکـە و پێویسـتە لەبابـەتی دزی ئـەدەبی جیـا بکرێتـەوە، ((دزینـی ئـەدەبی گواسـتنەوەیەکی وشـە و فکـرە و وتـەی کەسـانی دیکەیـە، بـەڵام دەقئـاوێزان لەباوەشـگرتن و بەیەکداچـوونە لـەنێوان دەقەکانـدا و ڕێگرتنەبـەری گواسـتنەوەی وتەی کەسانی دیکە. دزینی ئـەدەبی کارێکـە بـەدەرە لـە چـەمکی ئاکـار، چـونکە خۆی لە دزینی بەرهـەمی کەسـانی دیکـەدا دەبینێتـەوە، بـەڵام دەقئـاوێزان پشـت بەدەقەکانی دیکە دەبەستێت وەك پاڵپشتێك وتەکانی تێدا کورت دەکـات دوور لـە دزینێکی دەقاودەق))[78]، هاوژین ی شـاعیر هـەوڵی داوە لەچـەند دەقێکدا شـێوە جیاجیاکـانی دەقئـاوێزان بـەکاربهێنێت، هـەروەکو لـە دەقێکیـدا بەناونیشـانی (کورتترین شیعری تێکهەڵکێش) نموونەیەکی دەگمەنی هونەری تێهەڵکێش دەخاتە بەرچاو، و دەڵێ:

((**پاییز پیاوێکی ڕۆمانسی**)) ئەسڵەعە.
**بەسەر پردی بۆنی لیمۆوە وەرە بۆ نێو دڵم.**
**دوو مەمکی** ((**سەخت و گەردن کەش**))
**شەهوەتی لەزەتی** ((**دوو گۆی سەر بەمۆر**))
**دەنگە خۆشەکەت** ((**مۆسیقایە بەستەیە گۆرانییە**))
((**خاڵی...حەجەرولئەسوەدە**))، **خودایە حەجێکم بە نسیب کەی.**
**لە بینینی هەر شۆخێکی جوان** ((**هەمە ئاه و هەناسەی گەرم**)) ل. ٢٠

لە پێناسەیەکی ئەم هونەرەدا دەگوترێت: ((تێهەڵکێش ئەوەیە کە هۆنـەر یـا نووسەر نیو دێرە هۆنراوە یـا دێـرە هۆنراوەیـەك یـا پارچـە هۆنراوەیـەکی تـەواوی

هۆنــەرێکی تــر بێنــێ و لەنووســین یــا هۆنراوەکــەی خــۆی هەڵبکێشــێ و پێــی بڕازێنێتــەوە))[79]، بــەڵام ئــەم لایەنــە ســتاتیکایەی لــەزمانی شــیعری ئــەم دەقــەدا دەردەکــەوێت، هــەروەکو لەناونیشــانی دەقەکــەدا هــاتووە، ئەوەیــە کــە کــورتترین دەقی تێهەڵکێشە، وەك شاعیر لـە دیوانەکەیدا و لەپـەراوێزی دەقەکـەدا ئامـاژەی پێـدەکات ، لـە نیـوەدێڕی یەکەمـدا ڕسـتەی نـاو کەوانـە ناونیشـانی بەرهـەمێکی شاعیری لاوی کـورد (**زیـاد نـادر عـاڵلایی**)، نیـوەدێڕی دووەم لـە (**نیـزار قـەبانی**) شـاعیری هاوچـەرخی عـەرەب وەرگـیراوە، نیـوەدێڕی سـێیەم تێهەڵکێشـە لەگـەڵ (**گــۆران**)، نیــوەدێڕی چــوارەم دەقئــاوێزانی دەقێکــی (**نــالی**) یــە، نیــوەدێڕی پێنجەمیش لە (**ئەحمەد هەردی**) وەرگیراوە، نیوەدێڕی شەشەمیش لە (**ئەختەر**)ی شـاعیر، و دوا نیـوەدێڕیش لـە (**مـەحوی**) وەرگـیراوە، ئـەم جـۆرە دەقئـاوێزان و تێکهەڵکێشە لەمەوپێش لە شیعری شاعیرانی کورددا بینراوە، وەك لەو پێناسەیەی سەرەوەدا دەردەکەوێت، هەرگیز لە نیوەدێڕێك کەمتر نەبووە، بەڵام ئـەو شـاعیرە هاوچەرخە لەمەشدا ستاتیکای لەزمانی شیعرەکەدا کردووە، کاتێك کـەمتر لـەنیوە دێڕێکی شاعیرانی تری تێهەڵکێش کردووە.

## ئەنجام

لەکۆتایی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا بەکۆمەڵە ئەنجامێك گەیشتین، کەوا دەتوانین لەم چەند خاڵەی خوارەوەدا کورتیان بکەینەوە:

١.زمانی شیعری پێکهاتەیەکی گرنگ لە پێکهاتەکانی دەقی شیعر پێکدەهێنێت، و شیعر بۆ ئەوەی دروست ببێت، پێویستە خاوەنی زمانێکی نووسینی تایبەت بێت کەوا جیای بکاتەوە لە زمانی نووسینی ئاسایی، زمانی شیعری لایەنێکی گرنگ لەو لایەنانە پێکدەهێنێت کەوا جوانی بەدەقی شیعر دەبەخشێت.

٢.دیوانی مۆسیقای نامۆیی هاوژین صلیوە خاوەنی زمانێکی شیعریی تایبەتییە و لە چەند ڕوویەکەوە ستاتیکایەکی دەگمەنی بە دەقە شیعرەکان بەخشیوە و جیای دەکاتەوە لە شیعری شاعیرانی تر.

٣. ناونیشانی کتێبەکە و بەشێك لە دەقە شیعرییەکان لایەنێکی سەرەکی زمانی شیعری پێکدەهێنن، کە ستاتیکایەکی تایبەتی داوەتە ئەو بەرهەمەی کەرەستەی لێکۆڵینەوەکەمان پێکدەهێنێت.

٤.مۆسیقای ناوەوە لایەنێکی تری جوانبەخشینە بەزمانی شیعری، کە لەچەند شێوەیەکدا لەم کۆشیعرەدا دەردەکەوێت.

٥.هونەرەکانی دووبارەکردنەوە و ڕەگەزدۆزیی مۆسیقای ناوەوەی دەق جوانتر دەکەن و زمانێکی شیعریی جیاواز دەهێننە کایەوە کە جوانی و ستاتیکایەکی تر دەبەخشێت بەدەقی شیعری.

٦. وێنەی شیعری بەشێکی گرنگ لە ستاتیکای زمانی شیعری پێکدەهێنێت، لەم دیوانە شیعرەدا وێنەی شیعری دەگمەن و جیاواز لەشیعری شاعیرانی تر دەبینرێت، بۆیە بەخاڵێکی بەهێزی ئەم دیوانە لەڕووی زمانی شیعری دادەنرێت.

٧. بەکارهێنانی هونەرەکانی لێکچواندن و پشت بەستنی بەکورتبڕی ستاتیکای زمانی شیعرەکان چێژبەخشتر دەکات کەوا لەچەند نموونەیەکدا بەرچاو دەکەوێت.

٨. دەرکەوتنی زاراوەی هاوچەرخ، وەك ئەو زاراوانەی تایبەتن بەتەکنەلۆژیا خاڵێکی تر لەو ستاتیکایە پێکدەهێنێت کەوا زمانی شیعری ئەو کۆشیعرەی جیاواز کردووە لە شیعری شاعیرانی تر.

٩. بابەتی دەقئاوێزان وەك بابەتێکی هاوچەرخی بواری ئەدەب و ڕەخنە هۆکارێکی ترە بۆ هاتنەکایەی زمانێکی شیعریی جوانتر کەوا لەم بەرهەمە شیعرییەدا بەرچاو دەکەوێت.

**پەراوێزەکان :**

١. هاوژین صلیوە عیسا کەریم، لە ساڵی ١٩٧٩ لە گوندی هەرمۆتەی سەر بەقەزای کۆیە لەدایك بووە. ساڵی ٢٠٠٤ بڕوانامەی بەکالۆریۆسی لە زمان و ئەدەبی کوردیدا بەدەست هێناوە. ساڵی ٢٠٠٨ بڕوانامەی ماستەری لە ئەدەبی کوردیدا بەدەست هێناوە. ساڵی ٢٠١٢ بڕوانامەی دکتۆرای لە ئەدەبی کوردیدا بەدەست هێناوە. بەرهەمەکانی نووسەر: ١– لە پاییزەوە بۆ بەهار – شیعر ٢٠٠٧، ٢– بنیاتی وێنەی هونەری لە شیعرەکانی شێرکۆ بێکەسدا، توێژینەوەی ئەدەبی، ٢٠٠٩. ، ٣– خوشکە نەسیمۆ، کۆمەڵێ حیکایەتی سریانی، وەرگێڕان، ٢٠١٢، ٤– مێژووی هەرمۆتە ٢٠١٤، ٥– ڕەهەندی دەروونی لە شیعرەکانی لەتیف هەڵمەتدا ٢٠١٤، ٦– خۆری دەق و ئاوێزەی ڕەخنە ٢٠١٤. بڕوانە: هاوژین صلیوە، مۆسیقای نامۆیی، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای ڕۆشنبیری جەمال عیرفان، بەهاوکای سەنتەری مارگرێت، چاپخانەی کەمال، ٢٠١٣، ل ١٧٨.

٢. د. ئازاد ئەحمەد مەحمود، بونیاتی زمان لە شیعری هاوچەرخی کوردیدا، بڵاوکراوەی ئەکادیمیای کوردی، چاپخانەی حاجی هاشم، چاپی دووەم، هەولێر، ٢٠١٢، ل ١٦.

٣. د. کەمال میراودەلی، فەلسەفەی جوانی و هونەر، ئیستاتیکا، خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەی قانع، چاپی دووەم، ٢٠٠٥، ل ١٢.

٤. بيتر كونزمان، بيتر بوركارد، ترجمة د. جورج كتورة، أطلس الفلسفة، المكتبة الشرقية، بيروت ـ لبنان، الطبعة الثالثة، ٢٠١٢، ل ١١.

٥. فاروق ڕەفیق، فەلسەفە و ژیان، لە بڵاوکراوەکانی خانەی حیکمەت بۆ لێکۆڵینەوەی فەلسەفی، ناوەندی ڕۆشنبیر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، سلێمانی، ٢٠٠٩، ل ٤٥.

٦. بيتر كونزمان، بيتر بوركارد، ترجمة د. جورج كتورة، أطلس الفلسفة، ل ١٣.

٧. سەباح ڕەنجدەر، ئەزموون وەك ئاخاوتنێك لەناو ژیان، بڵاوکراوەی ئەکادیمیای کوردی، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٤، ل ٢٠١.

٨. محەمەد عەبدولکەریم ئیبراهیم، پێکهاتەی زمانی شیعری لەڕوانگەی ڕەخنەی ئەدەبی نوێوە، بڵاوکراوەی ئەکادیمیای کوردی، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٢، ل ١٨.

٩. عەبدولقادر محەمەد ئەمین، وێنەی شیعری لەڕێبازی ڕۆمانسی کوردیدا، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، ٢٠٠٢، ل ٢٦، ٢٧.

١٠. محەمەد عەبدولکەریم ئیبراهیم، پێکهاتەی زمانی شیعری لەڕوانگەی ڕەخنەی ئەدەبی نوێوە، ل ٢٣، ٢٤.

١١. د. پەرێز سابیر، ڕەخنەی ئەدەبی کوردی و مەسەلەکانی نوێکردنەوەی شیعر، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٦، ل ٢٨١.
١٢. پەخشان عەلی ئەحمەد، شێوازی شیعری گۆران، نامەی ماستەر، کۆلیجی زمان، زانکۆی کۆیە، ٢٠٠٧، ل ١٦٧.
13. www.alaramedia.com/Articles.aspx
١٤. سەردار ئەحمەد حەسەن گەردی، بیناتی وێنەی هونەری لەشیعری کوردیدا ١٩٧٠-١٩٩١، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، ٢٠٠٣، ل ٦٧.
١٥. د. ئازاد ئەحمەد مەحموود، بونیاتی زمان لە شیعری هاوچەرخی کوردیدا، ل ١٥٢.
١٦. بڕوانە، د. ئیدریس عەبدوڵڵا، شێواز و شێوازگەری، لەبڵاوکراوەکانی ڕێکخراوی زمانناسی کوردستان، چاپخانەی ڕۆژهەڵات ، هەولێر، ٢٠١٠، ل ٦٤ ،٦٥.
١٧. هەمان سەرچاوە، ل ٦٧.
١٨. هەرێم عوسمان، دیدی د. هاوژین سلێوە لەبارەی دەق و ڕەخنە، ڕۆژنامەی هزر و هونەر، ژمارە (٨١) هەینی ٢٠١٤/٢/١٤، بەشی دووەم، ل ١٠.
١٩. یادگار ڕەسول حەمەدەمین باڵەکی، سیماکانی تازەکردنەوەی شیعری کوردی ١٨٩٨-١٩٣٢، دەزگاها سپێرێز یا چاپ و وەشانێ، دهۆك، چاپخانا وەزارەتا پەروەردێ، هەولێر، ساڵا ٢٠٠٥، ل ١٥٥.
٢٠. دکتور عیزەدین مستەفا رەسوول، ئەدەبیاتی نوێی کوردی، بۆ پۆلی چوارەمی زانستگا، ، چاپخانەی ( التعلیم العالي/ أربیل)، ١٩٨٩، ل ٢٧.
٢١. سامان عیزەدین سەعدون، بنیاتی هونەری لە شیعرەکانی لەتیف هەڵمەت دا، بەڕێوەبەرێتی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی، چاپخانەی کەمال، ٢٠٠٩، ل٢١.
٢٢. د. پەرێز سابیر، ڕەخنەی ئەدەبی کوردی و مەسەلەکانی نوێکردنەوەی شیعر، ل ٣١٥.
٢٣. د. پەخشان سابیر حەمەد، ڕەمز لەشیعری هاوچەرخی کوردیی کرمانجیی خوارووی کوردستان، لەبڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای کوردی، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٢، ل ١٨٤.
٢٤. سامان عیزەدین سەعدون، بنیاتی هونەری لەشیعرەکانی لەتیف هەڵمەت دا، ل ٢٠٥.
٢٥. هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەڕە.
٢٦. عەلائەددینی سەجادی، مێژووی ئەدەبی کوردی ( مێژوو، ئەدەب، زانیاری) ، بڵاوکردنەوەی کوردستان، سنە، ١٣٩١ هەتاوی.
٢٧. د. پەخشان سابیر حەمەد، ڕەمز لەشیعری هاوچەرخی کوردیی کرمانجیی خوارووی کوردستان، ل ١٧٠، ١٧١.

٢٨. هەمان سەرچاوە، ل ١٨٦.
٢٩. د. فوئاد ڕەشید، دەقی ئـەدەبی، ئـەدگار. چـێژ. بـەها، چـەند نووسـینێکی ڕەخنـەیی تیۆری و پراکتیکییە، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٧، ستاتیکای ناوونیشانی دەق لە کۆشیعری شەڕی چل ساڵەی سەباح ڕەنجدەردا، ل ٥٢.
٣٠. د. عوسمان دەشتی ، لەبارەی بنیاتی زمان و شێوازی شیعر، بڵاوکراوەی ئـەکادیمیای کوردی، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٢، ل ١٧٣.
٣١. فازیل شەورۆ، (٢) لێکۆڵینەوەی ئەدەبی، بڵاوکراوەی ئەکادیمیای کـوردی، چـاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٣، ل ١٣.
٣٢. د. دەریا جەمال حـەوێز حـەوێزی، جیهـانبینی شـیعری هاوچـەرخی کـوردی کرمـانجی ناوەڕاست لەباشووری کوردستاندا، بڵاکراوەی ئەکادیمیای کـوردی، چـاپخانەی حـاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٣، ل ١٧٨، ١٧٩.
٣٣. لەبەرئـــەوەی وەك لەناونیشـــانی لێکۆڵینەوەکـــەدا دەردەکـــەوێت، ســـەرجەم نموونـــە شیعرییەکان لەکۆشیعری ( مۆسـیقای نـامۆیی) وەرگـیراوە، بۆیـە بەپێویسـتی نـازانین لەوەرگرتنی نموونە شیعرییەکان لەپەراوێزدا ئاماژەی پێبکەین، بەڵکو هـەر لەتەنیشـت دەقەکەوە لاپەڕەکەی دەنووسین.
٣٤. توانـا ئـەمین، مـەنفا و خوێندنـەوە، چـەند گفتوگۆیـەکی ئـەدەبی، لـەبڵاوکراوەکانی پاشکۆی ڕەخنەی چاودێر، ٢٠٠٨، ل ٧٧.
٣٥. فازیل شەورۆ، (٢) لێکۆڵینەوەی ئەدەبی، ل ٢٣.
٣٦. د. عوسمان دەشتی، لەبارەی بنیاتی زمان و شێوازی شیعر، ل ١٧٣.
٣٧. د. فوئاد ڕەشید، دەقی ئـەدەبی، ئـەدگار. چـێژ. بـەها، چـەند نووسـینێکی ڕەخنـەیی تیۆری و پراکتیکییە، ل ٥٣.
٣٨. بۆ نموونە بڕوانە لاپـەڕەکانی ( ٢٥، ٣٨، ٤٩، ٦٦، ٩٣، ١٠٤، ١١٤، ١٢٢، ١٧١ ١٧٢ ) لە مۆسیقای نامۆییدا.
٣٩. بۆ نموونە بڕوانە لاپەڕەکانی (٢٦، ٢٨، ٩٠ ) لە مۆسیقای نامۆییدا.
٤٠. هاوژین صلیوە، مۆسیقای نامۆیی، ل ٨.
٤١. شـاعیر خـۆی لـە پـەراوێزی ئـەو شـیعرەدا دەڵێت:ــ هەناسـە شـیعر، بـەواتای ئـەوەی شیعرەکە هێند کورتە لەکاتی هەناسە وەرگرتنێك دەخوێندرێتەوە.
٤٢. بۆ نموونە بڕوانە لاپەڕەکانی (٢٢، ٢٣، ٢٨، ٣١، ٣٢، ٣٥، ٣٦، ٣٧، ٣٩، ٤٠، ٤١، ٤٤، ٤٥، ٥٢، ٥٥، ٥٩، ٧٠، ٨٠، ٨٤، ٨٥، ٨٨، ٩٠، ٩٥، ٩٧، ٩٨، ١٠٠، ١٠٢، ١٠٣، ١٠٦،

١١٠، ١١١، ١١٢، ١١٣، ١١٥، ١٢٦، ١٢٧، ١٣٢، ١٤٩، ١٥٠، ١٥١، ١٥٤، ١٥٧، ١٥٩، ١٦٠، ١٦١، ١٦٤ ) لە مۆسیقای نامۆییدا.

٤٣. بۆ نموونەی ئەم جۆرە ناونیشانە بڕوانە لاپەڕەکانی (٨٢، ١١٧، ١٢٤ ) لە دیوانی مۆسیقای نامۆیی.

٤٤. فاروق ڕەفیق، فەلسەفە و ژیان، ل ٣١.

٤٥. د. فوئاد ڕەشید، دەقی ئەدەبی، ئەدگار. چێژ. بەها، چەند نووسینێکی ڕەخنەیی تیۆری و پراکتیکییە، ل ٥١.

٤٦. لیژنەی ئەدەب لە کۆڕی زانیاری کوردستان، زاراوەی ئەدەبی، کوردی ـ عەرەبی ـ ئینگلیزی ، بڵاوکراوەی کۆڕی زانیاری کوردستان، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٦، ل ٤٨.

٤٧. فاروق ڕەفیق، فەلسەفە و ژیان، ل ٤٥.

٤٨. بۆ نموونە بڕوانە ل. ١٧١ لە دیوانەکەدا.

٤٩. دکتۆر دڵشاد عەلی، بنیاتی هەڵبەست لەهۆنراوەی کوردیدا، لێکۆڵینەوەیەکی ڕەخنەیی بەراوردکارە، چاپ خانەی ڕەنج، سلێمانی، ١٩٩٨، ل.٨٦.

٥٠. صافیە محەمەد ئەحمەد، شێوازی شیعرە کوردییەکانی پیربال مەحمود، یەکێتی نووسەرانی کورد ـ مەڵبەندی گشتی، چاپی یەکەم، چاپخانەی ڕۆژهەلات، هەولێر، ٢٠١٤، ل. ٩١.

٥١. د. ئیدریس عەبدوڵڵا، جوانکاری شیعری نوێی کوردی، دەزگای توێژینەوەو بڵاوکردنەوەی موکریانی، چاپخانەی هێڤی هەولێر، چاپی یەکەم، ٢٠١٢، ل. ١٥.

٥٢. هەمان سەرچاوە، ل. ١٨.

٥٣. صافیە محەمەد ئەحمەد، شێوازی شیعرە کوردییەکانی پێربال مەحمود، ل. ١١٣.

٥٤. هەمان سەرچاوە، ل. ١١٣.

٥٥. بۆ نموونەی تری دووبارەکردنەوە بڕوانە لاپەڕەکانی (١٣، ٢٩، ٤١، ٤٧، ٥٧، ٦١، ٦٤، ٧٠، ٧٤، ٧٧، ٨٠، ٨٢، ٨٨، ٩٣، ١٠٣، ١١٧، ١٧٢، ١٧٤ ) لەدیوانەکەدا.

٥٦. دەریا جەمال حەوێزی، وێنەی ڕوونبێژی لە کۆمەڵە شیعری شەهید بەتەنیا پیاسە دەکات، بەڕێوەبەرێتی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی، چاپخانەی کەمال، سلێمانی، ٢٠٠٩، ل. ٤٤.

٥٧. عادل مەجید محەمەد گەرمیانی ، وێنەی بابەتی لە هۆنراوەکانی گۆران و سەیابدا، نامەی دکتۆرا، کۆلیجی پەروەردە ـ إبن رشد ، زانکۆی بەغدا، ٢٠٠٠، ل ١٨.

٥٨. سەردار ئەحمەد حەسەن گەردی، بنیاتی وێنەی هونەری لەشیعری کوردی دا ١٩٧٠-١٩٩١، ل ١٨١.
٥٩. سەردار ئەحمەد حەسەن گەردی، بنیاتی وێنەی هونەری لەشیعری کوردی دا ١٩٧٠-١٩٩١، ل ١٩٥.
٦٠. هەمان شێوە لەلاپەڕە (٣٩) ی دیوانەکەدا بەرچاو دەکەوێت.
٦١. هاوژین سلێوە عیسا، بنیاتی وێنەی هونەری لەشیعری شێرکۆ بێکەسدا، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، کوردستان ، سلێمانی ، ٢٠٠٩، ل ١٤٧.
٦٢. بۆ نموونەی تر بڕوانە لاپەڕە (١٣٢) لە دیوانەکەدا.
٦٣. د. عزالدين إسماعيل، الشعر العربي المعاصر قضاياه و ظواهره الفنية المعنوية، الطبعة الخامسة، دار العودة للطباعة والنشر، ١٩٨١، ل ١٢٩.
٦٤. لەلاپەڕەی (٣٨) ی ئەم دیوانەدا و نموونەیەکی تری لەم شێوەیە دەبینرێت، کەوا شاعیر ئاماژە بەگفتوگۆکردن لەگەڵ مۆبایلەوە دەکات وەك بەرهەمێکی تەکنەلۆژیا.
٦٥. الدكتور عبدالسلام المسدي، قضية البنيوية، دراسة و نماذج، الطبعة الأولى، المطبعة العربية، بن عروس، تونس، ١٩٩١، ل. ٦٧، ٦٨.

66. www.ejabat.google.com/ejabat/therd

67. www.alukah.net/library

٦٨. عەزیز گەردی، ڕەوانبێژی لە ئەدەبی کوردیدا، بەرگی سێیەم - واتاسازی، بەڕەزامەندی وەزارەتی ڕاگەیاندن لەچاپ دراوە، چاپخانەی کاکەی فەللاح، سلێمانی، ١٩٧٩، ل ٦٧، ٦٨.
٦٩. السيد أحمد الهاشمي، جواهر البلاغة في المعاني والبيان والبديع، طبعة مجددة تمتاز بعزو الآيات القرآنية وتبحير الشواهد الشعرية وضبطها، إشراف صدقي محمد جميل، مؤسسة الصادق للطباعة والنشر، الطبعة الثانية، طهران، ١٣٨٣، ل ١٩٢.
٧٠. دەریا جەمال حەوێزی، وێنەی ڕوونبێژی لە کۆمەڵە شیعری شەهید بەتەنیا پیاسە دەکات، ل ٦٤.
٧١. يوسف أبو العدوس (إعداد)، البلاغة والأسلوبية - مقدمات عامة ، المملكة الأردنية الهاشمية ، عمان ، الدار الأهلية للنشر والتوزيع، الطبعة العربية الأولى، ١٩٩٩م، ل ٩٨.
٧٢. السيد أحمد الهاشمي، جواهر البلاغة، ل. ٢٣٥.
٧٣. عەزیز گەردی، ڕەوانبێژی لەئەدەبی کوردیدا، بەرگی یەکەم، بەیارمەتی نەقابەی مامۆستایانی کوردستان، چاپخانەی دار الجاحظ،١٩٧٢، ل. ٦٠.
٧٤. هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

٧٥. الدكتور أحمد مطلوب والدكتور كامل حسن البصير، البلاغة والتطبيق ، طبع بمطابع مديرية دار الكتب للطباعة والنشر، جامعة الموصل، الطبعة الأولى، ١٩٨٢م، ل ٢٦٨.
٧٦.قوبادی جەلی زادە، شەهید بەتەنیا پیاسە دەکات، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپی دووەم، هەولێر، ٢٠٠٧، ل ٥٥٠.
٧٧.شنۆ محەمەد مەحمود، دەقئاوێزان لەشیعری نوێی کوردیدا، بەنموونەی پیرەمێرد، گۆران، لەتیف هەڵمەت، بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی، چاپخانەی بینایی، ٢٠١٢، ل ٢٦.
٧٨.هەمان سەرچاوە، ل ٧٥.
٧٩. عەزیز گەردی، ڕەوانبێژی لەئەدەبی کوردیدا، بەرگی دووەم، وەزارەتی گەیاندن، بەڕێوەبەرێتی گشتی ڕۆشنبیری کوردی یاریدەی داوە، چاپخانەی شارەوانی، هەولێر، ١٩٧٦، ل ٥٢.

**سەرچاوەکان**

**کتێب: ١ـ کوردی:**

١. ئـەدەبیاتی نـوێی کـوردی، بـۆ پـۆلی چـوارەمی زانسـتگا، دکتـۆر عیـزەدین مسـتەفا ڕەسوول، چاپخانەی ( التعلیم العالي/ أربیل)، ١٩٨٩.
٢. ئـەزموون وەك ئاخاوتنێـك لـەناو ژیـان، سـەباح ڕەنجـدەر، بڵاوکـراوەی ئـەکادیمیای کوردی، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٤.
٣. بنیاتی هەڵبەست لە هـۆنراوەی کوردیـدا، لێکۆڵینەوەیـەکی ڕەخنـەیی بـەراوردکارە، دکتۆر دڵشاد عەلی، چاپخانەی ڕەنج، سلێمانی، ١٩٩٨.
٤. بنیـاتی هونـەری لـە شـیعرەکانی لـەتیف هەڵمەتـدا، سـامان عیـزەدین سـەعدوون، بەڕێوەبەرێتی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی، چاپخانەی کەمال، سلێمانی، ٢٠٠٩.
٥. بونیـاتی زمـان لـە شـیعری هاوچـەرخی کوردیـدا، د. ئـازاد ئەحمـەد مـەحموود، بڵاوکراوەی ئەکادیمیای کـوردی، چـاپخانەی حـاجی هاشـم، هـەولێر، چـاپی دووەم، ٢٠١٢.
٦. بنیاتی وێنەی هونەری لە شیعری شێرکۆ بێکەسدا، هـاوژین سـلێوە عیسـا، دەزگـای چاپ و پەخشی سەردەم، کوردستان ، سلێمانی ، ٢٠٠٩.
٧. بنیاتی وێنەی هونەری لەشیعری کوردیدا ١٩٧٠– ١٩٩١، سـەردار ئەحمـەد حەسـەن گەردی، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، ٢٠٠٣.
٨. پێکهاتەی زمانی شیعری لە ڕوانگەی ڕەخنەی ئەدەبی نوێوە، محەمەد عەبدولکـەریم ئیبراهیم، بڵاوکراوەی ئەکادیمیای کوردی، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٢.
٩. جوانکـاری شـیعری نـوێی کـوردی، د. ئیـدریس عەبـدوڵڵا، دەزگـای توێژینـەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی، چاپخانەی هێڤی هەولێر، چاپی یەکەم، ٢٠١٢.
١٠. جیهانبینی شیعری هاوچەرخی کوردی کرمانجی ناوەڕاست لەباشـووری کوردسـتاندا، د. دەریا جەمال حەوێز حەوێزی ، بڵاوکراوەی ئەکادیمیای کوردی، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٣.
١١. دەقـی ئـەدەبی، ئـەدگار. چـێژ. بـەها، چـەند نووسـینێکی ڕەخنـەیی تیـۆری و پراکتیکییە، د. فوئاد ڕەشـید، بڵاوکـراوەی ئـاراس، چـاپی یەکـەم، هـەولێر، ٢٠٠٧؛ ئیستاتیکای ناوونیشانی دەق لە کۆشیعری شەڕی چل ساڵەی سەباح ڕەنجدەردا.

١٢. دەقئاوێزان لەشیعری نوێی کوردیدا، بەنموونەی پیرەمێرد، گۆران، لەتیف هەڵمەت، بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی، چاپخانەی بینایی، ٢٠١٢.

١٣. رەخنەی ئەدەبی کوردی و مەسەلەکانی نوێکردنەوەی شیعر، د. پەرێز سابیر، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٦.

١٤. رەمز لە شیعری هاوچەرخی کوردیی کرمانجیی خوارووی کوردستان، د. پەخشان سابیر حەمەد، لەبڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای کوردی، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٢.

١٥. رەوانبێژی لە ئەدەبی کوردیدا، بەرگی یەکەم، عەزیز گەردی، بەیارمەتی نەقابەی مامۆستایانی کوردستان چاپکراوە، چاپخانەی دار الجاحظ، ١٩٧٢.

١٦. رەوانبێژی لە ئەدەبی کوردیدا، بەرگی دووەم، عەزیز گەردی، وەزارەتی گەیاندن، بەڕێوەبەرێتی گشتی رۆشنبیری کوردی یاریدەی داوە، چاپخانەی شارەوانی ، هەولێر، ١٩٧٦.

١٧. رەوانبێژی لە ئەدەبی کوردیدا، بەرگی سێیەم - واتاسازی، عەزیز گەردی، بەرەزامەندی وەزارەتی راگەیاندن لەچاپ دراوە، چاپخانەی کاکەی فەللاح، سلێمانی، ١٩٧٩.

١٨. زاراوەی ئەدەبی، کوردی - عەرەبی - ئینگلیزی ، ئامادەکردنی لیژنەی ئەدەب لە کۆڕی زانیاری کوردستان، بڵاوکراوەی کۆڕی زانیاری کوردستان، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٦.

١٩. سیماکانی تازەکردنەوەی شیعری کوردی ١٨٩٨– ١٩٣٢، یادگار رەسول حەمەدەمین باڵەکی، دەزگاها سپیرێز یا چاپ و وەشانێ، دهۆك، چاپخانا وەزارەتا پەروەردێ، هەولێر، سالا ٢٠٠٥.

٢٠. شەهید بەتەنیا پیاسە دەکات، قوبادی جەلی زادە، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپی دووەم، هەولێر، ٢٠٠٧.

٢١. شێوازو شێوازگەری، د. ئیدریس عەبدوڵڵا، لەبڵاوکراوەکانی رێکخراوی زمانناسی کوردستان، چاپخانەی رۆژهەڵات ، هەولێر، ٢٠١٠.

٢٢. شێوازی شیعره کوردییەکانی پیربالّ مەحمود، صافیه محەمەد ئەحمەد، یەکێتی نووسەرانی کورد- مەڵبەندی گشتی، چاپی یەکەم، چاپخانەی ڕۆژهەلات، هەولێر، ٢٠١٤.
٢٣. فەلسەفه و ژیان، فاروق ڕەفیق، لەبلاوکراوەکانی خانەی حیکمەت بۆ لێکۆڵینەوەی فەلسەفی، ناوەندی ڕۆشنبیر بۆ چاپ و بلاوکردنەوه، سلێمانی، ٢٠٠٩.
٢٤. فەلسەفەی جوانی و هونەر، ئیستاتیکا، د. کەمال میراودەلی، خانەی چاپ و بلاوکردنەوەی قانع، چاپی دووەم، ٢٠٠٥.
٢٥. (٢) لێکۆڵینەوەی ئەدەبی، فازیل شەورۆ، بلاوکراوەی ئەکادیمیای کوردی، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٣.
٢٦. لەبارەی بنیاتی زمان و شێوازی شیعر، د. عوسمان دەشتی، بلاوکراوەی ئەکادیمیای کوردی، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٢.
٢٧. مەنفا و خوێندنەوه، چەند گفتوگۆیەکی ئەدەبی، توانا ئەمین، لەبلاوکراوەکانی پاشکۆی ڕەخنەی چاودێر، ٢٠٠٨.
٢٨. مۆسیقای نامۆیی، هاوژین صلیوه، لەبلاوکراوەکانی دەزگای ڕۆشنبیری جەمال عیرفان، بەهاوکای سەنتەری مارگرێت، چاپخانەی کەمال، ٢٠١٣.
٢٩. مێژووی ئەدەبی کوردی ( مێژوو، ئەدەب، زانیاری) ، عەلائەددینی سەججادی، بلاوکردنەوەی کوردستان، سنه، ١٣٩١ هەتاوی.
٣٠. وێنەی ڕوونبێژی له کۆمەڵه شیعری شەهید بەتەنیا پیاسه دەکات، دەریا جەمال حەوێزی، بەڕێوەبەرێتی چاپ و بلاوکردنەوەی سلێمانی، چاپخانەی کەمال، سلێمانی، ٢٠٠٩.
٣١. وێنەی شیعری لەڕێبازی ڕۆمانسی کوردیدا، عەبدولقادر محەمەد ئەمین، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، ٢٠٠٢.

**٢- عەرەبی:**

١. أطلس الفلسفة، بيتر كونزمان، بيتر بوركارد، ترجمة د. جورج كتورة، المكتبة الشرقية، بيروت ـ لبنان، الطبعة الثالثة، ٢٠١٢.
٢. البلاغة والأسلوبية ـ مقدمات عامة ، يوسف أبو العدوس ( إعداد)، المملكة الأردنية الهاشمية، عمان، الدار الأهلية للنشر والتوزيع، الطبعة العربية الأولى، ١٩٩٩م.

٣. البلاغة والتطبيق، الدكتور أحمد مطلوب والدكتور كامل حسن البصير، طبع بمطابع مديرية دار الكتب للطباعة والنشر، جامعة الموصل، الطبعة الأولى، ١٩٨٢م.
٤. الشعر العربي المعاصر قضاياه وظواهره الفنية المعنوية، الطبعة الخامسة، دار العودة للطباعة و النشر، ١٩٨١.
٥. جواهر البلاغة في المعاني والبيان والبديع، تأليف السيد أحمد الهاشمي، طبعة مجددة تمتاز بعزو الآيات القرآنية وتبحير الشواهد الشعرية وضبطها، إشراف صدقي محمد جميل، مؤسسة الصادق للطباعة و النشر، الطبعة الثانية، طهران، ١٣٨٣.
٦. قضية البنيوية، دراسة ونماذج، الدكتور عبدالسلام المسدي، الطبعة الأولى، المطبعة العربية، بن عروس، تونس، ١٩٩١.

**نامەی ئەکادیمی:**

١. شێوازی شیعری گۆران، نامەی ماستەر، پەخشان عەلی ئەحمەد، بەسەرپەرشتی پ.ی.د. سەردار ئەحمەد حەسەن گەردی، کۆلیجی زمان، زانکۆی کۆیە، ٢٠٠٧.
٢. وێنەی بابەتی لە هۆنراوەکانی گۆران و سەیابدا، عادل مەجید محەمەد گەرمیانی، نامەی دکتۆرا، کۆلیجی پەروەردە ـ إبن رشد، زانکۆی بەغدا، ٢٠٠٠.

**رۆژنامە :**

- دیدی د. هاوژین سلێوە لەبارەی دەق و رەخنە، رۆژنامەی هزر و هونەر، ژمارە (٨١) هەینی ١٤/٢/٢٠١٤، بەشی دووەم، ئا: هەرێم عوسمان، ل. ١٠.

**پێگەی ئینتەرنێت:**

1. www.ejabat.google.com/ejabat/therd
2. www.alukah.net/library
3. www.alaramedia.com/Articles.aspx

## الخلاصة

هذا البحث بعنوان ( جماليات اللغة الشعرية في ديوان ـ الموسيقى الغريبة ـ ل هاوزين صليوه )، دراسة نقدية تطبيقية، من ضمنها نحاول التحدث عن أهم جوانب الجماليات في اللغة الشعرية، ونتخذ ديوان الموسيقى الغريبة للشاعر الشاب الكوردي هاوزين صليوه نموذجاً، وهو شاعر معاصر صاحب ديوانين شعريتين، وآخرها عبارة عن الديوان الشعري المتكون من ١٧٨ صفحة من حجم نصف الصفحة، وهو المادة الرئيسية لهذا البحث.

ومن الواضح إن الشعر جزء من الجزئين الرئيسيين للأدب وهو الشعر والنثر، والذي يفرق الشعر من النثر هو عناصر: (الفكر، الخيال، الوزن والقافية)، وللغة دور رئيسي في تكوين هذه العناصر، ويجب على الشاعر أن يجيد العمل في اللغة لكي يعطي الجمال لشعره، وهذا يحتاج لمهارة الشاعر، أي يجب أن يكون الشاعر ملماً باللغة لكي يبني شعره، وهذه اللغة معروف باللغة الشعرية، وهي تتكون من جوانب من الجماليات والتفنن، وهذا هو المكون الأساسي لهذا البحث.

هذا البحث يتكون من ثلاثة فصول رئيسية، الفصل الأول بعنوان (مصطلح الجماليات واللغة الشعرية)، وفيها نؤشر على المصطلحين جماليات واللغة الشعرية ومراحل اللغة الشعرية الكوردية ومصادرها، والفصل الثاني بعنوان (جماليات الشكل الشعري)، نؤشر فيها على جماليات شكل الشعر، وهو عبارة عن (جماليات العنوان، الموسيقى الداخلية)، والفصل الثالث بعنوان (جماليات مضمون الشعر) ويتكون من (الصورة الشعرية، الإقتصاد في اللغة، الإقتباس)، وأخيراً نعرض أهم نتائج البحث وخلاصته باللغتين العربية والأنكليزية.

## Abstract

This research which is under the title of (Statics of poetic language in poems of (Mosiqay Namoyee) by (Hawzhin Slewa), is a critical practical research. Here we will try to talk about ecstatic of poetic language through the poems by the young poet Hawzhin Slewa who is a young Kurdish poet that owns two books of poems and some books and papers on literature and criticism. The latest book of poems entitles (Mosiqay Namoyee) which consists of 187 medium-size papers of poems which is the major subject of this paper.

It is clear that poetry is one of the major parts of literature which are poetry and prose. Some specific constituents that differentiate poetry from prose are : -Thinking, imagination, rhythm and music, to get these constituents language plays the major role and one of the main tasks of a poet is to be familiar with language to construct poems. There can be found many of these who have this ability and as a result they have presented nice poems to Kurdish readers in a way that their language is different from the ordinary language of people. This is known as the poetic language which has its own ecstatic and which is the main subject of this research.

The research consists of three major chapters. The first chapter entitles (the concepts of statics and the poetic language) that sheds light on the concepts of static, poetic language, the phases of poetic language and the sources of poetic language. The second chapter is (statics of the form of poetry) indicates the statical features appearing in the external form of poetry and have been arranged under some sub-chapters which are:- statics of the title and the internal music. The title of the third chapter is (statics of content of poetry) in which the ( Poetry Images, economics of language and The Intertextuality are analyzed, in the later part of this chapter the conclusion, list of the references and the summary of the research are presented in both Arabic and English language.

# سروودی ئەی ڕەقیب

## لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی

**پ.ی.د. قەیس کاکل تۆفیق**
بەشی زمانی کوردی
فاکەڵتی ئاداب – زانکۆی سۆران

**م. کوردستان رەفیق محێدین**
بەشی زمانی ئینگلیزی
فاکەڵتی ئاداب – زانکۆی سۆران

### ١: پێشەکی

**١–١. ناوونیشانی لێکۆڵینەوەکە:**

ناونیشانی لێکۆڵینەوەکە بریتییە لە (ئەی ڕەقیب، لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی ) ئەم ناونیشانەش چوارچێوە و ناوەڕۆکی لێکۆڵینەوەکە دادەڕێژێ، کە بریتییە لە لێکدانەوە و شیکردنەوەی سروودی ئەی ڕەقیب.

**١–٢. سنووری لێکۆڵینەوەکە:**

سروشتی لێکۆڵینەوەکە ئەوە بەسەر لێکۆڵەردا دەسەپێنێ، کە لە ئاستی دەقسازیدا مامەڵە لەگەڵ دەقەکەدا بکا. هەموو ئەو بوارانەی، کە شیکردنەوەی دەق پێویستیەتی، دەکەونە ناو تخووبی لێکۆڵینەوەکە. هەر لە ئاماری دانە فەرهەنگییەکان تا دەگاتە ئاستی پراگماتیك و زمانەوانیی کۆمەڵایەتی.

**١–٣. کەرەستەی خاوی لێکۆڵینەوەکە:**

کەرەستەی خاوی لێکۆڵینەوەکە بریتییە لە سروودی (ئەی ڕەقیب)، کە لە لایەن (دڵدار)ی شاعیر لە ساڵی (١٩٣٨) هۆنراوەتەوە.

**١–٤. ڕێبازی لێکۆڵینەوەکە:**

ناونیشانی لێکۆڵینەوەکە چوارچێوە بۆ ڕێبازی لێکۆڵینەوەکە دیاری دەکا، کە بریتییە لە ڕێبازی وەسفی شیکاری. هەرچەندە لێکۆڵینەوەکە بەوەندە ناوەستێ و بەهۆی ڕەهەندی دەروونی و کۆمەڵایەتی کەرەستە خاوەکە ناچار دەبێ پەنا بۆ ڕێبازی مێژوویی ببات، بۆ شیکردنەوەی ئەو واتا بارکراوانەی

(connotational meaning)، کە سروودەکە دەیگرێتە خۆی. لە بەشی دووەمدا بۆ لێکدانەوەی پەیوەندییەکانی نێو دەقی سروودەکە، میتۆدی هاڵیدەیمان بەکارهێناوە. بۆ شیکردنەوە پراگماتیکییەکانیش، ئەوا بوارەکانی (کردەی قسەیی ( speech acts) و لێکەوتەی ئاخاوتن (conversaitional implicature) و بەرگریمانە (presupposition)مان بەکارهێناوە.

**١–٥. گرفتی لێکۆڵینەوەکە:**

ئەگەرچی لێکۆڵینەوەی وەسفی شیکاری کەمتر لە هەوڵی چارەسەرکردنی گرفتدایە و زیاتر وەسفکردن دەگرێتەوە. بەڵام ئەم لێکۆڵینەوەیە بە مەبەستی چارەسەرکردنی ڕەهەندێکی قووڵتر لە شیکردنەوەی سروودەکە دێتە بەرهەم، کە ئەویش لێکدانەوە و شیکردنەوەی ئەو هەڵوێستە جیاوازانەیە، کە بەرانبەر ئەو سرووده وەرگیراوە، لەم دوایانەدا لە ناوەندە ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن و تەنانەت ناوەندە سیاسییەکانیشدا بە ڕێژەیەکی فراوان گفتوگۆ، تەنانەت مشتومڕیش لەسەر ئەم سرووده دروست ببوو، کە پێویستە بگۆڕێ یان وەکو سروودی نیشتیمانی بمێنێتەوە؟. ئایا بۆ ئەم قۆناغەی ئێستا دەگونجێ و لەبارە؟ یان کاتی مێژوویی و چەمکەکانی ناوەوەی کاتیان بەسەر چووە پێویستە سروودێکی تری نیشتیمانی دابنرێ؟ ئەم گفتوگۆیانەش بە شێوەیەکی فراوان ڕەهەندی سیاسی و دەروونی و مێژوویی بەسەریاندا زاڵە، بۆیە ئەم لێکۆڵینەوەیە هەوڵدەدا شیکردنەوەیەکی زمانەوانییانەی بابەتی بۆ دەقەکە بکات، وەك لێکۆڵینەوەیەکی ئەکادیمی بیخاتە بەر دیدی ئەم دوو جەمسەرە دژ بە یەکەی، کە لایەنگر و نەیاری سروودەکەن.

**١–٦. گرنگی لێکۆڵینەوەکە:**

جگە لەو خاڵەی کە لە گرفتی لێکۆڵینەوەکەدا باسکرا، بایەخی ئەم لێکۆڵینەوەیە لەوەدا خۆی دەبینێتەوە، کە لایەنێکی پراکتیکی شیکردنەوەی دەقە و پسپۆر و لێکۆڵەرانی ئەم بوارە، وەك نموونەیەکی پراکتیکی دەتوانن سوودی لێ ببینن. سەرەڕای ئەوەش لێکۆڵینەوەی لەم بابەتە نەك هەر لە زمانی کوردیدا نەکراوە، بەڵکو لە ناوچەکەشدا دەگمەنە.

**١-٧. ناوەرۆکی لێکۆڵینەوەکە:**

جگە لە پێشەکی، لێکۆڵینەوەکە لە سێ بەش پێکدێ. بەشی یەکەم، بۆ ناساندن و شیکردنەوەی سروودەکە لە ڕووی پەیوەندییەکانی نێو دەق تەرخان کراوە، ئەو لکاندنانە (Cohesion) ی، کە لە دەقەکەدا هەیە دیاری دەکا . لە بەشی دووەمدا لە ڕووی پراگماتیکییەوە. دەقەکەشی دەکرێتەوە. بەشی سێیەمیش بۆ لێکدانەوەی سروودەکە لە ڕەهەندی فیکری و مێژوویی و سیاسییەوە تەرخان کراوە.

## ٢. بەشی یەکەم: سروودی ئەی ڕەقیب.

**٢-١. سەرەتا:**

لەم بەشەدا جگە لە دەقی شیعرەکە هەوڵ دەدەین هەندێ زانیاریی پێویست لە بارەی شیعر و دانەری شیعرەکە و مێژوو و هەندێ لایەنی تری بخەینە ڕوو:

**٢-٢: دەقی شیعرەکە:**

دەقی شیعرەکە وەك ئەوەی لە دیوانی شاعیر ( دڵدار، شاعیری شۆڕشگێڕی کورد)[1] و (مێژووی ئەدەبی کوردی)ی د. مارف خەزنەدار [2]دا هاتووە ، بەم شێوەیەیە:

**١- ئەی ڕەقیب هەر ماوە قەومی کورد زوبان نای ڕمێنێ دانەیی تۆپی زەمان**
**٢- ئێمە ڕۆڵەی ڕەنگی سوور و شۆڕشین سەیریکە خوێناوییە ڕابردوومان**
**٣- ئێمە ڕۆڵەی میدیا و کەی خوسرەوین دینمانە ئاینمانە نیشتیمان.**
**٤- کەس نەڵێ کورد مردووە کورد زیندووە زیندووە هیچ نانەوێ ئاڵاکەمان.**
**٥- چەند هەزار لاوانی کوردی نەپڕە شێر بوون بە قوربانی و هەموویان نێژران**
**٦- لاوی ئێستاش حازر و ئامادەنە جانفیرانە[3] جان فیدانە جان فیدان**
**٧- لاوی کورد هەڵسانە سەر پێ وەك دلێر سا بە خوێن نەقشی ئەکەن تاجی ژیان**
**٨- کەس نەڵێ کورد مردووە کورد زیندووە زیندووە هیچ نانەوێ ئاڵاکەمان**

**٢-٣. زانیاریی دەرەکی لە بارەی شیعرەکە:**

شاعیر دڵدار لە ساڵی (١٩٣٨) ئەم هۆنراوەیەی لە شاری کەرکووک نووسیوە[٤]. لە ڕووی ڕوخسارەوە بە شیعری کلاسیکی دادەنرێ، لە هەشت بەیت پێکهاتووە. بەیتی (کەس نەڵێ کورد مردووە کورد زیندووە...) تەرجیع بەندە و لە دێری هەشتەمدا دووبارە بۆتەوە[٥]. سروودی ئەی ڕەقیب لە سەر کێشی عەرووز دانراوە و کێشەکەی بریتییە لە (رەمەلی شەشی مەحزووف) واتە کێشی (فاعیلاتن فاعیلاتن فاعلن). ژمارەی وشەکانی شیعرەکە بەبێ ئەو تەرجیع بەندە بریتییە لە (٧١) حەفتا و یەك وشە و ئەگەر تەرجیع بەندەکەی لەگەڵ هەژمار بکرێ ئەوا ژمارەی وشەکانی دەبێتە (٨١) هەشتا و یەك وشە. ئاوازی سروودەکە شێخ حسێن بەرزنجی[٦]دایناوە. سەرەتا لە یانەی سەرکەوتن وتراوە و لە ٢٢ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٦ بە شێوەیەکی فەرمی بۆ یەکەم جار لە کۆماری کوردستان (مهاباد) وەك یەکەم سروودی نیشتیمانی بەکار هاتووە[٧].

**٢-٤. پەیوەندیی لکاندن لەنێو دەقی شیعرەکەدا:**

بەپێی بۆچوونی هالیدەی پەیوەندییە پێکهێنەرەکانی دەق دەبن بە دوو بەش: لکاندنی وشەیی (lxicalcohesion) و لکاندنە ڕێزمانییەکان (grammaratical cohesion) . لە خوارەوەش هەردوو جۆری پەیوەندی دەخەینە ڕوو:

**٢-٤-١. لکاندنە وشەییەکان *lexical cohesion***

١- دووبارەکردنەوەی وشە: Repetition Word لە سروودەکەدا بەم شێوەیەیە: لە خشتەی خوارەوەدا خراوەتە ڕوو[٨]:

| ژ | وشە | دێر | ژمارەی دووبارە بوونەوە |
|---|---|---|---|
| ١ | ئێمە | ٢، ٣ | ٢ |
| ٢ | ڕۆڵە | ٢، ٣ | ٢ |
| ٣ | کورد | ١، ٤، ٥، ٧ | ٤ |
| ٤ | زیندووە | ٤، ٤ | ٢ |
| ٥ | جانفیدا | ٦، ٦، ٦ | ٣ |
| ٦ | لاو | ٥، ٦، ٧ | ٣ |

**خشتەی (١) دووبارە کردنەوە لە سروودی ئەی ڕەقیب**

٢– **هاوواتا** Synonyms.

زاراوەی هاوواتا لەم بەشەدا بە شێوە فراوانەکەی بەکار هاتووە، ،کە جۆرەکانی: گرتنەوە ، میتافۆر، هاوواتای تەواو، وشەی بیانی...هتد دەگرێتەوە. ژمارە و جۆری هاوواتا لە دەقی شیعرەکەدا بەم شێوەیەیە، کە لە خشتەکەدا خراوەتە ڕوو:

| زنجیرە | وشە | لە دێری | هاوواتاکەی | لە دێری | جۆری هاو واتا |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | ڕەنگی سوور | ٢ | شۆڕش | ٢ | میتافۆر |
| ٢ | میدیا | ٣ | کەی خوسرەو | ٣ | گرتنەوە |
| ٣ | دین | ٣ | ئاین | ٣ | هاوواتایی |
| ٤ | مردنی کورد | ٤ | کەوتنی ئاڵاکەی | ٤ | میتافۆر |
| ٥ | حازر | ٦ | ئامادە | ٦ | وشەی بیانی جەختکردنەوە |
| ٦ | ماوە | ١ | زیندووە | ٤ | هاوواتایی |
| ٧ | نەڕرە شێر | ٥ | دلێر | ٧ | میتافۆر |
| ٨ | ڕەنگ | ٢ | سوور | ٢ | گرتنەوە |
| ٩ | قەوم | ١ | کورد | ١,٤,٧ | گرتنەوە |
| ١٠ | لاوی کورد | ٥ | نەڕرەشێر | ٥ | میتافۆر |

**خشتەی (٢) لکاندنە وشەییەکان لە سروودی ئەی ڕەقیبدا**

**٢-٤-٢. لکاندنە ڕێزمانییەکان:**

لکاندنە ڕێزمانییەکان[٩] بریتین لە:

١– ئامازە : ئامازەش دوو شێوەی هەیە، ئامازە بۆ ناو دەق و ئامازە بۆ دەرەوەی دەق.

٢– بریتی خستن: بەپێی باری ڕێزمانی دەشێ بریتی خستنی بکەر یان بەرکار یان کەرەستەکانی تر بگرێتەوە.

٣– کرتاندن: ئەمەشیان وەك بریتی خستنە، بەڵام هیچ کەرەستەیەك شوێنی کەرەستە کرتێنراوەکە (بکەر، بەرکار،...هتد) ناگرێتەوە.

٤– بەستنەوە: ئەمەشیان بەپێی واتای بەستنەوەکە جۆرەکانی دیاری دەکرێ، کە بەستنەوەی تەواو و پێچەوانە و جیاواز و ... هتد دەگرێتەوە.

لە خشتەی ژمارە (٣)دا، هەر چوار جۆری لکاندنەکان بەپێی دێڕی شیعرەکە، ڕوون کراوەتەوە، کە بەم شێوەیەیە: ستوونی یەکەم ڕیزبەندی دێڕە شیعرەکەی تێدا نووسراوە، ستوونی دووەم ژمارەی ئەو پەیوەندییە لکاندنانەیە، کە لە دێڕێکدا دەردەکەوێ تۆمار کراوە. ستوونی سێیەمیش شێوەی پەیوەندییەکەیە، کە لە (٢–٤–٢) باس کراوە. ستوونی چوارەم جۆری هەریەك لەپەیوەندییەکان خراوەتە ڕوو. دواتریش ئەم جۆرانە لقی تایبەتییان لێ دەبێتەوە بۆ چەند لقێك پۆلین دەکرێن ئەمەش لە ستوونی پێنجەمدا خراوەتە ڕوو. لە شەشەم ستوونیشدا ئەو وشە یان لێکسیمەی، کە پەیوەندییەکە دروست دەکا خراوەتە ڕوو. لە دوا ستوونیشدا کەرەستەی بۆ گەڕاوەکە، کە پەیوەندییەکەی بۆ دەگەڕێتەوە دەخەینە ڕوو.

| ژ. دێڕ | ژ. پەیوەندی | شێوەی پەیوەندی | جۆرەکەی | لق | کەرەستە | کەرەستەی پەیوەندار |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | ٤ | ئاماژە | ئاماژەی دەرەوە | ناو | ڕەقیب | |
| | | ئاماژە | ئاماژەی دەرەوە | کات | هەر ماوە | |
| | | ئاماژە | ئاماژەی دەرەوە | ناو | کورد | |
| | | بریتی خستن | ناوی | بەرکار | قەومی کورد زوبان | ی (نای ڕمێنیٚ) |
| ٢ | ٣ | ئاماژە | ئاماژەی دەرەوە | ر. جودا | ئێمە | |

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | ئاماژە | ئاماژەی دەرەوە | ناو | ڕەنگی سوور و شۆڕش | |
| | | بریتی خستن | ناوی | بکەر | ڕەقیب | (ی) سەیریکە |
| ٣ | ٥ | ئاماژە | ئاماژەی دەرەوە | ر. جودا | ئێمە | |
| | | ئاماژە | ئاماژەی دەرەوە | ناو | میدیا | |
| | | ئاماژە | ئاماژەی دەرەوە | ناو | کەی خوسرەو | |
| | | ئاماژە | ئاماژەی دەرەوە | ر– خاوەنیەتی | مان (دینمان) | |
| | | ئاماژە | ئاماژەی دەرەوە | ر– خاوەنیەتی | مان (ئاینمان) | |
| ٤ | ٤ | ئاماژە | ئاماژەی دەرەوە | ناو | کورد | کورد مردووە |
| | | ئاماژە | ئاماژەی دەرەوە | ناو | کورد | کورد زیندووە |
| | | کرتاندن | ناوی | بکەر | کورد | کورد زیندووە |
| | | ئاماژە | ئاماژەی دەرەوە | ر– خاوەنیەتی | مان (ئالآکەمان) | |
| ٥ | ٣ | ئاماژە | ئاماژەی دەرەوە | ناو | کورد | |
| | | بەستن | بەستنەوە | | و | هەمان دێڕ |
| | | کرتاندن | ناوی | بکەر | لاوانی کورد | نێژران |
| ٦ | ٤ | ئاماژە | ئاماژەی دەرەوە | ناو | لاوی ئێستا | |

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | بەستن | لێکدان | | ش | دێری ٥ |
| | | ئاماژە | ئاماژەی دەرەوە | کات | ئێستا | |
| | | کرتاندن | ناوی | بکەر | لاوی ئێستا | جانفیدانە |
| ٧ | ٣ | ئاماژە | ئاماژەی دەرەوە | ناو | لاوی کورد | |
| | | بەستن | هۆیی | | سا | |
| | | کرتاندن | ناوی | بکەر | لاوی کورد | نەقشی ئەکەن |

**خشتەی (٣) شیکردنەوەی پەیوەندییە ڕێزمانییەکان لە سروودی ئەی ڕەقیب**

بۆ بەراوردی نێوان جۆری پەیوەندییە ڕێزمانییەکانی نێو ئەم دەقە، لەم خشتەیەی خوارەوەدا ژمارە و ڕێژەی جۆری پەیوەندییەکان ڕوون دەبێتەوە.

| **جۆری پەیوەندی** | **ژمارەی پەیوەندی** | **ڕێژەی سەدی** |
|---|---|---|
| **ئاماژە** | 17 | %68 |
| **کرتاندن** | 5 | %20 |
| **بەستن** | 3 | %12 |
| **بریتی خستن** | 2 | %8 |

**خشتەی (٤) ڕێژەی پەیوەندییە ڕێزمانییەکانی سروودی ئەی ڕەقیب**

**هێڵکاری (١): ڕێژەی پەیوەندییە ڕێزمانییەکان**




## ٣ـ بەشی دووەم: شیکردنەوەی پراگماتیکی.

### ٣-١. سەرەتا:

یەکێك لە خاسیەتەکانی شیعری کلاسیکی کوردی ئەوە بوو، کە هەر بەیتێك سەربەخۆیی خۆی هەیە، لکاندن Cohision لەگەڵ یەکتردا دروست ناکەن، هەر بۆیەش لە لێکدانەوە پراگماتیکییەکاندا بە شێوەی سەربەخۆ مامەڵە لەگەڵ بەیتەکاندا دەکەین. بۆ ئەوەی لێکۆڵینەوەکە سنووری دیاریکراوی خۆی نەبەزێنێ بە پێویست نەزانرا بیکەین بە مەیدانی گفتوگۆی بابەتە تیۆرییەکانی پراگماتیك (کردە قسەییەکان Speech acts و بەرگریمانە Presupsision و لێکەوتەلێکەوتەکان implicatures و نیشانە پراگماتیکییەکان Deixis)(١٠) هەر بۆیە زۆر بە کورتی باسکراوە و دواتر ڕاستەوخۆ بوارە پراگماتیکییەکان وەك کەرەستەیەك بۆ شیکردنەوەی دەقەکە لە لایەنی پراکتیکییەوە بەکار دەهێنن.

### ٣-٢. کردەی قسەیی

لە ڕووی تیۆری کردە قسەییەکانەوە[١١]، سروودەکە بەپێی دێڕەکانی ئەم کردانە ئەنجام دەدا:

**دێڕی یەکەم: ئەی ڕەقیب هەر ماوە قەومی کورد زوبان**
**نای ڕمێنیٚ دانەیی تۆپی زەمان**

(ئەی ڕەقیب) ئامرازی بانگکردن (ئەی) بەپێی کۆنتێکست کردەی جیاجیا ڕادەپەڕێنیٚ. واتە ئەو کارەی ئەنجامی دەدا بەپێی چوارچێوەی قسەکردنەکە دەگۆڕێت، دەشیٚ هەمان ئامرازی بانگکردن بۆ ئاگادار کردنەوە، جیاکردنەوەی کەسێك لە کۆمەڵێك، هۆشیارکردنەوە،پاڕانەوە، بەتایبەتی لە خوا و کەسە پیرۆزەکان، یان ئاراستەکردنی قسەکردن بۆ ئەو ناوەی لە دوای دیٚ، بەکاربێت. ئەم ئامرازە دەشیٚ دەرنەکەویٚ، بواری بەکارنەهێنان و دەرنەکەوتنی لە دەرکەوتنی زیاترە. وەك: دایە گیان، ئەی دایە گیان، خودایە، ئەی خودایە، دەرکەوتنی ئامرازی بانگکردن یان ئەلۆمۆرفەکانی وەك (هۆ، یا) زیاتر بۆ جەختکردنەوە و پاتکردنەوە بەکار دیٚ.

لەم سروودەدا لە دوای ئەو ئامرازە وشەی (ڕەقیب) هاتووە. وشەی (ڕەقیب) وشەیەکی عەرەبییە لە کاری (راقب) داتاشراوە و کراوە بە ناوی بکەر (اسم فاعل)[١٢] واتا ئەو کەسەی، کە چاودێری دەکا[١٣]، لە کوردیشدا دەبێتە چاودێر. لە زمانی کوردیدا بە تایبەتیش لە شیعری کلاسیکی کوردیدا بە واتای (غریم) ڕکابەر هاتووە، کاتێك، کە دوو کەس یەك مەعشووقیان دەبیٚ، ئەوا ئەو دوو کەسە دەبن بە ڕەقیبی یەکتر[١٤] بە شێوەیەك، کە ئەم دوو کەسە هەمیشە دوژمنی یەکترن. لەم سروودەشدا بە واتای دوژمن بەکار هاتووە. بۆیە (ئەی ڕەقیب) ئەرکی هۆشیارکردنەوە جێبەجیٚ دەکا. دەرکەوتن یان بەکارهێنانی ئامرازی بانگکردن بۆ جەختکردنەوەیە و هێزێکی زیاتر بە هۆشیارکردنەوەکە دەبەخشیٚ. دوژمن لە چی هۆشیار دەکاتەوە ؟ ئەوە لە دوای بانگکردنەکەوە دێت (هەر ماوە قەومی کورد زوبان).

(هەر) بە واتای تائێستا، یان هێشتا هاتووە. واتای پیتی (وشەیی) دێڕەکە ئەوە دەگەیەنێ، کە (هێشتا نەتەوەی کورد بە کوردی قسە دەکا) ئەمە بێ ئومێدی و سەرنەکەوتن بە (ڕەقیب) واتا دوژمن نیشان دەدا.. ئەوەش بە گەیاندنی هەواڵی مانەوەی گەلی کوردە بە دوژمن دێڕەکە کردەی بەرەنگاربوونەوە جێبەجێ دەکا.

(نای ڕمێنێ دانەیی تۆپی زەمان) بەپێی کۆنتێکستی شیعرەکە ئەم ڕستەیە کردەی بە سووك سەیرکردنی هەوڵەکانی ڕەقیب لە نەهێشتن و شکانی قەومی کورد زوبان جێبەجێ دەکا. دەشێ بڵێین کردەی ئامۆژگاری کردن و ئاگادار کردنەوەی ڕەقیبە، کە ئیتر هەوڵ نەدا و خۆی ماندوو نەکا، چونکە تۆپی زەمان ناتوانێ بیشکێنێ.

**دێڕی دووەم: ئێمە ڕۆڵەی ڕەنگی سوور و شۆڕشین**
**سەیریکە خوێناوییە ڕابردوومان**

لە ڕووی سینتاکسییەوە ڕستەیەکی هەواڵ گەیێنە. بەپێی تیۆرە کۆنەکانی واتا دەبێتە ڕستەیەکی وەسفی، کە وەسفی خۆیان دەکا. بەڵام لە ڕوانگەی تیۆری کردە قسەییەکانەوە، کردەی (هەڕەشە) ئەنجام دەدا هەڕەشە لە دوژمن (ڕەقیب) دەکا و پێی دەڵێ واز بێنە لەبەر ئەوەی (ئێمە ڕۆڵەی ڕەنگی سوور و شۆڕشین)، کە نەوەیەکیش لە شۆڕشدا گەورە بووبێ، ئیتر باکی نییە لە بەرەنگاربوونەوەی دوژمن. بیسەر لەم دێڕەدا ڕەقیبە. ئەوەشیان دەبێتە پەیامێکی هەڕەشە ئامێز بۆ ڕەقیب. دەشێ وەك ئامۆژگاریکردن لێك بدرێتەوە، کە ئامۆژگاری ڕەقیب دەکا و پێی دەڵێ تۆ دەتەوێ نەتەوەیەك لە ناو ببەی؟ یان (بیشکێنی)؟ کە ئەوانە نەوەی ڕەنگی سوور و شۆڕشن. ئیتر ئامۆژگاریت دەکەم واز بێنە و لەم هەوڵەت سەرکەوتوو نابی ڕستەی دوای ئەوەش (سەیریکە خوێناوییە ڕابردوومان) کاری بەڵگە هێنانەوە جێبەجێ دەکا و بە ڕەقیب دەڵێ گەر باوەڕ ناکەی، کە نەوەی ڕەنگی سوور و شۆڕشین. سەیری مێژوومان بکە، بۆ ئەوەی ئێمە بناسی، کە کێین و نەوەی کێین. ئەوا سەیری مێژوومان بکە.

**دێڕی سێیەم: ئێمە ڕۆڵەی میدیا و کەی خوسرەوین**
**دینمانە ئاینمان هەر نیشتیمان**

لەبەر ئەوەی لەم دێڕەدا گوێگر دیار نییە، بۆیە دەشێ دوو لێکدانەوەی بۆ بکرێ.

أ– ئەگەر بیسەر ڕەقیب بێ ئەوا کردەی زانیاری گەیاندن جێبەجێ دەکا، لە نیوە دێڕی یەکەم زانیارییەکی مێژوویی دەداتە ڕەقیب، کە خاوەن شکۆمەندییەکی مێژووییە و نەوەی میدیا و کەیخوسرەوە لە ڕێگای ئەم زانیارییەشەوە دەیەوێ ڕەقیب بترسێنێ، کە شەڕ لەگەڵ ئەم خاوەن شکۆیانەدا سەرکەوتوو نابێ و ناتوانێ بیانشکێنێ. نیوە دێڕی دووەمیش ، بە هەمان شێوە زانیاری بە ڕەقیب دەگەیەنێ. ئەگەرچی لە نیوە دێڕی یەکەم زانیارییەکی مێژوویی گەیاندووە، کە خاوەنی ئەم وڵاتە و ئەو شکۆمەندییە بوون. ئەوا لە نیوە دێڕی دووەم زانیاری لە بارەی هەڵوێستی ئێستای ڕۆڵەکانی میدیا و کەی خوسرەوە بەرامبەر بە نیشیتمان دەگەیەنێ، کە نیشتیمان لەلایان پیرۆزە وەکو دین و ئاینیان سەیری دەکەن.

ب– ئەگەر گوێگر(بیسەر) ڕەقیب نەبێ: ئەوا هەردوو دێڕەکە ئەرکی شانازیکردن دەگەیەنن. لە نیوە دێڕی یەکەمدا شانازی بە ڕابردوو و مێژووی کۆن و نیوە دێڕی دووەمیش شانازی بە هەڵوێستی ئێستا و خۆشەویستیی نیشتیمان دەکا.

**دێڕی چوارەم: کەس نەڵێ کورد مردووە، کورد زیندووە**
**زیندووە هیچ نانەوێ ئاڵاکەمان**

نیوە دێڕی یەکەم وەك بۆتەیەکی سینتاکسی کاری (نەڵێ) ڕستەی فرماندانی دروست کردووە. ئەگەر تەنیا پشت بە بۆتە ڕێزمانییەکە ببەستین، ئەوا ئەو کارەی ڕاپەڕاندووە دەشێ بە چەند شێوەیەك لێکبدرێتەوە، لەوانە: ( فرماندان، ناکردن، قەدەغەکردن، داواکردن، تەنانەت دەشێ بە هەڕەشە کردنیش لێکبدرێتەوە) لەبەر ئەوەی دەقەکە لە کۆنتێکستێکی کۆمەڵایەتیدا بەکار نەهاتووە. بەڵام بەپێی (مەرجی کردەکان) و کۆنتێکستی شیعرەکە دەتوانرێ

سنووری دەستنیشانکردنی کردەکان بەرتەسک بکرێتەوە. بۆنموونە: مەرجی پێشەکی فرماندان و قەدەغەکردن بریتییە لەوەی کە قسەکەر لە رووی پایەی کۆمەلآیەتییەوە یان دەسەلآت، لە گوێگر بەهێزتر بێ، نەبوونی ئەم مەرجە پێشەکییە، جگە لە مەرجێکی تری پێشەکی فرماندان، کە گوێگر دەبێ کەسی دووەم بێت. هەرچەندە لە دێڕی یەکەمدا گوێکر (ڕەقیب) کەسی دووەمە، بەلآم لەم دێڕەدا (کەس) لە (کەس نەڵێ) دەبێتە کەسی سێیەم، نەبوونی ئەم دوو مەرجە پێشەکییەی فرماندان و قەدەغەکردن و نەبوونی مەرجەکانی سەرکەوتن، کە قسەکەر دەیەوێ گوێگر کارێك ئەنجام بدا و مەرجی ناوەرۆکی، کە بریتییە لەوەی قسەکەر پێشبینی کارێکی ئایندە دەکا، کە گوێگر پێی هەڵسێ [(١٥)] یان ڕوونتر بڵێین کاردانەوەی گوێگر. گومانی ئەرکی فرماندان و قەدەغەکردن لەسەر ڕستەکە لادەبا، وامان لێ دەکا، کە بڵێین ڕستەکە کاری داواکردنی جێبەجێ کردووە. (کورد زیندووە) کاری بەڵگە هێنانەوە بۆ ڕستەی یەکەم ئەنجام دەدا، دەشێ بڵێین کاری بەرەنگاربوونەوە (تحدی)ی ئەنجام داوە، ئەمەش بەهۆی واتای ڕستەی پێش خۆی و (هەر ماوە قەومی کورد زوبان) ڕستەی دوای خۆی (نایرمێنێ دانەیی تۆپی زەمان) زیندووە هیچ نانەوێ ئاڵآکەمان. کردەی شانازیکردن بە شەکانەوەی ئاڵآ و مانەوە و زیندوویێتی نەتەوە ئەنجام دەدا. بە هەمان شێوەی دێڕی پێش خۆی ئەگەر گوێگر ڕەقیب بێ ئەوا کردەی گەیاندنی زانیاری و هەڕەشەکردن ئەنجام دەدا ئەگەر گوێگریش ڕەقیب نەبێ ئەوا شانازیکردن ڕادەپەڕێنێ.

**دێڕی پێنجەم: چەند هەزار لاوانی کوردی نەڕڕە شێر.**

**بوون بە قوربانی و هەموویان نێژران**

گوێگر لەم دێڕەدا دیار نییە، ئەگەر گوێگر ڕەقیب بێ، ئەوا هۆشیار کردنەوەی ڕەقیب دەگەیەنێ، کە هەڕەشەی شۆڕشی لێ دەکات، و بەڵگە دەهێنێتەوە، کە هەزاران لاوی دلێر و وەك شێر خۆیان لە پێناو ئەو نیشتیمانەدا کردۆتە قوربانی، کەواتە پەیامێکە بۆ ڕەقیب، کە لاوانی ئەم وڵاتە ئامادەی خۆکردنە قوربانین لە پێناو نیشتیمان یان ئازادیدا.

ئەگەر گوێگریش ڕەقیب نەبێ ئەوا دەشێ کردەی شانازیکردن بە ڕابردوو بگەیەنێ ، یان کردەی هاندان بگەیەنێ، بۆ لاوی ئێستا. واتە ئەگەر گوێگر

خوێنەرانی سروودەکە یان گوێگرانی سروودەکە لاوی کورد بن ئەوا بەرز کردنەوەی ورە و دروستکردنی ڕۆحی شۆڕشگێڕییە لەلایان.

دێڕی شەشەم: **لاوی کورد هەر حازر و ئامادەیە**

**گیان فیدایە گیان فیدا هەر گیان فیدا**

ئەم دێڕەش هەڕەشەکردن بۆ ڕەقیب و شانازیکردن بە لاوی ئێستا دەگەیەنێ.

دێڕی حەوتەم: **لاوی کورد هەستایە سەر پێ وەك دلێر**

**تا بەخوێن نەخشی بکا تاجی ژیان**

نیوە دێڕی یەکەم ئاگادارکردنەوەی ڕەقیبە، لەم بۆتەیەدا کردەکانی (هەڕەشەکردن، هۆشیارکردنەوە، ئامۆژگاریکردن)ی ڕەقیب بە شێوەیەك لەگەڵ یەکتر نزیکن، کە تێکەڵ یەکتر دەبن. بۆیە دەشێ ئەم کردانە جێبەجێ بکا. نیوە دێڕی دووەم دیاریکردنی ئامانجە بۆ ڕستەی یەکەم، کە مەبەست لە شۆڕشکردن و کۆڵ نەدانە بەرامبەر ڕەقیب.

**٣-٣. بەرگریمانە**

بەرگریمانە presupposition لە سەرچاوە کوردییەکاندا زاراوەی گریمانە پێشەکییەکانیشی بۆ بەکارهاتووە[١٦]. لە خوارەوە لە ڕوانگەی بەرگریمانەکانەوە سروودی ئەی ڕەقیب شی دەکەینەوە.

دێڕی یەکەم: **ئەی ڕەقیب هەر ماوە قەومی کورد زوبان**

**نایڕمێنێ دانەیی تۆپی زەمان**

ئەم دێرە ئەو بەرگریمانانە دەسەپێنی:

١- نەتەوەی کورد بوونی هەیە.
٢- زمانی کوردی بوونی هەیە.
٣- نەتەوەی کورد زمانی کوردی بەکار دەهێنێ.
٤- ئەو نەتەوەیە ئێستا ماوە و زیندووە.
٥- نەتەوەی کورد (یان شاعیر) دوژمن (ڕەقیب)ی هەیە.
٦- نەتەوەی کورد بەهێزە.

**دێڕی دووەم: ئێمە ڕۆڵەی ڕەنگی سوور و شۆڕشین**
**سەیریکە خوێناوییە ڕابردوومان**

١- شۆڕش بوونی هەبووە.
٢- شۆڕش نەوەیەکی پێگەیاندووە، کە ئێمەین (کوردە).
٣- ئێمە ڕابردوو (مێژوو)مان هەیە.
٤- ڕابردوو (مێژوو)مان خوێناوییە.

**دێڕی سێیەم : ئێمە ڕۆڵەی میدیا و کەی خوسرەوین**
**دینمانە ئاینمان هەر نیشتیمان**

١- میدیا و کەی خوسرەو بوونیان هەبووە.
٢- میدیا نەوەی هەبووە و نەوەکەی ئێستاش ماون و زیندوون.
٣- ئێمە (کورد) بوونی هەیە.
٤- ئێمە (کورد) دین و ئاینمان هەیە.
٥- جگە لە نیشتیمان هیچ شتێکی تر دین و ئاینی ئێمە نییە.

**دێڕی چوارەم: کەس نەڵێ کورد مردووە، کورد زیندووە**
**زیندووە هیچ نانەوی ئاڵاکەمان**

١- کورد بوونی هەیە و زیندووە.
٢- کورد ئاڵای هەیە.
٣- شاعیر (نووسەری ئەم سروودە) کوردە.

**دێڕی پێنجەم: چەند هەزار لاوانی کوردی نەڕڕە شێر**
**بوون بە قوربانی و هەموویان نێژران**

١- کورد بوونی هەیە.
٢- کورد لاوی هەیە.
٣- کورد هەزاران لاوی هەیە.
٤- لاوی کورد وەکو شێر ئازانە.
٥- چەند هەزار لاوێك بوون بە قوربانی.
٦- قوربانییەکان دەنێژرێن.

**دێڕی شەشەم: لاوی کورد هەر حازر و ئامادەیە**
**گیان فیدایە گیان فیدا هەر گیان فیدا**

١– کورد(وەك نەتەوە) بوونی هەیە.
٢– کورد لاو (شۆڕشگێڕ)ی هەیە.
٣– لاوی کورد گیانی هەیە.
٤– لاوی کورد ئامادەیە ئەو گیانەی، کە هەیەتی بەختی بکا.

**دێڕی حەوتەم: لاوی کورد هەستایە سەرپێ وەك دلێر**
**تا بە خوێن نەخشی بکا تاجی ژیان**

١– (نەتەوەی) کورد بوونی هەیە.
٢– ژیان تاجی هەیە (کە سەربەخۆییە).
٣– تاجی ژیان بە خوێن دەنەخشێنرێ (سەربەخۆیی پێویستی بە قوربانیدانە).

**٣–٤. لێکەوتەی ئاخاوتن:**

**٣ـ٤ـ١. لێکەوتەکان** (Implicatures)

ئاخێوەران دەتوانن مانایەکی زیاتر یان جیاواز دەرببڕن، لەوەی کە دەیڵێن یان دەینووسن. ئەویش بەهۆی بەکارهێنانی لێکەوتەکان، لە کاتێکدا ئەگەر بێت و بنەمای هاریکاریکردن لەبەرچاو بگیرێت.

پۆڵ گرایس یەکەم کەس بوو لەساڵی ١٩٧٥ دا ئەو حاڵەتانەی لێکدایەوە کەوا لەهەندێ باری تایبەتیدا ئەوەی کە قسەکەر مەبەستیەتی جیاوازە لەوەی، کە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ دەردەبڕێ. بۆ ئەم مەبەستەش وشەیەکی داهێنا، کە پێی دەگوترێ (لێکەوتە) (Implicature). هەروەك (جاکۆب مەی) ئاماژەی بۆ دەکات کەوا ئەم وشەیە لە لاتینییەوە وەرگیراوە لە فرمانی (Plicare)(١٧). لێکەوتە بریتییە لە مانای مەبەستدار یان پێشنیازکراو، جیاوازە لەوەی، کە دەگوترێ(١٨). بەواتایەکی تر، ئەو مەبەستەی قسەکەر دەیەوێ بیگەیەنێ (بیدا بەدەستەوە) زۆر دەوڵەمەندتر و پڕماناترە لەوەی، بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆی و بە ئاشکرایی دەردەبڕدرێت.

بەشێوەیەکی گشتی لێکەوتەکان دوو جۆرن:

١– لێکەوتە نەریتییەکان ( Conventional Implicatures)

لێکەوتە نەریتییەکان بەهۆی بەکارهێنانی چەند وشەیەکی تایبەتییەوە دروست دەبن وەك ( و،هێشتا، بەڵام، لەبەرهەندێ...هتد) کەوا ئەم وشانە مانای زیاتر هەڵدەگرن و لێکەوتە دروست دەکەن. بۆ تێگەیشتن لێیان پێویستمان بە دەوروبەر نییە[١٩].

٢– لێکەوتە ئاخاوتنییەکان (Conversational Implicatures)

لێکەوتە ئاخاوتنییەکان بۆ دروستبوون و تێگەیشتن لێیان، پشت بەدەوروبەر و بنەمای هاریکاری دەبەستن. بریتین لەو دەربڕینانەی، کە لە دەوروبەرێکی تایبەتییەوە دەردەبڕدرێن و مانایەکی زیاتر دەگەیەنن و ئەو مانایە شاراوە و مەبەستدارەش دەتوانرێ بدۆزرێتەوە بە پشت بەستن بەو دەوروبەرەی، کە دەربڕینەکەی تێدا دەردەبڕێ لەگەڵ بنەماکانی هاریکاریکردن[٢٠].

لەگەڵ ئەمانەشدا، لێکەوتە ئاخاوتنییەکان بە وەرگرتن یان لادان لە مەکسیمەکانی بنەمای هاریکاری دروست دەبن، کە ناسراویشن بە (بنەماکانی ئاخاوتنی)[٢١] و بۆ چوار جۆر[٢٢] پۆلێن دەکرێن، بنەمای چەندێتی و چۆنیەتی و شێواز و پەیوەندین.

لێکەوتەکان لە سروودی ( ئەی ڕەقیب) بریتین لەمانەی خوارەوە:

١– لێکەوتە نەریتییەکان ( Conventional Implicatures)

لەم سروودەدا تەنیا دوو لێکەوتەی نەریتی بەدی دەکرێ، کە لە دێڕەکانی یەکەم و پێنجەمدان:

وشەی ( هەر) لە (هەرماوە قەومی...) ئەوە دەگەیەنێ، کەوا تا ئیستا قەومی کورد ماوە و لە ناو نەچووە.

هەروەها لە دێڕی پێنجەمیشدا مۆرفیمی (و) لە بوون بە قوربانی و هەموویان نێژران. چەمکی کات دەگەیەنی بە شێوەی بوون بە قوربانی پاشان نێژران.

٢– لێکەوتە ئاخاوتنییەکان (Conversational Implicatures)

گرایس چوار بنەما دیاری دەکات، کە پرۆسەی هاریکاری ئاخاوتن بە ڕێوە دەبەن و بە بنەماکانی هاریکاری ناویان دەبات. لادان لەم بنەمایانە نابێتە هۆی تێکچوون و یان بەجێ نەگەیاندنی ئەرکی هاریکاری. بەڵکو بە پێچەوانەوە بە جۆرێك لە داهێنان دادەنرێ. بنەماکانیش بریتین لە: چەندێتی (quantity)، چۆنیەتی (quality)، شێواز (manner)، پەیوەندی (relation)، لە خوارەوەش هەردوو شێوەی پابەندبوون (وەرگرتن) و لادان لە بنەماکان لەم سروودەدا دەخەینە ڕوو.

**أ. پابەندبوون بە بنەماکان.**

لەم سروودەدا ئەم پابەندبوونانەی خوارەوە بەدی دەکرێ.

١. **بنەمای چۆنیەتی** : ئەوەی کە دەوترێ دەبێ ڕاست بێ:

دێڕی یەکەم: (ئەی ڕەقیب هەر ماوە قەومی کورد زوبان)

قسەکەر بنەمای چۆنیەتی وەرگرتووە، ئەو شتەی گوتووە، کە ڕاستییە و بەڵگەشی هەیە کەوا قەومی کورد زوبان هێشتا ماون و زیندوون و لەناو نەچوون.

دێڕی پێنجەم: **چەند هەزار لاوانی کوردی نەڕڕە شێر**
**بوون بە قوربانی و هەموویان نێژران**

شاعیر ئەوەی دەیڵێ ڕاستییە و چەندین هەزار لاوی کوردی ئازا و دلێر بوونەتە قوربانی و ئێستا نەماون و نێژراون.

٢. **بنەمای چەندیەتی:** پێویستە بڕی پێویست زانیاری بخرێتە ڕوو، نەزیاتر نەکەمتر لەوەی کە پێویستە بگوترێ.

دێڕی سێیەم: (ئێمە ڕۆڵەی میدیا و کەی خوسرەوین)

لێرەدا زۆر بە کورتی و پوختی شاعیر باسی قەومی کورد دەکا کە ڕەچەڵەکیان کێیە مێژووی دەوڵەتی میدیا و دامەزرێنەری ئەو دەوڵەتە، کە کەیخوسرەوە، بەدێڕێك باس دەکا.

٣– بنەمای پەیوەندی: پێویستە ئەوەی دەوترێ ، پەیوەندی هەبێ بەوەی کە پێشتر دەربڕاوە.

شاعیر لە بنەمای پەیوەندی لانادا ئەوەی دەیڵێ لە یەکەم دێڕەوە تا کۆتا دێڕ پەیوەندییان بەیەکەوە هەیە کە باس لە نەتەوەی کورد دەکا .

**ب. لادان لە بنەماکان:**

**لەم سروودەدا ئەم لادانانە بەدی دەکرێ:**

**١. بنەمای چۆنیەتی :**

دێڕی یەکەم: **ئەی ڕەقیب هەر ماوە قەومی کورد زوبان**

**نایڕمێنێ دانەیی تۆپی زەمان**

دەربڕینی تۆپی زەمان بە شێوەی میتافۆر بەکارهاتووە کەوا " زەمان" تۆپی هەیە--- لێرەدا وشەی تۆپ ئەوە دەگەیەنێ کەوا چەند تایبەتمەندییەکی هەیە وەك " بەهێزی" ، وێرانکەری " و هتد، کە شاعیر دەڵێ " نای ڕمێنێ تۆپی زەمان" ئەمەش بە مەبەستی کەمکردنەوەی بەهای ئەو تۆپە بەکارنەهاتووە، بەڵکو بە مەبەستی بە هێزی و خۆڕاگریی نەتەوەی کورد هاتووە. کەوا تەنانەت تۆپیش ناتوانێ تێکی بشکێنێ. لێرەدا دەکرێ ئەوەش وا لێك بدرێتەوە کە کات، مێژوو، زەمەن، نەیتوانیوە کورد لەناو ببات. ئەو هەموو کارەسات و ژێردەستییەی بە سەریدا هاتووە لەگەڵ ئەوەشدا هەر ماوە و هەر دەمێنی و چەرخی زەمانە کورد نارمێنی.

دێڕی دووەم: **ئێمە ڕۆڵەی ڕەنگی سوور و شۆڕشین**

**سەیریکە خوێناوییە ڕابردوومان**

(ئێمە ڕۆڵەی ڕەنگی سوور و شۆڕشین) لادانی زمانی لەوە هاتووە، کە ڕەنگی سوور و شۆڕش وەك شتی زیندوو وەك پەروەردەکەر هەڵسوکەوتی لەگەڵ کراوە. ئەم واتا زیادەیەی، کە لەو دێڕەدا دەست دەکەوی ئەوەیە، کە شۆڕش پەروەردەکەری ئێمە بووە. ئێمە پەروەردەیەکی شۆڕشگێڕی و بە گژداچوونەوەی ڕەقیبانمان هەیە. میتافۆر لەم دێڕەدا هەیە **ڕەنگی سوور و شۆڕش** وەك شتی بەگیان هەڵسوکەوتیان لەگەڵ کراوە، کەوا ئێمە ڕۆڵەی ئەوانین.

دێڕی سێیەم: **ئێمە ڕۆڵەی میدیا و کەی خوسرەوین**

**دینمانە ئاینمان هەر نیشتیمان**

شاعیر، کە دەڵێ ( دینمانە ئاینمان هەر نیشتیمان) لە بنەمای چۆنیەتی لایداوە. لادان لەم بنەمایە دەبێتە هۆی لێکەوتەی ئاخاوتنی و بەخشینی واتایەکی زیاتر لەوەی، کە لە وشە و ڕستەکەدا هەیە. ئەم ڕستەیە ئەوەی لێ دەکەوێتەوە، کە دین و ئاین لەلای ئێمە زۆر خۆشەویست و بەرزە لە هەموو شتێك زیاتر ڕێزی لێ دەگیرێ. ئیتر کە باس لە خۆشەویستی و بەرزیی هەستی نەتەوەی کورد دەکا بەرامبەر بە نیشتیمان. ئەوەی لێ هەڵدەهێنجرێ، کە وەك دین و ئاین خۆشەویستە. هەستی خۆشەویستی نیشتیمان لەلای نەتەوەی کورد (چونکە جێناوی کەسی سێیەم –مان– بەکاردەهێنی) بە هەستی خۆشەویستی ئایین دەچوێنی. هەروەك چۆن لە کوردیدا زۆر دەربڕینی وەکو ( جەرگەکەم ، تۆ دڵی منی ، ڕۆحەکەم... هتد بە کار دەهێنرێ). لادان لەم دەربڕینەدا بەو شێوەیە دروست بووە کە نیشتیمان دین و ئاین نییە . ئەو نیشتیمانی بە دین و ئاین داناوە ئەمەیان دەبێتە لادان لە بنەمای چۆنیەتی. چونکە چۆنیەتی ئاین جیاوازە لەگەڵ چۆنیەتی نیشتیمان. بەڵام بە هۆی ئەو لادانە داهێنانی دروست کردووە و واتایەکی زیاتر بە خوێنەر دەگەیەنێ، کە ئەویش ئەوەیە دین و ئاین لە لووتکەی بەرزی و پیرۆزیدان لەلای کورد.

دێڕی پێنجەم: **چەند هەزار لاوانی کوردی نەڕڕە شێر**
**بوون بە قوربانی و هەموویان نێژران**

میتافۆر بەکارهاتووە " نەڕڕەشێر" لاوانی کورد بە شێر چوێنراوە، کە دەنگیان وەك نەڕڕەی شێر وایە ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کەوا " لاوانی کورد بەرامبەر دوژمن بەهێزن و ترس دروست دەکەن و هتد.

دێڕی حەوتەم: **لاوی کورد هەستایە سەرپێ وەك دلێر**
**تا بە خوێن نەخشی بکا تاجی ژیان**

لە دەربڕینی ( تا بەخوێن نەخشی بکا تاجی ژیان) لادان لە بنەمای چۆنیەتی بەدی دەکرێ. بەکارهێنانی خوێن بۆ نەخشکردن. بەکارهێنانی تاجی ژیان ئەمانە وەك لادان، داهێنانێکی زمانی دروست کردووە واتایەکی زیاتر دەبەخشی لەوەی کە لە دێڕەکەدا هەیە. کە ئەویش سەربەخۆیی و ئازادی بە

تاجی ژیان چوواندووە. ڕازاندنەوەی ئەو تاجەش پێویستی بە قوربانیدان و خوێن بەخشین هەیە.

۲. **بنەمای چەندیەتی:**

دێڕی پێنجەم: **چەند هەزار لاوانی کوردی نەڕڕە شێر**
**بوون بە قوربانی و هەموویان نێژران**

بە بەکارهێنانی (**چەند هەزار**...) ناتوانرێ ڕێژەکە دیاری بکرێ کەوا لاوانی کورد ژمارەیان چەند بووە. بەدیاری نەکردنی ژمارە بەم شێوەیە شاعیر لە بنەمای چەندیەتی لادەدات و ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ، کەوا یان ژمارەکە نازانێ ، یان ژمارەی ئەو لاوانە هێندە زۆرە کە ناتوانرێ بەهەزاریش لەقەڵەم بدرێ بۆیە دەڵێ چەند هەزار لە هەزاریش زیاترن.

۳.**بنەمای شێواز:**

ئەوەی دەگوترێ دەبێ ڕوون بێ (کورت و پوخت بێ و لە لێڵی دووربێ).

لە زمانی شیعریدا لادان لە بنەمای شێواز هەیە ئەویش بە هۆی درێژدادڕی یان بەهۆی بەکارهێنانی وشەی لێڵ .

۱. درێژدادڕی.

شاعیر چەند جارێك دەڵێ (کەس نەڵێ کورد مردووە کورد زیندووە) وەك لە دێڕەکانی چوارەم و هەشتەم:

۲. بەکارهێنانی وشەی لێڵ (نا ڕوون)

دێڕی یەکەم: **ئەی ڕەقیب هەر ماوە قەومی کورد زوبان**
**نای ڕمێنێ دانەیی تۆپی زەمان**

وشەی " دانەیی" ڕوون نییە لەڕووی واتاییەوە کە واتای چی دەگەیەنێ بۆ گوێگر یان خوێنەر و هەروەها وشەی " کەس" ئایا شاعیر مەبەستی لە کەس کێیە؟؟ کەسەکان دیار نین لەوانەیە چەندین لێکدانەوەی جیاوازی بۆ بکرێ.

**٣–٥. نیشانە پراگماتیکییەکان: (Deixis)**

نیشانە پراگماتیکییەکان (Deixis) لە زمانی یۆنانییەوە وەرگیراوە و مانای ئاماژەکردن (بۆ شتەکان) بەهۆی بەکارهێنانی زمانەوە دەگەیەنێ[٢٣]. وە دەیڤد کریستاڵ زیاتر ڕوونی دەکاتەوە و دەڵێت نیشانە پراگماتیکییەکان پەیوەندییان هەیە بەو دەوروبەرەی، کە تێیدا بەکاردێ[٢٤].

نیشانە پراگماتیکییەکان بە شێوەیەکی گشتی بریتین لە: نیشانە کەسییەکان، نیشانەکانی شوێن، نیشانەکانی کات، نیشانە کۆمەڵایەتییەکان. بۆ نموونە لێکدانەوەی مانای نیشانە کەسییەکانی وەك ڕاناوی کەسی ( من –تۆ) دەگۆڕدرێ بەگۆڕانی قسەکەر–گوێگر (یان نووسەر و خوێنەر).

لە خوارەوەش بەپێی ئەو نیشانانە دەقی سروودەکە شی دەکەینەوە.

دێڕی یەکەم: **ئەی ڕەقیب هەر ماوە قەومی کورد زوبان**
**نایڕمێنێ دانەیی تۆپی زەمان**

(ڕەقیب) نیشانەی کەسییە و ئاماژەیە بۆ دوژمن، بەڵام ئاماژە پێکراو ڕوون نییە. ساڵانی (١٩٣٩– ١٩٤٠)، کە ئەم سروودەی تێدا نووسراوە. بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد کۆمەڵێ دوژمنی هەبووە، وەك ناسیۆنالیستە کوردەکان دەڵێن: ئەو کات حکومەتەکانی: ئێراق، ئێران، تورکیا، سوریا، هەروەها بەریتانیا و هێزە جیهانییەکانیش دۆستی کورد نەبوون، لێرەدا پرسیارێك دروست دەبێت، ئایا ڕەقیب ئاماژەیە بۆ کامیان؟ بە تایبەتی لەبەر ئەوەی بە تاك بەکار هاتووە و شێوەی کۆ (ئەی ڕەقیبان)ی وەرنەگرتووە. بۆیە لێرەدا دوو لێکدانەوە دروست دەبێت، واتە ئاماژە بۆکراو دوو ئەگەر هەڵدەگرێ.

١– هەر چوار دەوڵەتی (ئێراق، ئێران، تورکیا، سوریا) و تەنانەت دوژمنەکانی تریش بە یەك هێز و بە یەك دوژمن دادەنێ و لە خاڵێکدا هەموویان کۆ دەکاتەوە، کە دژایەتی بە دەوڵەتبوون یان سەربەخۆیی کوردستانن و لەوەدا کۆکن و وەك یەك هێز و یەك کەسایەتی مەعنەوی لەبەرچاوی شاعیر دەردەکەون. هەر بۆیەش شاعیر بە تاك ناوی هێناون. ئەم ئەگەرە بێ هێزە بە تایبەتی لەبەر ئەوەی چەمکی بەرەنگاربوونەوەی تێدایە و خۆڕاگری کورد نیشان دەدا، ئیتر شاعیر لەو بارانەدا زێدەڕۆیی دەکات و ڕێژەی کۆ بەکار دەهێنێ. ڕەقیبان یان

دوژمنــان ، ئــەو کاتــە ئــەوەی دەگەیانــد، کــە بەرامبــەر هــەر هــەموو دوژمنــەکان دەوەستێتەوە.

٢– ئەگــەری دووەم ئەوەیــە، شــاعیر لــە چوارچــێوەیەکی بچــووکتر بــیری کردۆتەوە و ئەو واقیعەی، کە تێیدا ژیاوە لە کوردستانی باشووردا بووبێتە هەوێنی ئــەو ســروودە و بــەم پێیــە وشــەی (ڕەقیــب) بەتــەنیا ئامــاژە بــێ بــۆ (حکومــەتی عێراقی). لەم بارەشدا لە بەهای نەتەوەیی شیعرەکە دێتە خوارەوە.

(هەر) نیشانەی کاتە، چەمکی لە کۆنەوە تا ئێستا و بــەردەوامی دەگەیــەنێ. واتە ئێستاش بەردەوامە لە ژیاندایە.

(کورد زوبان) ئاماژەی کەسییە بۆ نەتەوەی کورد و ئەوانەی ، کە بە کــوردی قسە دەکەن.

دێڕی دووەم: **ئێمە ڕۆڵەی ڕەنگی سوور و شۆڕشین**

**سەیریکە خوێناوییە ڕابردوومان**

ئێمە ئاماژەی کەسییە ، کەسی یەکەمی کۆ بۆ کورد دەگەڕێتەوە.

دێڕی سێیەم: **ئێمە ڕۆڵەی میدیا و کەی خوسرەوین**

**دینمانە ئاینمان هەر نیشتیمان**

ئێمە ئاماژەی کەسییە ، کەسی یەکــەمی کــۆ بــۆ کــورد دەگەڕێتەوە.(میــدیا) ئاماژەیــە بــۆ نەتــەوەی میدییــەکان، کــە ٧٠٠ســـاڵ پــیش زایــن لــەم هەرێمــەدا (کوردستانی ئێستا) ئیمپراتۆریەتیان دامەزراندووە[٢٥]. (کەی خوسرەو) ئاماژەیــە بۆ یەکێك لە پاشاکانی میــدی (کــەی ئەخســار)[٢٦] بــە دامەزرێنــەری دەوڵــەتی مــاد دادەنرێ. (نیشتیمان) نیشانەی شوێنە ئاماژەیە بۆ کوردستان.

دێڕی چوارەم: **کەس نەڵێ کورد مردووە، کورد زیندووە**

**زیندووە هیچ نانەوێ ئاڵاکەمان**

(کورد) نیشانەی کەسییە بۆ نەتەوەی کورد. (هیچ) نیشانەی کاتە. واتە هیچ کاتێك لە داهاتوودا، چەمکی بەردەوامی هەیە، لە ئێستاوە تا کۆتایی.

دێڕی پێنجەم: **چەند هەزار لاوانی کوردی نەڕڕە شێر**

**بوون بە قوربانی و هەموویان نێژران**

(لاوانی کورد) نیشانەیە بۆ نەوەی گەنجی کورد. (هەموویان) نیشانەیە بۆ لاوانی کورد.

دێڕی شەشەم: **لاوی کورد هەر حازر و ئامادەیە**

**گیان فیدایە گیان فیدا هەر گیانفیدا**

(لاوی کورد) نیشانەیە بۆ نەوەی گەنجی کورد. ( هەر) نیشانەی کاتە بە واتای هەمیشە و بە بەردەوامی.

دێڕی حەوتەم: **لاوی کورد هەستایە سەرپێ وەك دلێر**

**تا بە خوێن نەخشی بکا تاجی ژیان**

(لاوی کورد) نیشانەیە بۆ نەوەی گەنجی کورد.

لە خوارەوەشدا لە شێوەی خشتەیەکدا پەیوەندییەکان دەخەینە ڕوو:

| ژمارە | دێر | جۆری نیشانە | کەرەستە |
|---|---|---|---|
| 1 | 1 | کەسی | ڕەقیب |
| 2 | 1 | کات | هەر |
| 3 | 1 | کەسی | کورد زوبان |
| 4 | 2 | کەسی | ئێمە |
| 5 | 3 | کەسی | ئێمە |
| 6 | 3 | کەسی | میدیا |
| 7 | 3 | کەسی | کەی خوسرەو |
| 8 | 3 | شوێن | نیشتیمان |
| 9 | 4 | کەسی | کورد |
| 10 | 4 | کات | هیچ |
| 11 | 5 | کەسی | لاوانی کورد |
| 12 | 5 | کەسی | هەموویان |
| 13 | 6 | کەسی | لاوی کورد |
| 14 | 6 | کات | هەر |
| 15 | 7 | کەسی | لاوی کورد |

**خشتەی (٥) نیشانە پراگماتیکییەکان لە سرووودی ئەی ڕەقیبدا**

| جۆری نیشانە | ڕێژەی بەکارهینان | ڕێژەی سەدی |
|---|---|---|
| **کەسی** | 11 | %73 |
| **کات** | 3 | %20 |
| **شوێن** | 1 | %7 |
| **کۆمەڵایەتی** | 0 | %0 |

**خشتەی (٦) ڕێژەی بەکارهێنانی نیشانە پراگماتیکییەکان**




**هێڵکاری (٢). ڕێژەی بەکارهێنانی نیشانە پراگماتیکییەکان**

## ٤. بەشی سێیەم: لێکدانەوەی گشتی

### ٤–١. ئەی ڕەقیب لە نێوان نیشتیمان و نەتەوەدا.

سروودی ئەی ڕەقیب تا ئێستاش ڕەهەندێکی نیشتیمانی نییە، بەڵکو ڕەهەندێکی نەتەوەیی هەیە، ئەوەی سەرنجڕاکێشە ئەوەیە، کە هیچ نەتەوەیەك (بەپێی زانیاریی لێکۆڵەران) سروودی نەتەوایەتی فەرمییان نییە. نەتەوە جیاجیاکان لە چوارچێوەی نیشتیماندا سروودی تایبەت بە خۆیان هەیە. بۆ نموونە نەتەوەی عەرەب زیاتر لە (٢٠) وڵاتیان هەیە هەر یەك لەو وڵاتانە سروودی نیشتیمانی تایبەت بە خۆیان هەیە، بەڵام وەك عەرەب سروودێکی نەتەوەییان نییە[٢٧]. کەچی پێچەوانەی وڵات و نەتەوەکانی تر، کورد سروودی نەتەوایەتی هەیە، بەڵام سروودی نیشتیمانی نییە. ئەم دیاردەیەش بۆ هۆکاری مێژوویی و سیاسی دەگەڕێتەوە.

کورد ئەگەرچی کوردستانی بە نیشتیمانی خۆی داناوە، بەڵام وەك چوارچێوەیەکی ئیداری و سیاسی خۆی خاوەنی نەبووە. بەڵکو بەسەر چەند وڵاتێکی تردا (عیراق. سوریا، تورکیا. ئێران) دا دابەش کراوە. ئیتر وەك نەتەوەش پێویستی بەو ڕەمزە نەتەوەییە یان نیشتیمانییە هەبووە. شۆڕشەکانی ڕزگاریخوازی وەك پێداویستییەکی مەعنەوی و سیاسی پێویستی بەم ڕەمزە هەبووە. ئیتر هەردوو ڕەمزی (ئاڵا و سروود) وەك پێویستییەکی قۆناغەکە هاتۆتە ئاراوە.

لە ئەنجامی باوەڕی قووڵ بە یەکێتی خاکی کوردستان و یەکێتی نەتەوەیی کورد و ڕەتکردنەوەی ئەو دابەشکردنە زۆرەملێیە، کە بەسەر کوردستاندا سەپێنرابوو، ئەم سروود و ئاڵایە لە غیابی نەبوونی نیشتیمان وەك ڕەمزی نەتەوەیی هاتۆتە بەرهەم. واتە بۆ نیشتیمانێك لە داهاتوودا. کە کورد خۆی خاوەنی بێ.

جگە لە باوەڕی ڕۆشنبیر و سیاسییە کوردەکان بە یەکێتی خاکی نیشتیمان. وەك گوتارێکی میللی ئەم باوەڕە ڕەهەندێکی میللی هەبووە. دەستبەرداربوونی یان دانپێنەنانی وەك تاوانێکی نەتەوەیی تا ئێستاش لەلایەن کۆمەڵگاوە سەیر دەکرێ. بۆیە بیر لە ئەلتەرناتیف بۆ سروودی نیشتیمانی لە نێو پارچەکانی کوردستاندا نەکراوەتەوە.

هەرچەندە بوونی سروودی نەتەوەیی نائاسابییە و نەبووە بە باو، ڕەنگە کورد تاکە نەتەوەبێ (بەپێی زانیاریی لێکۆڵەران)، کە سروود و ئاڵای نەتەوایەتی هەبێ. بەڵام ئەوەی دیاردەکە نائاساییتر دەکا، ئەوەیە، کە کۆمەڵێ پرسیاری لەلای سیاسی و ڕۆشنبیرانی کورد بە بێ وەڵامی دەهێڵێتەوە. واتە ئەگەرچی بوونی ئەم دیاردە دەگمەنە ببێتە مایەی شانازی، تەنانەت ئەگەر لەبەر خودی دەگمەنییەکەش بێ. ئەوا دەبێتە مایەی کۆمەڵێ گرفتی تیۆری، کە ڕەنگە سیاسی و ڕۆشنبیرەکانیش چارەسەرێکیان بۆی نەبێت. لەوانە:

١– مێژووی بڵاوبوونەوەی ئەو سرووده بۆ ناوەڕاستی سەدەی بیستەم دەگەڕێتەوە، یەکەم جاریش بە فەرمی لە کۆماری کوردستان ساڵی ١٩٤٥ دا بەکار هێنراوە. ئەوکات داهاتووی کوردستان لێڵ بوو و پێشبینیکردنی ئاسان نەبوو. بەڵام ئێستا بارودۆخی سیاسیی ناوچەکە و کوردستانیش گۆڕاوە. بە تایبەتی لە هەرێمی کوردستانی عیراقدا. کە ئازادیی سیاسی بەپێی دەستوورێك، کە کورد خۆی بەشێك بووە لە دانانی و دەنگی پێداوە بەدی دەکرێ. کە لە شێوەی فیدراڵی لە عیراقدا دەژی. لەلایەکی ترەوە، بەشی کوردستانی ژێر دەسەڵاتی تورکیا، کە پێشتر قسەکردن بە زمانی کوردی قەدەغە بوو. ئێستا بەرەو پێش چوونی سیاسی و ڕۆشنبیری بەخۆیەوە بینیوە. پێشبینی دەکرێ، کە لە داهاتوویەکی نزیکدا کۆمەڵێ مافی نەتەوەیی بەدەست بهێنن. لە داهاتوودا ئەگەر بەشەکانی تری کوردستان (سوریا، تورکیا، ئێران) بە شێوەیەکی فەرمی مافی ئەوەیان بە دەست هێنا ،کە ئاڵای هەرێمایەتی و سروودی تایبەت بە خۆیان هەبێ. ئایا دەشێ لە چوار هەرێمی سەر بە چوار دەوڵەتی جیاواز هەمان سروود بەرقەرار بێ و بەکار بێت؟ ئایا چەمکی ڕەمزییەت تا چ ڕادەیەك بەو هەرێمانە دەبەخشێ؟ یان لە پەیوەندییە دبلۆماسی و ڕۆشنبیری و تەنانەت وەرزشییەکانیشدا چ جیاکەرەوەیەکی ڕەمزی لە نێوانیاندا دەبێت؟. بۆنموونە دوو شاندی دبلۆماسی یان دوو سەرکردەی دوو هەرێمی جیاواز یان دوو تیپی وەرزشی، کە پێویست بێ سروودی نیشتیمانی بۆ بۆنەکانیان لێ بدرێ. ئایا چ جیاوازییەك دەبێتە هێمای هەرێمایەتی؟. یان لە کاتی پێشوازیکردنی فەرمی و گوتنی سروودی نیشتیمانی ئایا دەکرێ هەمان سروود بۆ هەردوو هەرێم بگوترێت.

یان لە بەیەکگەیشتنی دوو هەڵبژاردەی یارییەکی وەرزشی دەشێ هەمان سروود بۆ دوو تیپی دژ بەیەك بەکار بێت. بە تایبەتیش لەلایەن هاندەرانەوە؟

٢– سروود پەیوەندیی بە چوارچێوەیەکی ئیداری – سیاسییەوە هەیە، پەیوەندیی بە دەسەڵاتی کارگێڕی و شکۆمەندیی ناوچەیەکی جوگرافییەوە هەیە. بەڵام ئەو چوار بەشەی کوردستان یەك چوارچێوەی ئیداری و سیاسی و دەسەڵاتی نییە. هەرچەندە وەکو بیرکردنەوەی میللی ئەوە ئاواتی کوردە. بەڵام ئەوەی نزیکترە لە واقیع ئەوەیە، کە لە دوارۆژیشدا دەبن بە چەند وڵاتێکی جیاواز جا سەربەخۆ بن یان لە چوارچێوەی ئەو وڵاتەی تێیدا دەژین خودموختاری یان فیدراڵی و کۆنفیدراڵی بەدەست بهێنن. ئەوکاتیش ئەم سروود و ئاڵایە تەنیا یەکێکیان دەتوانێ بە کاری بهێنێ. ئەگەر لایەنی مێژووییش بکرێ بە بنەما ئەوا ئەم سرووده بە شێوەیەکی فەرمی سەرەتا لە کۆماری کوردستان (رۆژهەڵات) بەکار هاتووە، هەرچەندە شاعیرەکە خەڵکی باشووری کوردستان، و سەرەتا لە حزبی هیوا بەکار هاتووە، بەڵام زیاتر مافی رۆژهەڵاتی کوردستانە کە بەکاری بهێنێ چونکە وەك فەرمی یەکەم جار لەوێدا بەکار هێنراوە.

٣– لە کوردستانی عێراقدا سروودی ئەی ڕەقیب ئێستا بەکاردێ. کە سروودێکی نەتەوەییە و تەنیا و تەنیا گوزارش لە هەستی نەتەوایەتیی کورد دەکا. لە کاتێکدا لە هەرێمی کوردستانی عێراقدا بە فەرمی دان بە بوونی نەتەوەی تری وەك: تورکمان و ئاشووری و کلدان ...هتد نراوە، چۆن دەشێ ئەوانیش لە بۆنە نیشتیمانییەکاندا وەك کورد بڵێن ( ئێمە رۆڵەی میدیا و کەی خوسرەوین) ئەو سرووده چ هەستێکی نیشتیمانی بەو نەتەوە جیاوازانە دەبەخشێ؟ کە کورد نیین. ئایا تورکمانێك یان عەرەبێك چ بارێکی دەروونی لەلا دروست دەبێت؟ یان چۆن سۆزی نیشتیمانی خۆی لەوەدا دەربڕێ، کە دەڵێ (کەس نەڵێ کورد مردووە کورد زیندووە)؟ یان منداڵەکانیان لە قوتابخانە تایبەتییەکانیاندا، کە بە زمانی خۆیان دەخوێنن دەشێ هەمان سروود لەبەر بکەن و پێی گۆش بکرێن.

٤– کورد لە سەرتاسەری جیهاندا (ئوستراليا، کەنەدا، ئەوروپا..) ئەم سرووده بە ڕەمزی خۆی دادەنێ. بەدەر لە سنووری جوگرافی، بەڵام هاونیشتیمانییەکی کوردستان، کە سەدان ساڵ لە کوردستان دەژی، ئەگەر کورد

نەبێ ناتوانێ ئەو هەست و سۆز و بە سیمبولبوونە وەك کوردەکانی دەرەوەی کوردستان بۆ سروودەکە هەبێ.

**٤–٢. ئەی ڕەقیب و بە سیمبولبوون**

لە دوای جەنگی جیهانی یەکەمەوە ناوچەکە بە گشتی و کوردستان بە تایبەتی گۆڕانێکی زۆری بەسەردا هات. بیری ناسیۆنالیزم لە گەشەکردندا بوو. لە ئاستی تاك (ڕۆشنبیر و سیاسییەکان) بەرەو بە میللیبوون و سەرتاسەری کۆمەڵ بڵاو دەبۆوە. بیری ڕزگاریخوازی و بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانە لە برەودا بوو، بە تایبەتیش لە جەنگی دووەمی جیهانی گەیشتە ئاست و قۆناغێکی تر. لەم ماوەیەشدا کوردستان بە بارودۆخێکی سیاسی و نەتەوەیی زۆر خراپدا تێدەپەڕی. تەنانەت بە شێوەیەك، کە خۆی خاوەنی هیچی خۆی نەبوو: نە خاك، نە ئابووری، نە زمان... هتد. هەمیشەش بزووتنەوە ڕزگاریخوازەکان وەك بزووتنەوەی بارزانییەکان و خۆپیشاندانەکانی سلێمانی.. لە ژێر ئاگر بارانی فڕۆکەکانی ئینگلیز و ستەمی دەوڵەتی عێراقی بوو. لە پاڵ ئەوەشدا باوەڕ و گوتار و هەستی نەتەوایەتی وەك کاردانەوەیەك بۆ ستەمە نەتەوەییەکان ڕۆژ بە ڕۆژ لە هەڵکشاندا بوو. ئیتر کورد پێویستی بە هەندێ هۆکار هەبوو بۆ ئەوەی بوونی خۆی لە رووی سیاسییەوە بسەلمێنێ. یان ڕاستتر بڵێین پێویستی بە هەندێ ڕەمز هەبوو بۆ ئەوەی وەك نەتەوەیەك خۆی تێیدا ببینێتەوە. هەر بۆیە وەك کاردانەوەیەکی سروشتی و هەستێکی میللی هەندێ هەنگاوی لەم ڕووەوە هاویشتووە. وەك پاراوکردنی زمانی کوردی، و دانانی سروودی نەتەوەیی. ئەم سرووده ئەگەرچی چەمکی ناوەوە و واتای لێکسیم و ڕستەکانی ڕەنگە لەگەڵ پێشوەچوونی قۆناغی ئێستای هەرێمی کوردستانی عیراقدا نەگونجێ، ڕەنگدانەوەی بارودۆخی ئەوکاتی کوردستانە، کە لێوانلێوە لە بەرەنگاربوونەوە و دانبنان بە مانی نەتەوەی کورد سەرەڕای سادەیی وشە و دەربڕینەکانی، بەڵام بۆ سەلماندنی بوونی خۆی هێمایەك بوو. بۆ بەرەنگاربوونەوەش ڕەمزێك بوو. تەنانەت بە شێوەیەك، کە ئەو کوڕە کوردانەی لەسەر بیری نەتەوەیی بەرەو پەتی سێدارە دەبران بەو سرووده بەرەنگاری مەرگ دەبوونەوە. بەهۆی ئەم سروودەوە شکۆمەندیی خۆیان و

نەتەوەیان بەو ڕژێمە نیشان دەدا ، کە لە سێدارەی دەدان. بۆیە ئەم سرووده بووە بە ڕەمزێکی نەتەوەیی و بایەخ و بە ڕەمزبوونی تەنیا لە واتای وشەو دەربڕینەکانەوە نایەت، بەڵکو لە مێژووی قوربانیدان و خوێنی ئەو شەهیدانەوە دێت، سروودەکە ئەرشیفێکە بۆ واتای هەموو ئەو نەهامەتی و فیداکاریی خەباتە نهێنی و شۆڕشە ئاشکراکانی کورد، کە لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمەوە تا ئەمڕۆ دەگرێتە خۆی. بایەخی لە واتا ناوەکییەکەوە نایەت بەڵکو لە هەستە ناوەکییەکەوە دێ.

**٤–٣. ئەی ڕەقیب و سەردەم**

سروودی ئەی ڕەقیب لە کاتێکدا لە دایك بوو، کە چەمکی بەرەنگاربوونەوە و شۆڕش بنەما بوو و پێویست بوو لە سروودەکەدا ڕەنگ بداتەوە. ئەگەرچی واتای وشە و ڕستەکان و واتای پراگماتیکی دەقەکە بۆ ئەو قۆناغەی ئێستای هەرێمی کوردستانی عێراق دەتوانرێ بگوترێ، کە لەبار نییە، چونکە لە قۆناغی شۆڕش و مانەوە و پاراستنی نەتەوە دەرچووە. ئێستا لە قۆناغێکدایە، کە پەیوەندیی دیپلۆماسی بە دونیای دەرەوەی خۆی دەبەستێ وەك بوونی دەیان کونسوڵخانە لە پایتەختی هەرێم و بوونی زانکۆ و پەرلەمان ...هتد کوردی گەیاندۆتە کەناری ئارامی، کورد لە هەرێمی کوردستاندا تەنیا سەیری ئەوە ناکا، کە (نەوەی شۆڕش و ڕابردووی خۆیناوییە) ( ئێمە ڕۆڵەی ڕەنگی سوور و شۆڕشین.. سەیری کەن خۆیناوییە ڕابردوومان)ی بەڵکو زیاتر سەیری داهاتووی دەکا. هەنگاوی پڕ متمانەی بۆ دەهاوێ. هەر لە ئاوەدانکردنەوەی ژێرخانی ئابووری و پتەوکردنی دیموکراتی تا دەگاتە پەیوەندییە دیپلۆماسییەکان.

**٤–٤. ئەی ڕەقیب لە نێوان واتا و بەڕەمزبووندا؟**

ئەوەی لێرەدا کێشە دروست دەکا لە نێو هەردوو جەمسەری لایەنگران و نەیارانی ئەی ڕەقیب ئەوەیە بە بڕوای نەیارانی سروودی ئەی ڕەقیب بۆ ئەو قۆناغەی ئێستا لەبار نییە. ناوەڕۆکە واتاییەکەی دەمێکە سەردەمی بەسەر چووە. تەنانەت وەك ئیدیۆمیش بۆ کارێك یان هەستێك بەکار دێت، کە لە

سەرەتادا بێت و هێشتا گەشەی نەکردبێ. دەگوترێت ( هێشتا لە قۆناغی ئەی ڕەقیبە) ئەم ئیدیۆمە چەمکی ئەوە دەگەیەنێ، کە تازە دەست پێ کراوە.

دیارە نەیارانی سروودەکە لە گۆشەنیگای واتای وشە و ڕستە و چەمکە پراگماتیکییەکەی ئەو بڕیارە دەدەن، بەڵام لایەنگرانی سروودەکە لە ڕوانگەی ڕەمزییەت و بەها مێژووییەکەیەوە پابەندبوونی خۆیان بە سروودەکە دەبیننەوە.

## ٤-٤. پێشنیاز

بە بۆچوونی ئەم لێکۆڵینەوەیە کێشەی نێوان ئەم دوو جەمسەرە دژ بەیەکە بەو شێوەیە چارەسەر دەبێ، کە سروودی ئەی ڕەقیب وەك سروودێکی نەتەوەیی بمێنێتەوە و لە پاڵ ئەوەشدا سروودێکی نیشتیمانی بۆ هەرێمی کوردستانی عێراق دابنرێ، لەبەر ئەم هۆیانە:

١-ئەگەرچی هەرێمی کوردستانی عێراق قۆناغی شۆڕشی بڕیوە، بەڵام بەشەکانی تری کوردستان تا ئێستاش لە قۆناغێکدان پێویستییان بە سروودی ئەی ڕەقیبە. لەبەر ئەوەی لە قۆناغی شۆڕشی ڕزگاریخوازیدان.

٢- ئەو سرووده لە هەرێمی کوردستانی عێراقیشدا چەمکێکی دەروونی کۆمەڵایەتی وای هەیە، کە توانیویەتی ببێتە ڕەمز. لادانی ڕەمز و گۆڕینی بە ڕەمزێکی تر، کە ڕەهەندێکی دەروونی و کۆمەڵایەتی هەبێت کارێکی ئاسان نییە، پێویستی بە کاتێکی زۆر هەیە. تەنانەت هیچ بڕیارێك ناتوانێ ئەو پەیوەندییە دەروونی و کۆمەڵایەتییە یان ئەو چەمکە بارکراوە لەبەر ئەو سرووده دابماڵێ و بەر سروودێکی تریدا بکا. بۆیە ئەم لێکۆڵینەوەیە بە پێویستی دەبینێ ،کە سرووده نەتەوەییەکە وەکو خۆی بمێنێ، لە پاڵ ئەوەدا سروودی هەرێمایەتی دابڕێژرێ و لە دوای چەند ساڵێك سرووده هەرێمایەتییەکەش چەمکی بارکراوی تایبەت بە خۆی پەیدا دەکا و لەلای کۆمەڵگا پەسەند دەکرێ. چەمکی ڕەمزییەت وەردەگرێ. بە تایبەتیش، کە قوتابیان لە قوتابخانەکاندا پێی گۆش دەکرێن.

٣- سروودی ئەی ڕەقیب لەبەر ئەوەی ڕەهەندێکی نەتەوەیی هەیە، بڕیاری گۆڕینی بە تەنیا لە دەسەڵاتی هەرێمی کوردستانی عێراقدا نییە، چونکە

پەیوەندی بە پارچەکانی تری کوردسانیشەوە هەیە. بەڵام هەرێمی کوردستان مافی خۆیەتی ئەگەر وەکو ئەو ڕووبەرە جوگرافییە– ئیدارییەی، کە حوکمڕانی تێدا دەکا سروود بۆ خۆی دابنێ.

٤– سروودە نیشتیمانییەکەش پێویستە بە شێوەیەك بێت، کە ڕەنگدانەوەی مۆرکە نیشتیمانییەکان بێت نەك تەنیا نەتەوەیی. چونکە کەمە نەتەوایەتی تریشی تێدا دەژی. دەبێ ئەوە بەبەر چاو بگیرێ، کە بۆ هەموو گەلی کوردستان ببێت بە ڕەمز.

٥– بوونی سروودی نیشتیمانی کوردستان بەند نییە بەوەی، کە ئێستا بەشێکە لە دەوڵەتی عێراق. تەنانەت ئەگەر لە داهاتووشدا سەربەخۆیی وەرگرت و بوو بە دەوڵەتی سەربەخۆ ئەوا هەرێم پێویستی بەوە دەبێت، کە وەکو دەوڵەت سروودی نیشتیمانی خۆی هەبێت. کە جیاواز بێت لەگەڵ سروودی پارچەکانی تری کوردستان. لە بارێکدا ئەگەر پارچەکانی تری کوردستانیش سەربەخۆییان وەرگرت و بوون بە چوار دەوڵەت ئەوا پێویستە هەر یەك لەو دەوڵەتانە سروودی تایبەت بە خۆیان هەبێت ئەمەش نابێتە هۆی کەمکردنەوە لە بەهای سروودی نەتەوەیی . دەشێ لە پاڵ سروودی نیشتیمانی سروودی نەتەوایەتی ئەی ڕەقیب هەر بمێنێ.

٦– دەشێ هەردوو سروودی نیشتیمانی و نەتەوەیی فەرمی لە وڵاتدا هەبن، بۆ بۆنە نیشتیمانییەکان سروودی نیشتیمانی و لە بۆنە نەتەوایەتییەکانیشدا سروودی ئەی ڕەقیب بەکار بێت.

٧– لە ڕووی کارگێڕی و حوکمڕانییەوە وا چاکترە هەرێمی کوردستانی عێراق لە پاڵ پاراستنی ئەو سروود و ئاڵایەی ئێستا (نەتەوەیی)، کە ڕەمزی نەتەوەیین، سروود و ئاڵای هەرێمایەتی تایبەت بە خۆی دابنێ. بە شێوەیەك، کە کۆدەنگی نیشتیمانی لەسەر بێت و هەموو لایەنە سیاسی و نەتەوە جیاوازەکان دەنگی بۆ بدەن. ئەو کاتە هیچ لە بایەخ و ڕەمزییەتی سروود و ئاڵای نەتەوەیی کەم نابێتەوە. لە داهاتووشدا پارچەکانی تری کوردستان هەر کامەیان گەیشتنە ئەو قۆناغەی، کە مافی نەتەوەیی بە دەست بێنن، دەتوانن سروود و ئاڵای تایبەت بەخۆیان دابنێن و سروودی ئەی ڕەقیبیش لەپاڵ ئەم سروودە نیشتیمانییەکە وەك ڕەمزێکی نەتەوەیی بمێنێتەوە.

## پوختەی لێکۆڵینەوە

ئــەم لێکۆڵینەوەیــە لــە ژێــر ناونیشــانی (ســـروودی ئــەی ڕەقیــب – شیکردنەوەیەکی زمانەوانی) یە و بریتییە لە لێکدانەوە و شیکردنەوەی سروودی (ئــەی ڕەقیــب) لــە چوارچــێوەی پراگماتیــك و زمانــەوانیی سیاســیدا. ئــەم شیکردنەوەیە شیکارێکی وەسفییە و جگە لە پێشەکی بەسەر سێ تەوەر (بەش) دابەش دەبێت:

لە پێشەکیدا ئاماژە بە ناونیشان و سنوور و کەرەستەی خاو و ڕێباز و گرنگی لێکۆڵینەوەکە دەکرێ و هەروەها ئەو گرفتەی ، کە لێکۆڵینەوەکەی لەسەر بنیات دەنرێت.

بەشــی یەکــەم دەربــارەی ســروودی ئــەی ڕەقیبــە و ئەمانــە دەگرێتــەوە ســــەرەتا، دەقــــی شــــیعرەکە، زانیــــاریی دەرەکــــی دەربــــارەی شــــیعرەکە و پەیوەندییەکانی لکاندن (پەیوەندییە لێکسیکییەکان و پەیوەندییە ڕێزمانییەکان)، وە بەشی دووەم جەخت دەکاتە سەر شیکردنەوەی پراگماتیکی و ئەم بابەتانە لێکدراونەتــەوە، وەك: کــردە قســەییەکان، بەرگریمانــە، لێکەوتــەکان و نیشــانە پراگماتیکییەکان. بەشی سێیەم تایبەت دەبێت بە شیکردنەوەی سیاسی: ئەی ڕەقیب لە نێوان نیشتمان و نەتەوەدا، ئەی ڕەقیب و بە سومبولبوون و ئەی ڕەقیب و سەردەم. لە کۆتاییدا، لێکۆڵینەوەکە بە چەند پێشنیازێك دەربارەی سروودەکە کۆتایی دێ و پاشان دەرئەنجام و سەرچاوەکان دەخرێنە ڕوو.

**پەراوێزەکان:**

(١) عبدالخالق علاءالدین، ١٩٨٥: ٧٤.

(٢) دکتۆر مارف خەزنەدار، ٢٠٠٥: ٥٤٤–٥٤٥.

(٣) لە دەقی دیوانەکەدا بە شێوەی (جانفیرانە) نووسراوە. ئەمەش هەڵەی چاپە و نەمان ویست دەستکاری بکەین. راستییەکەی (جانفیدانە)یە

(٤) یەحیا بەرزنجی، ٢٠٠٩: ١٩٤.

(٥) عەزیز گەردی، ١٩٩٩: ٢٧٩–٢٨١.

(٦) یەحیا بەرزنجی، ٢٠٠٩، ١٩٢–٢٠٤.

(٧) یەحیا بەرزنجی ، ٢٠٠٩: ١٩٨.

(٨) لەم سروودەدا، دێڕی هەشتەم دووبارەی دێڕی چوارەمە. لە ئامارەکاندا ئەو دێڕەمان هەژمار نەکردووە. بەوپێیە تەنیا ٧ دێڕ هەژمار کراوە.

(٩) بۆ زانیاریی زیاتر لە بارەی جۆر و چۆنیەتی پەیوەندییەکان سەیری ئەم سەرچاوانە بکە: قەیس کاکل تۆفیق. ٢٠٠٢.

(١٠) بە تایبەتیش لەبەر ئەوەی خوێنەری ئەم لێکۆڵینەوەیە ئەگەر زمانەوان بێ ئەوا پێشینەیەکی پێویستی لەبارەی ئەو بابەتەوە هەیە و چەمکەکان بەلایەوە ناسراون. خوێنەریش ئەگەر زمانەوان نەبی ئەوا دیسانەوە سوود لەو گفتوگۆ تیۆرییە نابینێ و ئەگەر بیەوێ، ئەوا دەتوانێ لەم بارەیەوە سەیری سەرچاوەکان بکا.

(١١) بۆ زانیاریی زیاتر لە بارەی تیۆری کردە قسەیی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ سەیری ئەم سەرچاوانە بکە:

١- قەیس کاکل، ١٩٩٥، ٣٨–٧٠.

Searle. J. R , 1972, 39-53.-2

Brown, Gyllan &Yule, 1983. 232.-3

(١٢) ابن منظور/ ٢٠١٠، مج ٥، ٤٢٥

(١٣) مجدالدین الفیروز آبادی ، ٢٠٠٤:٦٩١

(١٤) د،محەمەد نووری عارف، ٢٠٠٩، ٤٢٠

(١٥) قەیس کاکل، ١٩٩٥: ٦٣. هەروەها: Grice:١٩٧٥:٤٧

(١٦) بۆ زانیاریی زیاتر لە بارەی بەرگریمانەکانەوە سەیری ئەم سەرچاوانە بکە:

١- دیار عەلی کەمال/ ٢٠٠٩.

٢- قەیس کاکل تۆفیق/ ٢٠٠٢، ٤١.

(١٧) Mey,2001:46

(١٨) Davis,W.2005:1

(١٩) moheddin,٢٠٠٩:٢٠

(٢٠) بۆ زانیاریی زیاتر لە بارەی لێکەوتەکانی ئاخاوتن سەیری ئەم سەرچاوانە بکە:
Kearns, K.2000:1-1
Mey,2001:46-٧-٢
Levison,S.1983:113-٣
Davis, W.2005:7-4
(٢١) Palmer 1982:174
(٢٢) George,Y.1996:40-42 , Levinson 1983:10-
(٢٣) George, Y.1996:9
(٢٤) David,C.1992:96
(٢٥) جمال رشيد، ١٩٩٠، ١١١–١١٨.
(٢٦) جمال رشيد.١٩٩٠، ١١٤،
(٢٧) ئەم دیاردەیە جگە لە سروود ئاڵای کوردستانیش دەگرێتەوە.

## سەرچاوەکان.


- جمال رشيد و فوزي رشيد، تاريخ الكورد القديم، أربيل، ١٩٩٠
- دیار عەلی کەمال. گوتاری سیاسیی کوردی لە ڕوانگەی پێشگریمانەکانەوە، نامەی دکتۆرا، زانکۆی سەلاحەددین، ٢٠٠٩
- عبدالخالق علاءالدين، دلدار، دار افاق عربية، ١٩٨٥.
- عەزیز گەردی، سەروا، هەولێر، ١٩٩٩.
- قەیس کاکل تۆفیق، پەیوەندییەکانی نێو دەق، نامەی دکتۆرا، زانکۆی سەلاحەددین، ٢٠٠٢.
- قەیس کاکل، جۆرەکانی ڕستە و تیۆری کردە قسەییەکان، نامەی ماستەر، زانکۆی سەلاحەددین.١٩٩٥.
- مارف خەزنەدار، مێژووی ئەدەبی کوردی، بەرگی پێنجەم، دەزگای ئاراس، ٢٠٠٥.
- مجدالدين الفيروز آبادي، القاموس المحيط/ (٧٢٩–٨١٧ هـ)–تحقيق حسان عبدالمنان –عمان –ط ٣ /٢٠٠٤
- محەمەد نووری عارف، فەرهەنگی نالی و کوردی و سالم، ٢٠٠٩.
- محمد بن مكرم بن منظور الفريقي المصرى جمال الدين أبو الفضل، لسان العرب، مج ٥، دار الصادر/بيروت/ ٢٠١٠.
- یەحیا بەرزنجی، شەهید شێخ حوسێن بەرزنجی، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، ٢٠٠٩.

- Brown, G. and Yule, G.(1983). Discourse Analysis. Camridge: Cambridge University Press.
- Davis, W.(2005).“Standford Encyclopedia of Philosophy: Implicature”.http://Yale-edu/linguist/faculty/doc/horn.implic.pdf.
- Grice, H.(1975). “Logic and Conversation”.In P.Cole and J.L. Morgan(eds.), Syntax and Semantics.Vol.3: Speech Acts.New York:Academic Press.http://philosophy.uwater١oo.ca/MindDict/grice.htm/.
- http://www.ling.canterbury.ac.nz/documents/implicature.pdf.
- Kearns, K.(2000).Implicature and Semantic Change. University fCanterbury: John Benjamins.
- Moheedin,K.(2009).A Study of the Cooerative Principle and Implicatures in Kurdish and English. . Hawler. Unpublished MA thesis, Salahaddin University.
- Palmer, F.(1981). Semantics. Cambridge : Cambridge University
- PressMey, J.(2001). Pragmatics:An Introduction. Massachusetts: BlackwellLevinson, S.(1983).Pragmatics. Cambridge: Cambridge University Press.
- Yule,G.(1996a.). Pragmatics. Oxford: Oxford University Press.

## ملخص البحث

هذا البحث بعنوان" نشيـــد أي رقيــب : تحليل لغوي"، يفحص ويحلل النشيد في اطار البراغماتيك وعلم اللغة السياسية.

يتضمن هذا البحث تمهيداً للدراسـة وينقسـم الى ثلاثـة اقسـام. يخـص التمهيـد مجال البحث وهدفه والمنهج المتبع وأهميته مع القضية التى تدور فيه البحث.

امـا قسـم الاول يشـمل الـنص (نشـيد أى رقيـب) ولمحـة تاريخيـة مـوجزة عـن القصيدة وعوامل التماسك المستخدمة في النص: التماسك المعجمية والنحوية .

ويركز القسم الثاني على التحليل البراغماتيكي ويتكون مـن: الافعـال الكلاميـة، والافتراضات، الاستلزام الحواري والاشارات البراغماتيكية.

والقسم الثالث يعرض تحليلا سياسيا للنص: أى رقيب بـين الـوطن والامـة، أى رقيب والرمـوز، و أى رقيـب والعصـر. واخـيراً يـتم انتهـاء هـذه الدراسـة مـع بعـض الاقتراحات حول النشيد تليها استنتاجات وقائمة المصادر والمراجع.

## Abstract

This paper is entitled" Ay Raqeeb Anthem: A Linguistic Analysis. It examines and analyzes Ay *Raqeeb Anthem* within the framework of pragmatics and political linguistics. It is a descriptive study. In addition to a preliminary section; it falls into three main sections.

The preliminary section includes the title, the scope, the data, the procedures, the significance of the study and the issue on which the paper is based.

Section one is about Ay Raqeeb Anthem and it includes the text, a brief history about the poem as well as the cohesion factors( relations) used in the text( lexical cohesion and grammatical cohesion).Section two focuses on pragmatic analysis (of the poem) and handles speech acts, presupposion, implicatures and Deixis. Further, section three deals with political analysis: Ay Raqeeb between Nation and Motherland, Ay Raqeeb and symbolization and Ay Raqeeb and Era. Finally, this paper is ended with some suggestions about the anthem followed by conclusions and a bibliography.

# پەیوەندیی نێوان میرانی هەکاری و دەسەڵاتدارانی عوسمانی لە سەدەی شازدەهەمدا

پ.د. سەعدی عوسمان هەروتی
کۆلێژی ئەدەبیات – زانکۆی سەلاحەددین – هەولێر

**پێشەکی:**

سەدەی شازدەهەم سەردەمێکی پڕ لە ڕووداو بوو بۆ ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەگشتی و بۆ کوردستان بەتایبەتی، ئەمەش لەئەنجامی سەرهەڵدانی دەوڵەتی سەفەوی (١٥٠١– ١٧٢٢) و وەرگەڕانی ئاراستەی فراوانخوازیی عوسمانی بەرەو ڕۆژهەڵات، کە بووە هۆی بەرپابوونی ململانێیەکی درێژخایەن لەنێوان هەردوو دەوڵەتدا. میرنشینی (هەکاری)یش کە لەسەر سنووری هەردوولا بوو، بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ کەوتبووە ژێر کاریگەریی ئەم ڕووداوانە. هەرچەندە میری هەکاری لەسەروبەندی فراوانخوازییەکانی سەفەوی لەکوردستاندا، ناچاربوو کە پەیوەندیی پاشکۆیەتی لەگەڵ ئەم دەوڵەتە دابمەزرێنێ، بەڵام دوای دەرکەوتنی ڕووی ڕاستەقینەی سیاسەتی سەفەوی و مکوڕبوونی سوڵتانی عوسمانی لەسەر ڕووبەڕووبوونەوەی هەڕەشەکانی سەفەوی، میری هەکاریش وەك زۆربەی میرە کوردەکانی تر دایە پاڵ دەوڵەتی عوسمانی. لێرەوە پەیوەندیی هەمەلایەنەی میرانی هەکاری لەگەڵ دەسەڵاتدارانی عوسمانی دەستپێدەکات. ئامانجی ئەم توێژینەوەیە ئەوەیە کە ڕێڕەوی پڕ هەوراز و نشێوی ئەم پەیوەندییانە بخاتە بەرباس و شرۆڤەی بۆ بکات و فاکتەرە کاریگەرەکان و هەروەها ئەنجامەکانی ئەم پەیوەندییانە دیاری بکات. بۆیە سەدەی شازدەهەمیش دیاری کراوە چونکە سەدەیەکی پڕ لە گۆڕانکاری و چارەنووسساز بوو لە مێژووی میرنشینەکاندا.

بۆ ئەنجامدانی ئەم توێژینەوەیە بەشێوەیەکی سەرەکی پشت بەکتێبی (شەرەفنامە) بەستراوە کە سەرەڕای ئەوەی لەهەندێ زانیاریدا ورد نییە و ساڵ و ڕێکەوتی زۆربەی ڕووداوەکانیش دیاری ناکات، بەڵام بەدەوڵەمەندترین سەرچاوە دادەنرێ بۆ مێژووی میرنشینە کوردییەکان. بایەخی زیاتری شەرەفنامە بۆ ئەم توێژینەوەیە ئەوەیە کە نووسەرەکەی لەسەدەی شازدەهەمدا ژیاوە. لەپاڵ ئەمە سوود لەهەندێ بەڵگەنامەی عوسمانیش وەرگیراوە کە زانیاریی دەگمەن بۆ ئەم توێژینەوەیە دەستەبەر دەکەن. ئەم بەڵگەنامانە بەزمانەکانی تورکی و فارسی و عەرەبی لەچەند کتێبێکدا بڵاوکراونەتەوە، کە گرنگترینیان کتێبەکەی (فاضل بيات، البلاد العربية في الوثائق العثمانية)یە. بەپێویستیشمان زانی سەیری هەندێ گەشتنامەی ئەو سەردەمە بکەین، وەك (سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبی) کە زانیاریی باشی تێدایە لەبارەی هەلومەرجی کارگێڕیی ناوچەی هەکاری. هەروەها هەندێ سەرچاوەی ڕەسەنی تریش بینراون کە هەندێکیان بەزمانی تورکین وەك (هاممەر، دولت عثمانية تاريخي). هەندێکی تریشیان بەفارسین وەك (أحسن التواريخ)ی (حسن روملو) و (تاريخ عالم آراى عباسى)ی (أسكندر بيك تركمان)، ئەم دووە مێژوونووسی دەرباری سەفەوین و لە گۆشەنیگای ئەم دەوڵەتەوە سەیری ڕووداوەکان دەکەن. کتێبی (تذكرهٔ شاه طهماسب)یش هاوشێوەی ئەم دوو سەرچاوەی پێشووە، چونکە یادداشتەکانی خودی شاتەهماسبی سەفەوییە. لەپاڵ ئەمانە چەندین سەرچاوەو ژێدەری تر بەکارهێنراون کە لە لیستی سەرچاوەکاندا هەن.

**دەروازە:**

دەڤەری هەکاری کە ئێستا لە ڕووی کارگێڕییەوە ویلایەتێك پێکدەهێنێ و کەوتووەتە ئەوپەڕی باشووری ڕۆژهەلاتی تورکیا،[1] لە سەردەمانی پێشوودا هەرێمێکی گرنگ بوو لەناو جەرگەی کوردستاندا. لەسەر ئەو بنەمایە هەندێ لە مێژوونووسان هەکارییەکان بە سەرتۆپی کوردان دادەنێن لە ڕووی ڕەگەزپاکییەوە.[2]

هەرێمی هەکاری ناوچەیەکی شاخاوی و بەردەڵانە، شاخی بەرز و دۆڵی پڕ لە هەڵدێر ڕووبەرێکی فراوانی زەمینەکەی پێکدەهێنن. جولەمێرگی ناوەندی هەرێمەکەش قەلایەك بوو لەسەر شاخێکی سەخت هەڵکەوتبوو.[3] هەر ئەمەش وایکردبوو کە لە کۆتاییەکانی سەردەمی عەباسییەوە (١٣٢–٦٥٦ك/ ٧٥٠–١٢٥٨ز) دەسەلاتێکی خۆماڵی لەم هەرێمە دابمەزرێ و بۆ ماوەی چەندین سەدە لە حوکمڕانیی هەرێمەکە بەردەوام بێ. بێگومان ئەم دەسەلاتەش خۆی لەمیرنشینیی هەکاری دەنواند.[4] هەرچەندە گومان هەیە کە ئەم میرنشینە ناوەکەی لە هەرێمەکەوە بۆ هاتبێ، بەلام زیاتر واپێدەچێ کە پێچەوانەکەی ڕاستبێ. واتە هەرێمەکە ناوەکەی خۆی لە میرنشینەکەوە وەرگرتبێ. چونکە حاڵەتی تری لەم جۆرەمان زۆرە وەك هەردوو دەڤەری سۆران و بادینان کەناوەکانیان لەهەردوو میرنشینیی سۆران و بادینانەوە داکەوتووە. ئەوەی زیاتر ئەم بۆچوونە دەسەلمێنێ ئەوەیە کە (هەکاری) لە سەرچاوەکاندا وەکو ناوی هۆزیش دەهێنرێ.[5] تەنانەت هەندێ سەرچاوە وای بۆ دەچن کە هەرێمی هەکاری ناوەکەی لەناوی ئەم هۆزەوە بۆ هاتووە.[6] کەواتە هەکاری لە سەرەتادا ناوی هۆزێك بووە ئنجا بۆتە ناوی میرنشینەکە و دواتریش بەهۆی حوکمڕانیی بەردەوامی ئەم میرنشینە لەم ناوچانە دەڤەرەکە ناوی هەکاری بەسەردا براوە.

بێگومان دیاریکردنی سنووری ئەم میرنشینە وەکو زۆربەی میرنشینە کوردییەکانی تر، کارێکی زۆر گرانە. چونکە ئەم میرنشینانە هەوراز و نشێویی زۆریان بەخۆوە بینیوە و بەپێی هێز و دەسەلاتی میرەکان و هەروەها کات و سەردەمیش سنووری دەسەلاتیان گۆڕاوە. دیارە ئەمەش وایکردووە کە ئەو زەمینەی بە هەکاری ناودەبرێ بەپێی سەردەمە جیاوازەکان لە گۆڕاندابێ. لەم

لایەنەوە تێبینی دەکەین کە هەرێمی هەکاری لە سەرەتادا سنوورێکی فراوانی گرتووەتەوە و لە باکووردا تا قەڵای وان و لە باشووریش زۆر ناوچەی بادینانی لەخۆگرتووە. ئەوەتا لەسەرەتاکانی سەدەی چواردەی زاینیدا سنووری هەکاری لەباشووردا تا لالش و ئێن سفنی و لە ڕۆژئاوادا تا تخووبی ڕۆژهەڵاتی جزیرەی بۆتان و لەڕۆژهەڵات تا هەرێمی ئازربێجانی ئێران و لەباکووردا تا دەریاچەی وان درێژبۆتەوە.[٧] بەپێی زانیارییەکانی شەرەفخانی بەدلیسی لە کۆتاییەکانی سەدەی چواردەمیشدا هەردوو شاری وان و وستان[٨] لەژێر حوکمڕانیی میری هەکاری دابوون.[٩] دیارە لە ڕۆژهەڵاتیشدا دەسەڵاتیان تا خوی و سەلماس کشاوە.[١٠] ئەم زانیارییانە لەگەڵ قسەکانی (لۆنگریک)یش یەکدەگرێتەوە کاتێ سەبارەت بەفراوانیی دەسەڵاتی هەکارییەکان دەنووسێ: "هەژمونی ئەمانە بەرز و نزمی بەخۆوە دەبینی لە ناوچەیەك کە لەباکوورەوە درێژ دەبۆوە بۆ بەدلیس، و لەباشووریش بۆ ڕۆژهەڵاتی دیجلە".[١١] ئەم فراوانبوونە بەزۆری لە سەردەمی میر عیزەددین شێر بوو کە هاوچەرخی تەیمور لەنگ بوو و یەکێك بووە لە میرە بەهێز و مەزنەکانی هەکاری. دیارە هەر لەبەر ئەم هێز و فراوانیی دەسەڵاتە بوو کە ئەمەی دوایی نازناوی (پادشای کوردستان)ی بەعیزەددین شێر داوە.[١٢] شایانی باسە میرانی هەکاری لە بنەماڵەیەکی دێرینی پایە بەرز و بەڕەچەڵەك مەزن بوون، بۆیە لەنێو میر و دەسەڵاتدارانی کوردستاندا ڕێزی زۆریان هەبوو.[١٣]

بەڵام سنوور و تخووبی هەکاری بەرەبەرە پاشەکشەی کردووە و بازنەی دەسەڵاتی میرانی هەکاری کورژ بۆتەوە. دیارە بەشێکی بەهۆی ئەوەوە بووە کە میرانی بادینان لەسەدەی پازدەمدا لەباشوورەوە دەستیان بەفراوانخوازی کردبوو.[١٤] هەر لەدەوروبەری ناوەڕاستی ئەم سەدەیەشدا ناوچەکانی وان و (وستان)یان لەدەستدا و تەنانەت دەسەڵاتیان لەمەڵبەندی میرنشینەکەشیان چەند جارێك کەوتە بەر مەترسی.[١٥] سەرەڕای ئەمەش میرنشینی هەکاری نەك هەر لەناو نەچوو بەڵکو لەسەدەی شازدەمدا — کە سەردەمی تایبەت بەم توێژینەوەیە— سەرلەنوێ بووژاوەتەوە و بووەتە یەکێك لە میرنشینە بەهێز و مەزنەکانی کوردستان. تەنانەت شەرەفخانی بەدلیسی جارێ بە ناوی "مەملەکەت" و هەندێ جاریش بە "ویلایەتی هەکاری" ناوی دەهێنێت.[١٦] ئەگەر ناوبراو لەبەکارهێنانی

ئەم دەستەواژانە زۆر وردیش نەبێ، ئەوا بەلایەنی کەم واتای ئەوە بەدەستەوە دەدەن کە لەم سەردەمەشدا هەکاری سنوورێکی فراوانی هەبوو بە بەراورد لەگەڵ میرنشینەکانی تر. هەر شەرەفخان خۆی ناوی چەندین قەڵا و ناوچە دەهێنێ کە لەم ماوەیەدا لەدەست میرانی هەکاری بوون. وەك هەردوو قەڵای کواش و ئەختمار[١٧] لە کەناری باشووری دەریاچەی وان، لەگەڵ قەڵای بای و هەروەها ناوچەی ئەلباق کە مەڵبەندەکەی باشقەلا بوو. هەر لەم ماوەیەدا (وستان)یش لەنێو سنووری قەڵەمڕەوی هەکاری دابوو. بێگومان ئەمە لەپاڵ (جولەمێرگ)ی مەڵبەندی سەرەکی هەکاری و ناوچەکانی دەوروبەری. دیارە تا کۆتاییەکانی سەدەی شازدەمیش هەر جولەمێرگ پایتەختی میرنشینەکە بوو، بەڵام هەمیشە میرێکی بنەماڵەی هەکاری لە ئەلباق و زۆر جاریش یەکێکی تر لە وستان حوکمڕانی دەکرد. [١٨] کەواتە لەم ماوەیەشدا هەکارییەکان لەباکووردا دەسەڵاتیان تا نزیك دەریاچەی وان بڕی کردووە، ئەگەرچی لە باشووردا بەهۆی بەهێزبوونی میرانی بادینان سنووری میرنشینەکەیان بەرەوخوار زۆر شۆڕ نەبۆتەوە.

لەسەرەتای سەدەی شازدەمدا (کەسنووری توێژینەوەکەی ئێمەیە) زاهید بەگی کوڕی عیزەددین شێر (ئەمە ئەو عیزەددین شێرەی پێشوو نییە) میری دەسەڵاتداری هەکاری بوو.[١٩] بەپێی گوتەی توێژەرێك ئەم میرە لەساڵی ١٤٩٤ز دەسەڵاتی میرنشینەکەی وەرگرتووە.[٢٠] بەڵام سەرچاوەو بەڵگەنامە مێژووییەکان ئەوە دەردەخەن کە زاهید بەگ لە مێژوویێکی زۆر زووتر هاتۆتە سەر دەسەڵات. ئەوەتا شەرەفخانی بەدلیسی دەڵێ ساڵانی حوکمی ئەم میرە نزیکەی (٦٠) ساڵی خایاندووە.[٢١] لە بەڵگەنامەیەکی عوسمانیشدا کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٥٢٠ز لەجیاتی زاهید بەگ ناوی سەید محەمەدی کوڕی دەهێنرێ.[٢٢] کەواتە یان زاهید بەگ لەشێستەکانی سەدەی پازدەمەوە حوکمڕانیی هەکاری وەرگرتووە. یان شەرەفخان بەهەڵەدا چووە و زاهید بەگ (٦٠) ساڵ حوکمڕانی نەکردووە.

باسی یەکەم:

## پەیوەندیی میرانی هەکاری و دەوڵەتی عوسمانی لە میانەی ململانێ لەگەڵ سەفەوییەکاندا:

شا ئیسماعیلی یەکەمی سەفەوی (١٥٠١– ١٥٢٤) دوای ئەوەی لەساڵی ١٥٠١ز دامەزرانی دەوڵەتی سەفەوی لە هەرێمی ئازربیجان ڕاگەیاند و شاری تەورێزی کردە پایتەختی خۆی، دەستی بەشاڵاوی سەربازی کرد بۆ هەرێم و ناوچەکانی دەوروبەری بەمەبەستی فراوانکردنی سنووری دەوڵەتەکەی. ئەو هەر بەوە وازی نەهێنا کە لە ساڵانی ١٥٠٣– ١٥٠٥ زۆربەی وڵاتی ئێرانی لەژێر دەسەڵاتی خۆیدا یەکخست، بەڵکو کەوتە هێرشبردن بۆ سەر وڵاتانی دەوروبەریش بەتایبەتی عیراق و کوردستان کە زۆربەی ناوچەکانیان لەنێو سنووری قەڵەمڕەوی دەوڵەتی ئاق قۆینلۆ (١٤٠٣– ١٥٠٨ز) دەهاتنە ژماردن.[٢٣] هەر لەساڵی ١٥٠٦ دا شاڵاوی سەفەوی بۆ سەر ناوچەکانی کوردستان دەستیپێکرد، بەڵام هێرشە مەزنەکە لە ساڵانی ١٥٠٧– ١٥٠٨دا بوو کە خودی شا ئیسماعیل سەرکردایەتی دەکرد. هەرچەندە هەندێ لەمیرنشینە کوردییەکان ڕووبەڕووی هێزەکانی سەفەوی بوونەوە و لەهەندێ شوێندا شکستیان پێهێنان، بەڵام سەرەنجام بەخۆشی بێ یان ناخۆشی زۆربەی میر و دەسەڵاتدارانی کوردستان دەسەڵاتی سەفەوییان قبوڵ کرد و ناوچەکانیان بووە بەشێك لەم دەوڵەتە.[٢٤] میری هەکاری (زاهید بەگی کوڕی عیزەددین شێر) یەکێك بوو لەو میرە کوردانەی کە بەخۆشی گوێڕایەڵی خۆی بۆ شا ئیسماعیلی سەفەوی دەربڕیوە.[٢٥] بەمەش ناوچەکانی خۆی لە دەستدرێژیی سەفەوییەکان پاراستووە و پارێزگاری لە قەوارەی میرنشینەکە و هەروەها دەسەڵاتی خۆشی کردووە. چونکە لەبەرامبەر ئەم هەڵوێستەدا شائیسماعیل دانی بەحوکمڕانیی ئەو ناوەو بەڵێنی دەسەڵاتی بۆماوەیی بەسەر میرنشینەکەیدا پێداوە. نەك هەر ئەوەندە بەڵکو ڕێزێکی زۆری لێناوە و بەچاوی سۆز و خۆشەویستییەوە سەیری کردووە. شەرەفخان دەڵێ ئەو تەنیا بەناوی (مامە) بانگی میر زاهیدی کردووە.[٢٦] بێگومان وەرگرتنی ئەم هەڵوێستە لەم هەلومەرجەدا لێهاتوویی و بڕشتی ئەزموونی سیاسی ئەم میرە پیشاندەدا،[٢٧] بەتایبەتی کە دواتر دەبینین بەپێی گۆڕانی بارودۆخەکە ئەویش هەڵوێستی خۆی دەگۆڕێ.

سەرەڕای ئەمەش میرنشینیی هەکاری تا سەر لە زەبروزەنگی سەفەوی بەدوور نەبوو. شەرەفخان دەڵێ "ڕەچاوکردنی دۆستایەتی و هاوپەیمانی و چاك هاوسێیی تەواو" لەنێوان میری هەکاری و شائیسماعیل بەرقەرار بوو.(٢٨) بەڵام دیارە ئەمە زۆر درێژەی نەکێشاوەو دوای ماوەیەك شا ئیسماعیل بڕیاریداوە میرنشینی هەکاری (هەروەکو قەوارە کوردییەکانی تر) داگیر بکات. نەك هەر ئەوەندە بەڵکو دەبێ میری هەکاریش دەستبەسەر کرابێ، لەگەڵ ئەو (١١) میرە کوردەی کە بۆ بینینی شائیسماعیل و دڵسۆزی نواندن بۆی سەردانی شاری (خوی)یان کردبوو.(٢٩) چونکە کاتێ شا سیاسەتی خۆی بەرامبەر کوردستان گۆڕی و ئەم میرانەی دەستبەسەر کرد بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ حوکمڕانی ناوچەکانی ئەم وڵاتە بکات،(٣٠) هێزێکی سەفەویشی بەسەرکردایەتی دێو سوڵتان ڕۆمللو بۆ داگیرکردنی هەکاری ڕاسپارد. بەڵام دوای تێپەڕبوونی ماوەیەك کە ئۆزبەگەکان هێرشیان هێنا بۆ گرتنی هەرێمی خۆراسان لەڕۆژهەلاتی ئێران، شا ئیسماعیل بڕیاریدا هەموو میرە کوردەکان ئازاد بکات بێجگە لە میرانی بەدلیس و حەسەنکێف.(٣١) دەبێ ئەم ڕووداوەش لەکۆتایی ساڵی ١٥١٢ یان سەرەتای ساڵی ١٥١٣ بووبێ، چونکە ئەم هێرشەی ئۆزبەگەکان لە کۆتایی ساڵی ١٥١٢ دا بوو.(٣٢) سەبارەت بەهۆکاری ئازادکردنی ئەم میرانەش شەرەفخان دەڵێ کاتێ شا هەواڵی شالاوی ئۆزبەگەکانی بۆ هات پەشیمان بۆوە لەگرتنی میرە کوردەکان.(٣٣) بەم پێیە بێ دیارە کە شا ئیسماعیل لەوە ترساوە کاتێ ئەو لەڕۆژهەلات سەرگەرمی شەڕی خۆراسان دەبێ، لەڕۆژئاوای دەوڵەتەکەی لەگەڵ میرنشینە کوردییەکان کێشەی بۆ ساز بێ. لەنێویشیاندا میرنشینی هەکاری کە بێگومان میرەکەی لەنێو ئازادکراوەکاندا بوو، هەروەکو لە ڕووداوەکانی دواتردا دەردەکەوێ.

لێرەدا پەیوەندیی میرانی هەکاری لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی دەستپێدەکا. چونکە میر و سەرانی کورد کە بێ هیوا بوون لەدەوڵەتی سەفەوی و زۆربەیان میرنشینەکانیان لەدەستدا، بەڕێنموودەیی مەلا ئیدریسی بەدلیسی (کە کەسایەتییەکی ناوداری کورد و نزیك بوو لەسوڵتانی عوسمانی) نامە و نوێنەریان بۆ سوڵتان هەنارد و بەڵێنی پشتیوانییان پێدا لەشەڕی سەفەوییەکاندا، بەمەرجێ دەسەلاتە بۆماوەییەکانیان وەربگرنەوە.(٣٤) بێگومان زاهید بەگی میری هەکاریش

لەنێو ئەم میرانە دابوو، چونکە ئەو بەکردار ئەم پشتیوانییەی بۆ عوسمانییەکان پیشاندا و ڕۆڵی بەرچاوی بینی لە شەڕی چاڵدێران (٢٣ ئاب ١٥١٤ز) کە بەسەرکەوتنی لەشکری سوڵتان سەلیمی یەکەمی عوسمانی (١٥١٢– ١٥٢٠ز) بەسەر لەشکری شائیسماعیلی سەفەوی تەواو بوو.[٣٥] هەر بۆیە سوڵتان سەلیم لەو (استمالت نامە) یەی کە دوای شەڕەکە بۆ دانیشتووانی تەورێزی پایتەختی سەفەوی ناردووە، جیا لەهەموو میرەکانی تر زاهید بەگی میری هەکاری بە "فخر امراء الاکراد" واتە: شانازیی میرانی کورد، ناو دەبات.[٣٦]

لەئەنجامی شەڕی چاڵدێران و ڕووداوەکانی دواتر، میرنشینیی هەکاری لەپاڵ زۆربەی میرنشینە کوردییەکانی تر هاتە ژێر چەتری دەوڵەتی عوسمانی. هەر بۆیە دەبینین لەساڵانی دواتریش میرانی هەکاری پشتگیری لە دەوڵەتی عوسمانی دەکەن لە ململانێکەی لەگەڵ دەوڵەتی سەفەوی. لایەنێکی ئەم پشتگیرییە خۆی لە پێدانی زانیاریی هەواڵگری دەبینێتەوە، کە دەسەڵاتدارانی عوسمانی زۆر بایەخیان پێدەدا و ئەم زانیارییانەیان ڕاستەوخۆ بۆ خودی سوڵتان بەرز دەکردەوە. لە ڕاپۆرتێکی ساڵی ١٥٢٠دا کە محەمەد پاشای والی دیاربەکر[٣٧] بۆ سوڵتان سلێمانی قانونی (١٥٢٠– ١٥٦٦) ناردووە، ئاماژە بەو زانیارییانە کراوە کە هەندێ لەمیرانی کورد و سەردارەکانی سەر سنووری ڕۆژهەڵاتی عوسمانی سەبارەت بە جموجۆڵەکانی سەفەوی، پێشکەشی دەسەڵاتدارانی دەوڵەتیان کردووە، لەنێو ئەم میرانە ناوی سەید محەمەدی کوڕی زاهید بەگ دەهێنرێ.[٣٨] کە بێگومان میرێکی بنەماڵەی هەکارییە و کوڕی ئەو میر زاهید بەگەیە کە پێشتر باسمانکردووە. بەڵام بەرلەوەی دەسەڵاتی میرنشینەکە بگرێتە دەست سەرداری (وستان) بوو کە ناوچەیەکی سەر بەمیرنشینەکە بوو.[٣٩] ئنجا نازانرێ لەکاتی ناردنی ئەم زانیارییانە کامە پۆستی هەبوو، چونکە ساڵی وەرگرتنی حوکمی نازانرێ.

لە هەندێ باری تردا دەسەڵاتدارانی عوسمانی میرانی هەکاری ڕادەسپێرن بۆ ئەوەی لەسنووری سەفەوی نزیك ببنەوە بەمەبەستی چاودێریکردن و کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر هێزەکانیان. وەك ئەوەی زەینەل بەگی هەکاری لەلایەن ئەسکەندەر پاشای والیی وان بۆ ئەرکێکی لەم جۆرە نێردرایە سەر سنوور،

زەینەل بەگ لەمیانەی ئەم ئەرکەیدا لەناوچەی سەلماس ڕووبەڕووی شەڕ بۆوە بەڵام سەرکەوتنی بەدەستهێنا و گەڕایەوە.(٤٠)

هەر بەهۆی لایەنگیریی عوسمانییەکان لەم ململانێیەدا لەهەندێ باردا میرنشینی هەکاری کەوتۆتە بەر شالاَوی لەشکری سەفەوی. بەتایبەتی لەسەردەمی شا تەهماسبی یەکەم (١٥٢٤- ١٥٧٦ز) و سوڵتان سلێمانی قانونیدا، کەچەند جارێ شەڕ لەنێوان هەردوولادا ڕوویداو ئەم ئەڵقەیەی ململانێیەکە تا ساڵی ١٥٥٥ز بەردەوام بوو.(٤١) میرنشینیی هەکاریش بەو پێیەی لەسەر سنووری هەردوولا بوو، ببووە یەکێك لە مەیدانە گەرمەکانی ئەم شەڕانە. شا تەهماسب لەیاداشتەکانی خۆیدا باسی ئەوە دەکا کە لە سەروبەندی کردە سەربازییەکانی ساڵانی ١٥٣٤- ١٥٣٥ لەدەوروبەری وان، لەشکرێکی چەند هەزار کەسی ناردۆتە سەر ناوچەکانی سەید محەمەد بۆ ئەوەی هێرشی بۆ ببەن و تاڵانی بکەن.(٤٢) بێگومان لەمەشدا مەبەستی ناوچەکانی میرنشینیی هەکارییە، چونکە ئەمە هەمان ئەو سەید محەمەدەی پێشووی میری هەکارییە.

هەر لەسەردەمی شا تەهماسبدا ناوچەکانی هەکاری جارێکی تر تووشی زەبروزەنگی سەفەوییەکان بوونەوە، بەهۆی ئەوەی هاوسەنگەری عوسمانی بوون لەدژی دەوڵەتی سەفەوی. ئەمجارەیان لەساڵی ٩٥٩ك (١٥٥١-١٥٥٢ز) بوو کە لە چوارچێوەی شالاَوی شا تەهماسب بۆ ناوچەکانی دەوروبەری دەریاچەی وان، هێزەکانی سەفەوی (وستان و کواش و ئەلباق) و هەندێ ناوچەی تریان تاڵان کرد و بەقسەی مێژوونووسێکی هاوچەرخ دواتر سووتێنران و کاول کران. هەر ئەم مێژوونووسە دەڵێ کاتێ لەشکری سەفەوی گەیشتە ئەلباق، هەندێ لە سەردارانی کوردستان لەنێویاندا زەینەل بەگ خۆیان بۆ شەڕی لەشکری هێرشبەر ئامادە کردبوو. بەڵام نەیانتوانی لەبەرامبەر سەفەوییەکان بوەستن.(٤٣) بێگومان ئەم ناوچانەی ناومان هێنان سەر بە میرنشینیی هەکاری بوون (وەکو پێشتر ئاماژەمان پێداوە)، سەرداری ناوبراویش زەینەل بەگی کوڕی مەلیك بەگی کوڕی زاهید بەگە کە لەم ماوەیەدا میری هەکاری بوو.(٤٤)

لە ساڵی دواتردا شا تەهماسب خۆی بە لەشکرەوە هەڵیکوتاوەتە سەر ئەلباق، بەڵام خەڵکی ناوچەکە ڕایانکردبوو، بۆیە سەفەوییەکان تەنیا ئەوەیان

پێکرا کە ئەوێ بسووتێنن.[٤٥] لێرەدا دەبینین خەڵکی هەکاری و ناوچەکانیان باجی ئەوەیان داوە کە میرەکانیان لە سەنگەری عوسمانی دابوون لەم ململانێیەدا. بەڵام ئەوانیش بۆ خۆپاراستن لە زەبروزەنگی دەوڵەتی سەفەوی ئەم هەڵوێستەیان وەرگرتبوو، کەچی بەمەش پارێزراو نەبوون.

ئەوەی لەمیانەی ئەم شەڕ و هێرشانەدا جێگەی سەرنجە ئەوەیە کە سەرچاوە مێژووییەکان ئاماژە بەجولەمێرگی مەڵبەندی هەکاری ناکەن کە گیرابێ یان هێرشی کرابێتە سەر لەلایەن سەفەوییەکان. ئەمەش لەوانەیە لەبەر دوورە دەستی شارەکە یان سەختی و قایمی شوێنەکەی بێت. بەڵام لەئەنجامی تەراتێنی سەفەوی و دەستگرتنیان بەسەر هەندێ لەناوچەکانی وان و هەکاری لەمیانەی شەڕەکانی ئەم ماوەیەدا، هەندێ لە مێژوونووسان وادەزانن کە دەڤەری هەکاری لەئەنجامی هێرشەکەی سوڵتان سلێمانی قانونی، لەساڵی ١٥٣٤دا هاتۆتە ژێر قەڵەمڕەویی عوسمانی.[٤٦] ئەمە لەکاتێکدایە کە سەرچاوە ڕەسەنەکان هەرگیز ناوی میری هەکاری و ناوچەکانی میرنشینەکەی ناهێنن کاتێ باسی ئەو دەڤەرانە دەکەن کە بەهۆی شاڵاوەکانی عوسمانی لەم ماوەیەدا هاتوونە ژێر دەسەڵاتی عوسمانی.[٤٧] تەنانەت (مەتراقی زادە) کە هاوسەفەری سوڵتان سلێمانی قانونی بووە لە هەڵمەتەکانی ئەم ماوەیەدا و شایەدحاڵی ئەم شەڕانەیە، باسی ئەوە ناکا کە سوڵتان یان لەشکری عوسمانی لەم ماوەیەدا میرنشینیی هەکارییان گرتبێ.[٤٨] لەم بارەیەوە تەنیا ئاماژەیەکمان بەدەستەوەیە، ئەویش هی شەرەفخانی مێژوونووسە کە دەڵێ شەرەفخانی میری بەدلیس (واتە باپیری خۆی) یارمەتی میر عیزەددینی هەکاری داوە بۆ نەهێشتنی دەسەڵاتی میری میرنشینی مەحمودی بەسەر هەکاریدا، کە پێشتر بەپاڵپشتیی سەفەوی دەسەڵاتی خۆی بەسەردا سەپاندبوو.[٤٩] بەڵام ناتوانین ئەم زانیارییە وەکو خۆی وەربگرین، چونکە هاوکات لەگەڵ سەردەمی شەرەفخانی میری بەدلیسدا هیچ میرێکی هەکاری بەناوی عیزەددین حوکمڕانی نەکردووە. بۆیە دەتوانین دڵنیا بین لەوەی کە هەر لەدوای شەڕی چالدێرانەوە میری هەکاری دەسەڵاتی عوسمانی قبوڵ کردووە، وەکو پێشتر ئاماژەمان پێدا. هەر لەئەنجامی ئەمەشدا بوو کە چەند جارێ لەلایەن لەشکری سەفەوییەوە دەستدرێژی کراوەتە سەر، وەك لەدێرەکانی پێشوودا

بینیمان. سەبارەت بە ئاماژەکەی شەرەفخانیش، تەنیا دەتوانین بلّێین میری مەحمودی کە لەم ماوەیەدا سەر بەدەولّەتی سەفەوی بووە، هەندێ ناوچەی هەکاری زەوتکردووە نەك هەموو میرنشینەکە. دیارە میری هەکاریش (ئەگەر چاوپۆشی لە هەلّەی ناوەکەی بکەین) بەیارمەتی میری بەدلیس ئەم ناوچانەی وەرگرتۆتەوە. بێگومان بێ ئەوەی باسوخواسی هێزی عوسمانی بۆ گرتنی یان گرتنەوەی هەکاری لەگۆڕێ دابێ.

هەلّوێستی میرانی هەکاری لەململانێی عوسمانی – سەفەویدا تەنیا بەوە نەوەستابوو، بەلّکو ئەم میرانە لەچەندین هەلّمەت و کردەی سەربازیدا بەشداریی کاریگەریان هەبوو، تەنانەت لە هەندێکیاندا لەم پێناوەشدا گیانیان لەدەستداوە، وەکو بایەزید بەگی کوڕی مەلیك بەگ کە یەکێك بوو لەمیرانی بنەمالّەی هەکاری و لەلای والیی دیاربەکر خزمەتی دەکرد. ئەم میرە کاتێ لەناوچەی شێروان لەپالّ لەشکری عوسمانیدا دەجەنگا،(٥٠) بەدیلی کەوتە دەست سەفەوییەکان و ئەوانیش بردیانە لای شا محەمەد خودا بەندەی سەفەوی (١٥٧٧–١٥٨٧ز) لە قەزوین، کە لەوێ بەنامەردی کوژرا.(٥١) زەینەل بەگی میری هەکاریش هەر لە شەڕەکانی ئەم ماوەیەدا گیانی خۆی کردە قوربانی دەولّەتی عوسمانی. ئەم میرە هەرچەندە لەدوا سالّەکانی ژیانیدا دەستی لەکاروباری حوکم کێشابۆوە و میرنشینیی هەکاری بە زەکەریا بەگی کوڕی سپاردبوو، بەلاّم کاتێ لەسالّی ٩٩٣ك (١٥٨٤– ١٥٨٥ز) لەشکری عوسمانی هێرشی کردە سەر ناوچەی ئازربیجانی سەر بەدەولّەتی سەفەوی، فەرمانی سولّتانی بۆ زەینەل بەگ دەرچوو کە بەشدار بێ لەم جەنگەدا. ئەویش بۆ بەجێگەیاندنی ئەم فەرمانە شالاّوی بردە سەر ناوچەکانی گەرگەر و زونوس و مەرەند لە باکووری ئازربیجان و تالاّن و بڕۆیی تێدا کردن. بەلاّم دواجار لەنزیك مەرەند بەدەستی قزلّباشەکان کوژرا.(٥٢) ئیبراهیم بەگی کوڕی زەینەل بەگیش کە لەگەلّ باوکیدا بوو، بەدیل گیرا. بەلاّم دواتر بەپارەیەکی زۆر بەردرا.(٥٣)

هەر ئەو زەینەل بەگە کە بەم هەلّوێستەی کۆتایی بەژیانی هات، پێشتر بەهۆی هەلّوێستێکی هاوشێوە لەلایەن دەسەلاّتدارانی عوسمانی حوکمڕانیی هەکاری پێدرابوو. ئەمەش ئەو کاتە بوو کە لەناوچەی سەلماس سەرکەوتنی بەسەر بایەندەر بەگی برای بەدەستهێنابوو. ئەم بایەندەر بەگە پێشتر پەنای بۆ

دەرباری شاتەهماسب بردبوو و ببووە لایەنگیری سەفەوییەکان، لەو دەمەشدا بەخۆی و هێزێکەوە چووبووە سەلماس.(٥٤)

لەم ڕووداوەی پێشوودا بۆمان دەردەکەوێ کە هەندێ لە میرانی بنەماڵەی دەسەڵاتداری هەکاری پەنایان بردۆتە بەر دەوڵەتی سەفەوی، ئەمەش لەپێناو بەرژەوەندیی تایبەتی خۆیان بوو کە بەزۆری خۆی لەهەوڵی وەرگرتنی دەسەلاَت دەبینییەوە. لەم بوارەدا دەتوانین ئاماژە بە هەریەکە لە بایەندەر بەگ و زەینەل بەگ بکەین کە هەردووکیان برا بوون و کوڕی مەلیك بەگی کوڕی زاهید بەگ بوون. بەلاَم هەردووکیان کە لەماوەی جیاجیا چووبوونە دەرباری سەفەوی، لەلایەن شا تەهماسبەوە بێ ئومێد کران و یارمەتی نەدران بۆ گەیشتن بەدەسەلاَت. بۆیە دواتر گەڕانەوە لای دەوڵەتی عوسمانی.(٥٥) بەلاَم دوای ئەوەی هەردووکیان زیانیان پێکەوت، بەلایەنی کەم لەڕووی واتاییەوە. زەینەل بەگ ئەگەرچی خۆی گەڕابۆوە لای عوسمانییەکان، بەلاَم پێیان ڕاگەیاند کە دڵسۆزییەکەی ئەو جێگەی گومانە تا ئەو کاتەی خێزان و بنەماڵەکەی لە ئێران دەهێنێتەوە.(٥٦) هەڵوێستەکەی بایەندەر بەگیش وایلێکرد دەستەویەخەی زەینەل بەگی برای بێ لەو شەڕەی سەلماس کە پێشتر باسمانکرد. بەمەش ئەم هەوڵەی میرانی هەکاری بۆ سوود وەرگرتن لە لایەنەکەی تری ململانێی عوسمانی– سەفەوی، جگە لەوەی سەرکەوتوو نەبوو، بووە هۆی ڕووبەڕووبوونەوەی دوو برای هاوخوێن لەگەڵ یەکتر. نەك تەنیا دوو برای هاونەتەوە کە ئەمە دەرەنجامێکی گشتی ململانێکە بوو. لەمەی دواییدا مەبەستمان کوردە کە لەهەردوو لای ململانێکە هەبوون و لەگەڵ هەر پێکدادانێکی عوسمانی و سەفەویدا ئەوانیش بەشدار بوون.

پێش ئەوەی کۆتایی بەم باسە بێنین دەبێ ئەوەش بخەینە ڕوو کە هەندێ لە میرانی هەکاری ئەگەرچی سەر بەدەوڵەتی عوسمانیش بوون، بەلاَم لەهەندێ باردا پەیوەندیی باشیان لەگەڵ شا و دەسەلاَتدارانی سەفەویدا هەبوو. وەکو سەید محەمەد بەگی کوڕی زاهید بەگ(٥٧) و زەینەل بەگی کوڕی مەلیك بەگ.(٥٨) بەلاَم ئەم پەیوەندییە بەزۆری لەکاتی هێوربوونەوەی ململانێی عوسمانی – سەفەوی دابوو، بۆیە هیچ کاریگەری لەسەر هەڵوێستی ئەم میرانە بەرامبەر دەوڵەتی عوسمانی و ململانێکەی نەبووە.

**باسی دووەم:**

## سیاسەتی دەسەڵاتدارانی عوسمانی لەهەمبەر میرانی هەکاریدا:

پێشتر باسی ئەوەمان کرد کە لەدوای شەڕی چاڵدێران، میرنشینیی هەکاری لەگەڵ کۆمەڵێك میرنشین و قەوارەی تری کوردستان، دەسەڵاتی عوسمانییان قبوڵ کرد و هاتنەژێر قەڵەمڕەوی ئەم دەوڵە. بەڵام ئەوان نەبوونە بەشێکی ئاسایی لەنێو ئەم دەوڵەتەدا. چونکە ڕێکەوتننامەیەك لەنێوان میرانی کورد و سوڵتان سەلیمی یەکەم لەئارادابوو کە پەیوەندییەکانی هەردوولای ڕێکدەخست. گرنگترین بنەماکانی ئەم ڕێککەوتننامەیە خۆیان لەوەدا دەبینییەوە کە میرە کوردەکان ماف پشتاوپشت و سەربەخۆیی ناوەخۆییان هەبێ لەحوکمڕانیکردنی میرنشین و قەوارە خۆماڵییەکانیان. بەڵام بەشداری شەڕ و کردە سەربازییەکانی عوسمانی بکەن لەکاتێ کە داوایان لێدەکرێ. لەبەرامبەردا دەبوو دەوڵەتی عوسمانی پشتیوانی لەم میرنشینانە بکات و بەتایبەتی لە دەستدرێژیی دەرەکی بیانپارێزێ.[٥٩]

لەئەنجامی ئەمەدا ئەم میرنشینانە لەنێویشیاندا هەکاری، نەکەوتنە ژێر کارگێڕی ڕاستەوخۆی عوسمانی و لەڕێکخستنە کارگێڕییەکانی ئەم دەوڵەتەدا هەلومەرجی تایبەتییان هەبوو. هەرچەندە ئەوانیش لەنێو ویلایەتەکانی عوسمانیدا جێگەی خۆیان گرت، بەڵام ئەوان وەکو سنجەقی ئاسایی نەبوون[٦٠] و پێیان دەگوترا "سەربەست میری میران".[٦١] هەندێ لە میرنشینە کوردییەکان کە خاوەن کێشی خۆیان بوون و لەوانیتر گەورەتر و بەهێزتر بوون، بەفەرمی پێیان دەگوترا "حکومەت" و ماف و جیاووکی زیاتریشیان هەبوو.[٦٢] وەك ئەوەی کە لەحاڵەتی بڕانەوەی وەچەی میرەکەشدا دەوڵەتی عوسمانی نەیدەتوانی دەست بەسەر میرنشینەکەدا بگرێ و "حکومەتەکەی دەدرێ بە یەکێکی دی لەخۆیان".[٦٣] میرنشینیی هەکاریش یەکێك بوو لەو حکومەتانە و لە ڕووی کارگێڕییەوە سەر بەویلایەتی وان بوو، ئەمەش لەبەر ئەوەبوو کە لەڕووی سیاسی و هەروەها سەربازیشدا خاوەن کێشی خۆی بوو، بەپێی گوتەی ئەولیا چەلەبی (ناوەڕاستی سەدەی حەڤدەمدا) میری هەکاری خاوەنی (٤٧) هەزار سەرباز بوو کە لەبارەیاندا دەڵێ: "هەموویان ڕدێن تاشراو، چوارشانە، زرتەبۆز و ناشیرین و

ئازان...ئەوەندە نیشانچین کێچ دەنگێون...هەکاری دە هەزار تفەنگی لەم بابەتەی هەیە و لەکاتی شەڕدا دەیگەیێنێتە چل پەنجا هەزار، بەڵام ئەم دە هەزارەیان مەعاش خۆرن".[٦٤] دیارە ئەم (١٠) هەزارەی دوایی سەربازی هەمیشەیی بوون. ئەم ژمارانە ئەگەر زێدەڕۆییشیان تێدا کرابێ، ئەوا ئاماژەن بۆ برشتی میرنشینیی هەکاری لەڕووی سەربازییەوە.

حکومەتی هەکاری سەرەڕای ئەو ماف و جیاوکانەی کە هەیبوو، لە هەندێ باری دیاریکراودا دەکەوتە بەر فەرمانی دەسەڵاتدارانی عوسمانی، بەتایبەتی لەکاتی جەنگ و لەشکرکێشییەکانی عوسمانی بۆ سەر دەوڵەتی سەفەوی کە بەپێی قانونی سوڵتان سلێمان دەبوو میری هەکاری بچێتە ژێر ئاڵای والی (بەگلەربەگی) وان، بڕیاریش وابوو نیوەی هێزەکانی بەشداری هەڵمەتەکە بێ و نیوەکەی تر بۆ پاراستنی میرنشینەکە بمێننەوە.[٦٥] هەر لەئەنجامی ئەمەدا بوو کە دەوڵەتی عوسمانی لەچەندین شەڕ و هەڵمەتی سەربازیدا لەدژی دەوڵەتی سەفەوی سوودی لەهێزەکانی هەکاری بینی، وەك لەباسی پێشوودا بینیمان. بەڵام ئەوەی جێگەی نیگەرانی بوو هەندێ جار دەسەڵاتدارانی عوسمانی توانای سەربازی ئەم میرنشینەیان لە بواری ناوەخۆ و تەنانەت دژی کوردانیش بەکار دەهێنا. وەکو ئەوەی لەساڵی ١٥٤٢دا سوڵتان سلێمانی قانونی فەرمانیدا بە زەینەل بەگی میری هەکاری تا لەگەڵ میرانی بادینان و برادۆست هێرش بکاتە سەر میرنشینیی موکریان، کە پاشکۆیەتیی دەوڵەتی عوسمانی ڕەتکردبۆوە و دابوویە پاڵ شا تەهماسبی سەفەوی. دوای شەڕێکی سەخت هەرسێ شازادەی موکری کوژران کە بەکاروباری میرنشینەکە ڕادەگەیشتن.[٦٦]

میرانی هەکاری لەبارێکی تریشدا دەکەوتنە ژێر هەژمونی دەسەڵاتدارانی عوسمانی، ئەمەش لەو کاتانەدا بوو کە میرێکی نوێ دەهاتە سەر دەسەڵات. چونکە ئەم میرە دەسەڵاتەکەی بەشەرعی دانەدەنرا تا فەرمانی دانرانی لەلایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە دەرنەچووبایە. سەبارەت بە سەدەی شازدەم (کە ماوەی تایبەت بەم توێژینەوەیە) لە ڕووداوەکاندا بۆمان دەردەکەوێ کە ئەم فەرمانە لە ئەستانبول و تەنانەت لەلایەن خودی سوڵتانەوە دەردەچوو.[٦٧] هەرچی والی وان بوو، سەرەڕای ئەوەی دەسەڵاتی دەرکردنی فەرمانی لادان و دانانی میرەکانی

هەکاری نەبوو، بەلام چونکە میرنشینیی هەکاری لەرووی کارگێڕییەوە لەژێر سەرپەرشتیی ئەو دابوو، زۆرجار لەم کردارەدا ڕۆڵی خۆی دەبینی. وەك ئەوەی ئەم والییە راپۆرتی خراپ لەسەر میری هەکاری بنووسێت و لای سولتان بەدناوی بکات یان کەسێکی بنەماڵەی هەکاری بۆ پۆستی میرایەتی میرنشینەکە کاندید بکات و ناوی بەرز بکاتەوە بۆ پایتەختی عوسمانی تا فەرمانی سولتانی بۆ دەربچێت.[٦٨] هەندێ جار خودی میری هەکاری لەم بوارەدا ڕۆڵی هەبوو، ئەمەش لەکاتێکدا بوو کە دەیویست کەسێکی نزیکی خۆی بکاتە میر لە شوێنی خۆی، بۆیە هەوڵی دەرکردنی فەرمانی سولتانی بۆ دەدا. وەك ئەوەی زەینەل بەگ بۆ سەیدی خانی کوڕی و دوای ئەویش بۆ زەکەریا بەگی کوڕی کردی.[٦٩]

مەسەلەی ئالوگۆڕکردنی دەسەلات لەمیرنشینیی هەکاری زۆر جار وا بەئاسانی و بێ کێشە بەڕێوەنەدەچوو، چونکە ئەم میرنشینەش وەکو زۆربەی میرنشینە کوردییەکانی تر چەندین هەرا و کێشەی لەسەر دەسەلات بەخۆوە بینیوە. کە ئەمەش ڕێگەی بۆ پیلان و دەستتێوەردانەکانی دەسەلاتدارانی عوسمانی خۆش دەکرد، و بەخراپ سوودیان لە دەسەلاتی داننان بەمیرەکان دەبینی. پێدەچێ یەکەم میری هەکاری کە دەروازەی میرنشینەکەی بۆ ئەم دەستتێوەردانانە کردبێتەوە زەینەل بەگی کوڕی مەلیك بەگ بێت. ئەم میرە کە کەسایەتییەکی دەسەلاتخواز بوو و تەنانەت کودەتای لەسەر باوکیشی کردبوو، کەوتە ململانێ لەگەڵ میر سەید بەگی مامی لەسەر پۆستی میرایەتی و لەم پێناوەشدا ڕووی لەئەستانبول کرد. هەرچەندە لە سەرەتادا داواکەی جێبەجێ نەکرا، بەلام دواجار بەهۆی پشتیوانیی ڕۆستەم پاشای سەدری ئەعزەم[٧٠] و ئەسکەندەر پاشای والیی وان توانی ڕکابەرەکەی بەکوشت بدات و بەفەرمانی سولتان سلێمان ببێتە میری هەکاری. بەپێی گوتەی شەرەفخان ئەسکەندەر پاشا کە خۆی ڕقی لەسەید محەمەد بەگی میری هەکاری بوو، ڕۆڵی گرنگی هەبوو لەم مەسەلەیەدا. چونکە لەسەر داوای ئەو فەرمانی سولتانی لە ئەستانبول بۆ زەینەل بەگ دەرچوو، هەر ئەویش بەپیلانێك سەید محەمەد بەگی میری هەکاری و یەعقوبی کوڕی لە شاری واندا کوشت، دوای ئەوەی فەرمانێکی سولتانی بۆ ئەو مەبەستە دەستەبەر کرد. لەسەر بنەمای تاوانبارکردنی ئەو میرە بەوەی کە ڕۆڵی

نێوەنـدی بینیـوە کـاتێ شـازادە مسـتەفای کـوڕی سـوڵتان سـلێمان لەگـەڵ شـا تەهماسـبی سـەفەویدا پەیوەنـدی بەسـتووە لـەدژی بـاوکی.[٧١] بێگومـان تاوانبارکردنی ئەم میرەی هەکاری ڕاست نەبوو، تەنانـەت مەسـەلەی پیلانگێڕیـی شازادە مستەفاش لەدژی باوکی بێ بنەما بوو. ئەوە زانراوە کـە خـوڕەم سـوڵتانی خێزانـی سـوڵتان سـلێمان کـە بەڕەچـەڵەك ڕووسـی بـوو لەگـەڵ ڕۆسـتەم پاشـای سەدری ئەعزەم (کە مێردی کچیشی بـوو) ئـەم پیلانـەیان گێـڕاوە لـەپێناو لادانـی مستەفا و ڕێگە خۆشکردن بۆ شازادە سـەلیمی کـوڕی سـوڵتان لـەم خێزانـەی، تـا ببێتە جێنشـینی تـەختی عوسمـانی. ئـەم پیلانەشـیان بـۆ چـووە سـەر و لەسـاڵی ١٥٥٣دا شازادە مستەفا بەبڕیاری باوکی کوژرا. [٧٢]

ئەگەر لەم بارەی پێشوودا ململانێی میرەکانی هەکاری ڕێگە خۆشکەر بوو بۆ دەستوەردانی دەسەڵاتدارانی عوسمانی لە کاروباری میرنشینەکەدا، ئەوا لەهەنـدێ باری تردا ئەم دەسەڵاتدارانە بۆ مەرامە تایبەتییەکانی خۆیان ئەم ململانێیە بـەرپا دەکـەن و تەنانـەت بـرا لـەدژی بـرای هانـدەدەن. بەمـەش میرنشـینەکە تووشـی شەڕێکی ناوەخۆیی سەخت دەکەن. وەکو ئـەوەی جەعفـەر پاشـای والیـی وان لـە سەردەمی میر زەکەریا بەگی کوڕی زەینەل بەگ کردی. ئـەم مـیرە دوای کـوژرانی باوکی لـە سـاڵی ١٥٨٥دا، بەفـەرمانی سـوڵتان کرایـە مـیری هـەکاری. بـەڵام دوای تێپەڕبوونی دوو ساڵ، جەعفـەر پاشـا ڕقـی لێـی هەسـتا و ویسـتی لـە پۆسـتەکەی لایبدا. لەمەشدا بیانووەکەی ئەوەبوو کە زاهید بەگ کوڕە گەورەی زەینـەل بەگـە، بۆیە دەبێ ئەو ببێتە میر نـەك زەکـەریا بـەگی بـرای کـە بچـووکترە. دوای ئـەوەی هـەوڵێکی زۆری دا، فـەرمانێکی سـوڵتانی بـەو ئاراسـتەیە دەرچـوو. بـەڵام هـۆز و عەشیرەتەکانی هـەکاری کـە زۆربـەیان لایـەنگیری زەکـەریا بـەگ بـوون، دژی ئـەم هەنگاوە وەسـتان و تەنانـەت زاهیـد بـەگ و کوڕەکـەی لەشـەڕدا کـوژران و بوونـە قوربانیی سیاسەتە چـەوتەکەی والیـی وان. کەچـی جەعفـەر پاشـای والـی هێشـتا دەستی لەم کارە هەڵنەگرت و بەهێزێکی زۆر و فەرمانێکی تری سوڵتانەوە، مـەلیك بەگی کوڕەکەی تـری زاهیـد بـەگی لـە جولـەمێرگ کـردە مـیری هـەکاری.[٧٣] لـەم ڕووداوە (هـەروەها لەمـەی پێشـوودا) دەردەکـەوێ کـە سیاسـەتی حکومـەتی

عوسمانی لەهەمبەر قەوارە و میرنشینە کوردییەکاندا، تاڕادەیەکی زۆر پشتی بە هەڵوێست و بۆچوونەکانی دەسەڵاتدارانی ناوچەیی و والیی ویلایەتەکان دەبەست.

بەپێچەوانەی ئەم ڕووداوەی ڕابردوو، لەبارێکدا ئەگەر دەسەڵاتدارانی عوسمانی لەمیری هەکاری ڕازیبوونایە، یان هیچ سوودێکیان لەوەدا نەبینیبا کە کێشەی بۆ دروست بکەن، ئەوا ڕکابەرەکی ئەو میرەیان دوور دەخستەوە یان پۆستی تریان پێدەدا لە شوێنێکی دووری هەکاری. هەر ئەو زاهید بەگەی کە والیی وان لەدژی زەکەریا بەگ هانیدا، پێشتر هەوڵیدابوو دەسەڵات لە زەینەل بەگی باوکی بستێنێ، بەڵام سوڵتان فەرمانیدا بە دوورخستنەوەی بۆ هەرێمی بۆسنە لەبەشی ئەورووپای عوسمانی.[٧٤]

لە مەسەلەی دانان و لابردنی میرانی هەکاری، هەندێ جار دەسەڵاتدارانی عوسمانی دەستکەوتی ماددییان ڕەچاو دەکرد، ئەگەرچی ئەو کەسەی کە فەرمانی میرایەتی بۆ دەردەچوو خاوەن ماف و شایستەی ئەو پۆستەش بووایە. وەك زەکەریا بەگی کوڕی زەینەل بەگ کە دوای ئەوەی لەلایەن جەعفەر پاشای والیی وان لە پۆستەکەی لادرا، هەروەکو لەدێرەکانی پێشوودا بینیمان، توانی سکاڵای خۆی بگەیەنێتە سینان پاشای سەدری ئەعزەم.[٧٥] ئەویش فەرمانێکی سوڵتانی بۆ دەرکرد کە میرنشینەکەی پێبدرێتەوە، بەڵام دوای ئەوەی (١٠٠) هەزار فلۆری[٧٦] ببەخشێتە گەنجینەی عوسمانی.[٧٧] لە حاڵەتێکی تردا ئەم دەستکەوتە ماددییە شێوەی بەرتیلی وەرگرتووە و لە بەرامبەردا دەسەڵاتداران تاوانی کوشتنی بێ یاسایان ئەنجامداوە. وەکو ئەوەی سینان پاشای والیی وان لەساڵی ١٥٩٦دا بۆ تەماعی پارە کەسێکی بەناوی ئەبی بەکر ئاغا گرتووە و کوشتووە کە کەتخودای زەکەریا بەگی میری هەکاری بووە.[٧٨] کەواتە سیاسەتە چەوتەکانی هەندێ لە دەسەڵاتدارانی عوسمانی نەك تەنیا میرەکانی هەکاری بەڵکو خەڵکی ناو میرنشینەکەشی گرتۆتەوە.

**باسی سێیەم:**

## پێگەی میرانی هەکاری لە ڕووداوەکانی ناوچەکە و ڕەنگدانەوەی لەسەر پەیوەندییەکانی هەردوولا :

لەماوەی سەدەی شازدەمدا کوردستان و ناوچەکە چەندین ڕووداوی گرنگیان بەخۆوە بینی، کە هەندێکیان کاریگەرییان لەسەر میرنشینی هەکاریش هەبوو. لە هەندێکی تریشیاندا ، میرانی هەکاری بەپێی توانا و کێشی خۆیان ڕۆڵیان تێدا بینی. هەروەها ئەو میرانە کۆمەڵێك پەیوەندییان لەگەڵ میرنشین و هێزەکانی دەوروبەر دامەزراندبوو. کە هەموو ئەمانە زۆرجار ڕەنگدانەوەیان لەسەر پەیوەندییەکانی میرانی هەکاری لەگەڵ دەسەڵاتدارانی عوسمانی هەبوو.

لەم چوارچێوەیەدا دەبێ سەرەتا ئاماژە بە پەیوەندیی نێوان میرانی هەکاری و بادینان بکەین، بەتایبەتی زەینەل بەگی هەکاری کە پەیوەندیی باشی لەگەڵ سولتان حوسێن بەگی میری بادینان (١٥٣٤–١٥٧٣) هەبوو، دواتر لەڕێی هاوسەرگیریی سیاسی پەیوەندییەکە بەهێزتریش بوو.(٧٩) ئەم پەیوەندییە کاریگەری لەسەر هەڵوێستی دەسەڵاتدارانی عوسمانی بەرامبەر میرنشینیی هەکاری هەبوو. چونکە کاتێك زەینەل بەگ لەلایەن سەید محەمەد بەگی مامی تەنگی پێهەڵچنرا و حوکمڕانیی هەکاری لەدەست چوو (وەکو لەلاپەڕەکانی پێشوو بینیمان)، پەنای بردەبەر سولتان حوسێن بەگ. ئەویش بەو پێگەیەی کە لەلای دەسەڵاتدارانی عوسمانی هەیبوو، ڕێگەی بۆ خۆشکرد بگاتە دەرباری سولتان سلێمان. لەوێ خودی ڕۆستەم پاشای سەدری ئەعزەم ڕێزی زۆری لێنا و بەڵێنی وەرگرتنەوەی میرنشینەکەی پێدا، ئەگەر بنەماڵەکەی لەئێران بهێنێتەوە، وەك پێشتر باسمانکرد. ئەمە لەجاری یەکەمی سەدارەتی ناوبراو دابوو،(٨٠) کە ماوەی نێوان ١٥٤٤–١٥٥٣ دەگرێتەوە.(٨١)

دیارە زەینەل بەگ هیوای زۆری بە بەڵێنەکەی ڕۆستەم پاشا هەبوو، بۆیە کە بۆ جاری دووەم پۆستی سەدری ئەعزەمی وەرگرتەوە (١٥٥٥– ١٥٦١)،(٨٢) دووبارە سەردانی ئەستانبولی کردەوە. بەڵام ناوبراو داواکەی بەجێ نەهێنا و لەجیاتی ئەوە زەعامەتێکی لە ویلایەتی بۆسنە پێبەخشی تا لەسەری بژی.(٨٣) کەواتە هەرچەندە زەینەل بەگ بەهۆی پەیوەندییەکانی سولتان حوسێن بەگەوە

توانی بگاتە دەسەڵاتدارانی باڵای عوسمانی لە ئەستانبۆل، بەڵام لەو ڕێگەیەوە نەیتوانی پۆستی میرایەتی وەربگرێتەوە. ئەمەش پێچەوانەی ئەوەیە کە هەندێ مێژوونووس نووسیویانە گوایا ناوبراو بەهۆی ئەو میرەی بادینان کراوەتەوە میری هەکاری.[٨٤] ڕاستە زەینەل بەگ دواتر بووەتە میری هەکاری، بەڵام ئەمە لە پەرەسەندنێکی دواتر و بەهەوڵ و کۆششی ئەسکەندەر پاشای والیی وان بوو (وەکو پێشتر بینیمان)، ئنجا لەکاتێکیشدا بوو کە ڕۆستەم پاشا لە پۆستی سەدارەت نەمابوو.[٨٥]

لە کۆتایی هەشتاکانی سەدەی شازدەمدا ڕووداوێکی تری هاوشێوە لەنێوان هەکاری و بادینان دووبارە بۆوە، کە هەمدیسان پەیوەندی بەدەسەڵاتدارانی عوسمانییەوە هەبوو. ئەویش پەنابردنی زەکەریا بەگی کوڕی زەینەل بەگ بوو بۆ لای سەیدی خانی میری بادینان. دوای ئەوەی لەهەمبەر فشاری مەلیك بەگی برازای، خۆی پێنەگیرا کە لەلایەن جەعفەر پاشای والیی وان پشتیوانی دەکرا. بەڵام ئەمجارەیان هەوڵ و تەقەللای میری بادینان لای دەسەڵاتدارانی پایتەخت بەرهەمی باشتری هەبوو، چونکە دوای ئەوەی زەکەریا بەگ توانی ڕاستیی کێشەکە لای ئەوان ڕوونبکاتەوە، بڕیاردرا دووبارە پۆستی میرایەتی هەکاری پێبدرێتەوە. تەنانەت سینان پاشای سەدری ئەعزەم خۆی ڕۆڵی هەبوو لەدەرکردنی ئەم فەرمانە سوڵتانییە.[٨٦] شایانی باسە ئەم دوو میرەش (واتە زەکەریا بەگی هەکاری و سەیدی بەگی بادینان) وەکو دوو میرەکەی پێشوو پەیوەندیی ژنخوازییان لەنێوان دابوو.[٨٧]

ئەگەر بگەڕێینەوە دواوە بۆ ڕووداوەکەی پێشتر، کە پەیوەستە بە پەیوەندیی نێوان زەینەل بەگی هەکاری و سوڵتان حوسێن بەگی میری بادینان، دەبینین دوو لە مێژوونووسان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە لەو سەردەمەدا میری بادینان بەهۆی پاڵپشتیکردنی میری هەکاری لای دەسەڵاتدارانی عوسمانی، وەکو چاودێر و سەرپەرشت وابووە بەسەر میرنشینیی هەکارییەوە.[٨٨] بەڵام ئەم دوو مێژوونووسە هەردووکیان لەمەدا پشتیان بەنووسەرێکی پێش خۆیان بەستووە کە ئەویش هیچ بەڵگەیەکی مێژوویی بۆ ئەمە بەدەستەوە نییە.[٨٩] بۆیە ئەم بۆچوونە قبوڵ ناکرێ، بەتایبەتی کە ئەمە لەگەڵ هەلومەرجی کارگێڕیی عوسمانی یەك

ناگرێتەوە کە بەپێی ئەوە میرنشینیی هەکاری لەژێر چاودێری و سەرپەرشتی والیی وان دابوو. یەکێ لەم دوو مێژوونووسە دواتر لە شرۆڤەیەکدا دەڵێ ئەم هەژموونەی میری بادینان، لەسەر بنەمای پەیداکردنی هاوپەیمان و کەسانی دڵسۆز بوو لەلایەنی بەرامبەردا. واتە ئەم هەژموونە کاتی بووە و پشتی بەهاوسەنگی هێز بەستووە لەنێوان میرانی بنەماڵەی دەسەڵاتدار لەهەردوو میرنشینەکەدا.[٩٠] ئەمە زیاتر لەڕاستییەوە نزیکە، چونکە دواتر کە هاوسەنگییەکە دەگۆڕێ، کارەکە پێچەوانە دەبێتەوە و تەنانەت زەینەل بەگی میری هەکاری دەستکاری کێشە ناوەخۆییەکانی بادینان دەکات، وەکو لێرە بەدوا دەبینین:

دوای مردنی سوڵتان حوسێن بەگی میری بادینان لەساڵی ١٥٧٣دا، شەڕی ناوەخۆیی لەسەر دەسەڵات بەرپابوو. دواجار ئەم شەڕە لەبەرژەوەندیی قوبادبەگی کوڕی سوڵتان حوسێن یەکلایی بۆوەو بەیرام بەگی براشی کە پەنای بردبووە بەر دەوڵەتی سەفەوی، لەوێ دەستبەسەر کرابوو.[٩١] بەڵام زەینەل بەگی میری هەکاری ئەم دەرەنجامەی بەدڵ نەبوو. سەبارەت بەهۆکاری ئەمەش شەرەفخان دەڵێ ناوبراو ڕقی زۆری لەقوباد بەگ بوو.[٩٢] بەڵام زیاتر پێدەچێ لەبەر ئەوە بێ کە ئەو سۆزی بۆ بەیرام بەگ هەبووبێ چونکە خوشکەزای خۆی بوو.[٩٣] بۆیە زەینەل بەگ هەموو هەوڵێکی خستەگەڕ تا لە بەندی ڕزگاری بکات. سەرەنجام بەسوود بینین لە پەیوەندییەکانی بە سەرداری تەورێز و بەخشینی بڕە پارەیەکی زۆر توانی لەم هەوڵەیدا سەرکەوێت.[٩٤]

بەپێی گوتەی نووسەرێك بێ سەرەتا زەینەل بەگ ڕازی نەبووە دەست لە کاروباری میرنشینیی بادینان وەربدا، کاتێ هەندێ لەسەرانی بادینان داوایان لێکردووە یارمەتییان بدا بۆ ئەوەی قوباد بەگ لابدەن و بەیرام بەگ لەشوێنی ئەو بکەنە میری بادینان. بەڵام کاتێك بەیرام بەگ لەلایەن شا محەمەد خودابەندەی سەفەوی (١٥٧٧– ١٥٨٧ز) بەند کراوە، ئەوکاتە ناچاربووە هەوڵی ڕزگارکردنی بدات. هەر ئەو نووسەرە دەڵێ زەینەل بەگ بەو کەسایەتییە بەهێز و ڕێزدارەی کە هەیبوو توانی ئاشتەوایی لەنێوان ئەم دوو برا بادینییە ساز بکات و قوباد بەگ بەوە قایل بکات کە بەیرام بەگی برای بکاتە سەرداری زاخۆ.[٩٥] بەڵام ئەم نووسەرە بەتەواوی ڕاستی نەپێکاوە و دڵنیاین کە زەینەل بەگ هەر بەوە

نەوەستاوە کە بەیرام بەگ لەبەندی ڕزگار بکات. چونکە لە بەڵگەنامەیەکی عوسمانیدا دەردەکەوێ کە ناوبراو بەکرداریش پشتیوانی لە بەیرام بەگ کردووە بۆ ئەوەی ببێتە میری بادینان. لەم بەڵگەنامەیەدا کە نامەیەکە لەساڵی ٩٩١ك (١٥٨٢-١٥٨٣ز) بۆ سوڵتانی عوسمانی نێردراوە، قوباد بەگ نووسیویەتی: "بەیرام بەگی برای بەسوود وەرگرتن لەدەرفەتی خەریکبوونی ئەو بە شەڕی ئێران، هێرشی کردۆتە سەر ئامێدی. لەمەشدا لەلایەن یاخیبووان زەینەل بەگی هەکاری و سلێمان بەگی سۆران یارمەتی دراوە". هەر لەو نامەیەدا قوباد بەگ ویستوویەتی هەڵوێستی خۆی بەهێز بکات و لەڕێی گەورەکردنی کێشەکە، سوڵتانی عوسمانی لەدژی دوژمنەکانی هانبدات. بۆیە داوای یارمەتی لەسوڵتان دەکات بۆ ئەوەی "هێرش بکاتە سەر ئەم یاخیبووانە تا لەناویان ببات چونکە دواخستنی ئەمە دەبێتە هۆی یاخیبوونی هەموو کوردانی ناوچەکەو دەرچوونیان لەگوێڕایەڵی و پاشکۆیەتی بۆ دەوڵەتی پایەبەرز". بەڵام دیارە سوڵتان کێشەکەی زۆر بەهەند هەڵنەگرتووە و بەبیانووی لەگۆڕێدابوونی شەڕی دەرەکی، یەکلاییکردنەوەی ئەم مەسەلەیەی دواخستووە.[٩٦] لەڕووداوەکانی دواتری میرنشینیی بادینانیش دەردەکەوێ کە هێرشێکی لەمجۆرە ئەنجام نەدراوە و بەڵکو دوای چەند پەرەسەندنێك بەیرام بەگ بووەتە میری بادینان و قوباد بەگیش لەلایەن هۆزەکانی بادینان کوژرا.[٩٧] کەواتە ئەم هەڵوێستەی میری هەکاری سەبارەت بە میرنشینیی بادینان، سەرەڕای نامە هاندەرانەکەی قوباد بەگ بۆ سوڵتان، هیچ کاریگەریی نەرێنی لەسەر پەیوەندیی نێوان ئەم میرەو دەسەڵاتدارانی عوسمانی نەبوو.

زەینەل بەگی هەکاری یەکێك بوو لەمیرە بەهێز وتواناکانی هەکاری، بۆیە لە سەردەمی ئەودا ڕۆڵ و هەژموونی ئەم میرنشینە لە ڕووداوەکانی ناوچەکە دیار و بەرچاو بوو. بێجگە لە میرنشینیی بادینان کە پێشتر باسمانکرد، ناوبراو دەستی لەکاروباری دەڤەری (تەرگەوەڕ)یش وەردەدا کە لە میرنشینیی برادۆست جیابببۆوە.[٩٨] ئەمەش ڕەنگدانەوەی ئەرێنی لەسەر پەیوەندییەکانی نێوان هەکاری و دەسەڵاتدارانی عوسمانی هەبوو. بەجۆرێك دەبینین زەینەل بەگ دەبێتە جێگەی پشت پێبەستنی دەسەڵاتداران و بەچەندین کاری گرنگی ڕادەسپێرن لە

ناوچەکەدا. لەباسی پێشوودا ئاماژەمان بەو ئەرکە دا کە لەلایەن خودی سوڵتان سلێمانەوە پێی سپێردرا بۆ بەشداریکردن لەهێرشکردنە سەر میرنشینی موکریان. ئەگەر ئەم ئەرکە جێگەی ستایش نەبێ ئەوا زەینەل بەگ ئەرکی تری بۆ دەسەڵاتدارانی عوسمانی ئەنجامداوە کە شانازی پێوە بکرێ. لەمەشدا مەبەستمان ئەو رۆڵەیە کە لەهێنانەوەی شەرەفخانی میری بەدلیسدا بینی. ئەم میرەی بەدلیس کە شەرەفخانی بەدلیسی مێژوونووسە، لەگەڵ میر شەمسەددینی باوکیدا پەنای بردبووە بەر شا تەهماسبی سەفەوی. بەڵام لەساڵی ١٥٧٧دا دەسەڵاتدارانی عوسمانی ویستیان ئاشتی بکەنەوە و میرنشینە بۆماوەییەکەی بۆ بگێڕنەوە کە پێشتر لێیان زەوتکردبوو. بەدلیسی خۆی دەڵێ ئەم مزگێنییە کە لەفرمانێکی سوڵتان موورادی سێیەمدا (١٥٧٤-١٥٩٥) نووسرابوو، بەهۆی خەسرەو پاشای والیی وان و زەینەل بەگی هەکاری و حەسەن بەگی مەحموودی پێی گەیشتووە. لە سەروبەندی گەڕانەوەشیدا، میرانی کوردستان هاوڕێی بوونە تا گەیشتووەتە شاری وان بۆ دیدەنیی خەسرەو پاشای والیی.[٩٩] بێگومان زەینەل بەگیش لەنێو ئەو میرانەدا بووە بەو پێیەی کە لە سەرەتادا رۆڵی لە مەسەلەکەدا هەبووە و دیارە میرنشینیی هەکاریش هاوسنووری ئێران بوو.

لە ئەنجامی هەمووو ئەمانەدا زەینەل بەگ پێگەیەکی بەرزی لای دەسەڵاتدارانی عوسمانی هەبوو. تەنانەت بەرپرسێکی بەرزی وەکو رۆستەم پاشای سەدری ئەعزەم دژایەتی بەدر بەگی میری بۆتانی دەکرد لەبەرئەوەی ناوبراو هێرشی کردبووە سەر زەینەل بەگی هەکاری کاتێ لە ئەستانبۆل بۆ هەکاری دەگەڕایەوە.[١٠٠] لەکۆڕو دیوەخانی والی وانیشدا، بەپێی فەرمانێکی سوڵتان سلێمان کەس بۆی نەبوو پێش زەینەل بەگ بکەوێ.[١٠١]

لە سەردەمی دوای زەینەل بەگیش، هەکاری هەر یەکێك بوو لەو میرنشینانەی کوردستان کە دەوڵەتی عوسمانی لەزۆر رووداو و بۆنەدا پشتی پێدەبەست. لەساڵی ١٥٩٢دا کاتێ هۆزی زێبار لە میرنشینیی بادیناندا بەردەوام بوو لە کێشەنانەوە و دژایەتیکردنی سەیدی خانی میری بادینان، میری هەکاری لەگەڵ هەردوو والیی موسڵ و دیاربەکر و میرانی بۆتان و بەدلیس و چەندانی تر لەلایەن دەوڵەتەوە ڕاسپێردرابوو بۆ لێدانی زێبارییەکان، ئەگەر واز لەم هەڵوێستەیان نەهێنن.[١٠٢]

## پوختەی توێژینەوە:

لە سەدەی شازدەهەمدا میرنشینیی هەکاری یەکێك بوو لە میرنشینە بەهێز و مەزنـەکانی کوردسـتان، بۆیـە میرانـی هـەکاری لـەم سـەردەمەدا لـەکارتێکردنی بـەردەوام دابـوون لەگـەڵ پێشـهاتەکانی ناوچـەکە. گـرنگترین پێشـهاتیش کـە لەسەرەتای سەدەکە ڕوویدا، هەڕەشەی سەفەوی بوو کـە سـەرلەبەری ناوچـەکە و هەروەها میرنشینیی هەکاریشی گرتـەوە. زاهیـد بـەگی مـیری هـەکاری هـەژموونی سەفەوی قەبوڵکرد، بۆ ئەوەی پارێزگاری لـە قـەوارەی میرنشـینەکەی بکـا. بـەڵام کاتێـك شـا ئیسـماعیلی سـەفەوی (١٥٠١–١٥٢٤) سیاسـەتی لـەناوبردنی قـەوارە کوردییەکانی پەیڕەوکرد، بڕیاری داگیرکردنـی میرنشـینیی هەکاریشـی دا. ئەمـەش وایکرد کە میری هەکاری بچێتە بەرەی عوسمـانی و لەشـەڕی چاڵدێران (١٥١٤) دا ڕۆڵێکی گرنگی گێـڕا. لەئـەنجامی ئەمەشـدا چارەنووسـی میرنشـینەکە بەدەوڵـەتی عوسمانییەوە گرێدرا و میرانی هـەکاری لـەململانێ لەگـەڵ دەوڵـەتی سـەفەویدا بـە زانیاریی هەواڵگری و هێـزی سـەربازیش پاڵپشـتیی عوسمانییـان دەکـرد، تەنانـەت زەینـەل بـەگی مـیری هـەکاری گیـانی خـۆی لـەم پێنـاوە دانـا. هـەر بـەهۆی ئـەم هەڵوێستەوە ناوچەکانی هەکاری چەندین جار تووشی شاڵاوی کاولکاریی سـەفەوی بوونەوە.

لەلایەکی تر، میرانـی هـەکاری لـەژێر سـایەی دەوڵـەتی عوسمانیـدا توانییـان پارێزگاری لە دەسەڵاتە بۆماوەییەکەیان بکەن. میرنشینیی هـەکاریش هەرچـەندە لەڕووی کارگێڕییەوە سەر بە ویلایـەتی وان بـوو، بـەڵام برێکـی زۆر لەسـەربەخۆیی نـاوەخۆیی و هێـزی سـەربازی تایبـەت بـەخۆی هـەبوو. تەنانـەت بەفـەرمی پێـی دەگـوترا "حکومـەت". لـە بەرامبـەردا هێزەکـانی میرنشـینەکە لـەزۆر بـواردا بـۆ خزمـــەتی بەرژەوەندییـــەکانی عوسمـــانی بـــەکاردەهێنران. ســـەرەڕای ئەمـــەش پەیوەندیی میرانی هەکاری و دەسەڵاتدارانی عوسمانی هەموو کات ئـەرێنی نـەبوو. بەتایبەتی کە کێشەی ناوەخۆیی و ناکۆکیی نێوان میرەکان ڕێگەی خۆش کـرد بـۆ دەسـتوەردانی دەسـەڵاتدارانی عوسمـانی لـە کاروبـاری میرنشـینەکە و تەنانـەت کوشتنی یەکێ لە میرەکان (سەید محەمەد بەگی کوڕی زاهید بـەگ). هەنـدێ جـار دەسـەڵاتدارانی عوسمـانی بـۆ بەرژەوەنـدیی تایبـەتی خۆیـان ئـەم کێشـانەیان لـە

هەکاری دەنایەوە. بەزۆریش سوودیان لەوە دەبینی کە میرەکانی هەکاری (وەکو میرە کوردەکانی تر) پێویستییان بەدانپێدانانی فەرمیی عوسمانی هەبوو تا دەسەڵاتیان بەشەرعی بناسرێ. سەرەڕای ئەمەش میرانی هەکاری کێشی سیاسی و سەربازی خۆیان لەدەست نەدا، بەجۆرێك لەزۆربەی ڕووداوەکانی ناوچەکە ڕۆڵی بەرچاویان هەبوو. لەئەنجامی ئەمەشدا هەندێ لە میرەکان بەتایبەتی زەینەل بەگ کە لەساڵی ١٥٨٥دا مردووە، پێگەیەکی دیاری لای دەسەڵاتداران هەبوو.

## پەراوێزەکان:

(١) ئەم ویلایەتە مەڵبەندەکەی (جولەمێرگ)ـەو لەباکووردا بەویلایەتی وان و لەرۆژئاوادا شیرناخ و لەرۆژهەلاتدا ئازەربیجانی ئیرانی و لەباشووریشدا بەهەردوو پارێزگای هەولێر و دهۆك دەورە دراوە. د. عەبدوڵلا غەفور، فەرهەنگی جوگرافیایی کوردستان، چ٣، دەزگای موکریانی، هەولێر ٢٠٠٨، ل٢٠٣.

(٢) ستيفن همسلي لونكريك، اربعة قرون من تاريخ العراق الحديث، ط٥، دار الرافدين، بيروت ٢٠٠٤، ص١٩–٢٠، هەروەها بڕوانە بۆچوونی (أنستانس ماري الكرملي) لە: د. عماد عبدالسلام رؤوف، دراسات وثائقية في تأريخ الكرد الحديث وحضارتهم، منشورات وزارة الثقافة، اربيل ٢٠٠٨، ص٣٧٣.

(٣) شمس الدين سامي، قاموس الاعلام، مهران مطبعه سى، مج٣، استانبول، ١٣٠٦رومي/١٨٨٩م، ص١٩٦٧، ١٨٥٢. جولەمێرگ لە کۆتایی سەردەمی عوسمانیدا شارۆچکەیەك بوو لە دووری ١١٥کم لەباشووری رۆژهەلاتی وان، بەشێکی شارۆچکەکە لەخوار شاخێکی بەردیندا بوو، لەسەر شاخەکەشدا قەلاَکە هەر مابوو. بڕوانە: هەمان سەرچاوە، مج٣، ص١٨٥٢.

(٤) لەم بارەیەوە بڕوانە: د. زرار صديق توفيق، كردستان في القرن الثامن الهجري/ دراسة في تأريخها السياسي والاقتصادي، مؤسسة موكرياني، اربيل٢٠٠١، ص١٣٢–١٣٦، رابیعە فەتاح شێخ محەمەد، کوردستان لەسەدەی پازدەی زاینیدا، چاپکراوەکانی وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر ٢٠٠٥، ل٢٤٧–٢٥٨.

(٥) شرفخان البدليسي، شرفنامة، ت: محمد جميل الملا أحمد الروژبياني، ط٢، مؤسسة موكرياني، اربيل٢٠٠١، ص٤٨٢، شمس الدين سامي، م. س، مج٦، ص٤٧٤٢.

(٦) لەم بارەیەوە بڕوانە: د. درويش يوسف حسن هروري، بلاد هكاري ٩٤٥–١٣٣٦/ دراسة سياسية حضارية، مطبعة وزارة التربية، اربيل ٢٠٠٥، ص١٩–٢٠.

(٧) المصدر نفسه ١٨–١٩.

(٨) وستان: کاتی خۆی مەڵبەندی قەزایەك بوو لە ویلایەتی وان. شرفخان البدليسي، م . س، هامش ص٢٣٤. بەلاَم دیارە ئێستا نەماوە.

(٩) هەمان سەرچاوە، ص٢٣٤.

(١٠) حسن بيگ روملو، احسن التواريخ، تصحيح: د.عبدالحسين نوايي، جزء١، انتشارات اساطير، چاپ ١، تهران ١٣٨٤، ص٥٤. زرار صديق، م . س، ص١٣٥–١٣٦.

(١١) اربعة قرون من تاريخ العراق الحديث، ص٢٠.

(١٢) زرار صديق، م . س، ص١٣٦.

[13] شــرفخان البدليســي، م . س، ص٢٣٣. شــەرەفخان دەڵــێ ڕەچــەڵەکی ئــەم بنەماڵەیــە دەچێتەوە سەر خەلیفەکانی عەباسی، بەڵام ناتوانرێ ئەمە پشتڕاست بکرێتەوە.

[14] بڕوانـە: کـاوە فریـق احمـد شـاولی ئامیـدی، امـارة بادینـان ١٧٠٠-١٨٤٢/ دراسـة سياسـية اجتماعية ثقافية، منشورات مؤسسة موكرياني/ اربيل، مطبعـة خبـات- دهـوك ٢٠٠٠، ص٣٢، ٣٣.

[15] بۆ زانیاریی زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە: رابیعە فەتاح، س . پ، ل٢٥٣-٢٥٨.

[16] شرفنامە، ص٢٤٣، ٢٤٥.

[17] بەدلیسی دەڵێ ئەختمار لەدێرزەمانەوە سـەر بەمیرنشـینیی بـەدلیس بـووە، بۆیـە لەسـاڵی ١٥٣٣دا مـیر شـەرەفخانی بـاپیری ئـەم ناوچـەیەی بەشـەڕ لـە هەکارییـەکان سـەندۆتەوە و تەنانەت سەرداری قەڵای ئـەختماریش لـە شـەڕەکەدا کـوژراوە. بڕوانـە: هـەمان سەرچـاوە، ص٦٨٤.

[18] هەمان سەرچاوە ، ص٢٤٤، ٢٤٥، ٢٥٠، ٢٥٢.

[19] د. سعدي عثمان هروتي، كوردستان والامبراطورية العثمانية/ دراسة في تطور سياسـة الهيمنـة العثمانية في كوردسـتان، مؤسسـة موكريـاني للنشـر- اربيـل، مطبعـة خـاني، دهـوك ٢٠٠٨، ص٢٥، هــەروەها: د. ســەعدی عوسمــان هــەروتی، چــەند لایــەنێکی مێــژووی ڕامیــاری و کۆمەڵایەتی و ئابووری کوردستان لە سـەردەمی عوسمانیـدا. ئـەکادیمیای کـوردی، هـەولێر ٢٠١٣، ل٨.

[20] رابیعە فەتاح، س . پ، ل٢٥٨.

[21] شرفنامە، ص٢٤٤.

[22] بڕوانە دەقی ڕاپۆرتێکی والیی دیاربەکر بـۆ سـوڵتان سـلێمانی قـانونی لەسـاڵی ١٥٢٠ز، لـە: فاضل بيات، البلاد العربية في الوثائق العثمانية/ النصـف الأول مـن القـرن ١٠هــ ١٦م، مـج١، استانبول ٢٠١٠، ص٧٦.

[23] لەم بارەیەوە بڕوانە: ڕاجر سێیڤری، ئێرانی سەردەمی سـەفەوی، و: سـەلاحەددین ئاشـتی، بنکەی ژین، سلێمانی ٢٠٠٦، ل٧٩.

[24] حسـن بـيگ روملـو، م .پ، ج٢، ص١٠١٤- ١٠٢٠، اسـكندر بـيگ تركمـان، تـاريخ عـالم آرای عباسی، ج١، چ٢، انتشارات امير كبير، چاپخانه گلشن، تهـران ١٣٥٠هـ.ش، ص٣٢- ٣٥. بـۆ وردەکاریی ئەم ڕووداوانە بڕوانە: سەعدی هەروتی، چەند لایەنێکی مێژووی...، ل١١-١٥.

[25] شرفخان البدليسي، م . س، ص٢٤٤.

[26] هەمان سەرچاوە و لاپەڕە.

(٢٧) بـۆ زانـین ئـەو میرنشـینانەی ڕووبـەڕووی لەشـکری سـەفەوی بوونـەوە دوای زیـانێکی زۆر سەرەنجام هـەر داگیر کـران. بڕوانـە: سـعدي هروتـي، كوردسـتان والامبراطوریـة العثمانیـة، ص٣٢- ٣٣.

(٢٨) شرفنامە، ص٢٤٤.

(٢٩) زۆر پێدەچێ سەردانی ئەم میرە كوردانە بۆ ئەم شارە لەساڵی ٩١٥ك ( ١٥٠٩-١٥١٠ز) بێ، چونكە هەڵمەتەكەی شا ئیسماعیل بۆ دەڤەری شێروان (كە دەكەوێتە ناوچەكانی قـەفقاس) لەم سـاڵەدا بـوو. (بڕوانـە: ڕاجـر سـێیڤری، س. پ، ل٧٩) بێگومـان شـاری (خـوی)ش كـە دەكەوێتە ئەوپەڕی باكووری ڕۆژئاوای ئێران لەسەر ڕێی ئەم هەڵمەتە بوو.

(٣٠) سـەبارەت بەسیاسـەتی سـەفەوی لـە كوردسـتاندا و هۆكارەكـانی گـۆڕینی ئـەم سیاسـەتە بڕوانە: سەعدی هەروتی، چەند لایەنێكی مێژووی...، ل١٦-١٨.

(٣١) شرفخان البدلیسي، م . س، ص٦٥٦-٦٥٨.

(٣٢) بڕوانە: ڕاجر سێیڤری، س. پ، ل٨٢.

(٣٣) شرفنامە، ص٦٥٧.

(٣٤) هـەمان سەرچـاوە، ص٦٦١، هـەروەها بڕوانـە: سـعدي هروتـي، كوردسـتان والامبراطوریـة العثمانیة، ص٦٠.

(٣٥) بۆ زانیاریی زیاتر لەبارەی ئەم شەڕە و هۆكار و دەرەنجامەكانی بڕوانـە: سـەعدی هـەروتی، چەند لایەنێكی مێژووی...، ل١٨-٣٢.

(٣٦) بڕوانە دەقی (استمالت نامە)ـەكە لە: د.عبدالحسین نوائی، شـا اسماعیـل صـفوی/ اسـناد و مكاتبات تاریخی همراه باياداشتهای تفصیلی، انتشارات ارغوان، چـاپ ٢، چـاپخانە ارژنـگ، تهران ١٣٦٨هـ.ش، ص١٨٩.

(٣٧) ناسرابوو بە محەمەد بیقللی پاشا، بووە یەكەم والیی عوسمـانی لـە دیاربـەكر دوای ئـەوەی ڕۆڵی گرنگی گێڕا لە دەرپەڕاندنی هێزەكانی سەفەوی لە ناوچەكانی كوردستان دوای شەڕی چاڵدێران. لەم بارەیەوە بڕوانە: سعدي هروتي، كوردستان والامبراطوریة العثمانیـة، ص٥٤- ٥٧.

(٣٨) بڕوانە دەقی ڕاپۆرتەكە لە: فاضل بیات، م . س، ص٧٥-٧٨.

(٣٩) بڕوانە: شرفخان البدلیسي، م . س، ص٢٤٤- ٢٤٥.

(٤٠) هەمان سەرچاوە، ص٢٤٩.

(٤١) ئەم ئەڵقەیەی ململانێیەكە دوو شـاڵاوی سـەرەكی عوسمـانی بـەخۆوە بـینی كـە یـەكێكیان لەسـاڵی ١٥٣٣ و ئـەویتریان سـاڵی ١٥٤٨ بـوو، كـە شـا تەهماسـب سـەرەتا لەبەرامبـەر هەردووكیان پاشەكشەی كرد بەڵام دواتر دەهاتەوە ناوچەكە و چەندین شـوێنی دەگرتـەوە.

لـەم بارەیـەوە بڕوانـە: اسـكندر بـیگ تركمـان، م . پ، ج١، ص٦٦- ٧٤. هـەروەها: رحلـة مطراقي زاده / لنصوح افندي السلاحي الشهير بمطراقي زاده (تـوفي بعـد ٩٥٧هــ)، ترجمـة: صبحي ناظم توفيق، تحقيق: د.عمـاد عبدالسـلام رؤوف، اصـدارات المجمـع الثقـافي، ابـوظبي ٢٠٠٣، صفحات متعددة.

[٤٢] شاه طهماسب بن اسماعيـل بـن حيـدر الصـفوي (٩١٠- ٩٨٤هــ)، تـذكرهٔ شـاه طهماسـب، انتشارات شرق، چاپ٢، تهران ١٣٦٣هـ. ش، ص٣٩.

[٤٣] حسن بيگ روملو، م .پ، ج٣، ص١٣٥٣.

[٤٤] بەگوتەی شەرەفخان ئەم میرە بۆ ماوەی نزیكەی (٤٠) ساڵ حوكمڕانی كـردووە. شـرفنامە، ص٢٤٩.

[٤٥] حسن بيگ روملو، م .پ، ج٣، ص١٣٦٧.

[٤٦] يلماز اوزتونا، تاريخ الدولة العثمانية، ت: عـدنان محمـود سـلمان، مـج١، منشـورات مؤسسـة فيصـل، اسـتانبول ١٩٨٨، ص٣٤٠، عمـاد عبدالسـلام رؤوف، دراسـات وثائقيـة في تـأريخ الكرد...، ص٢٩٥.

Colin Imber: The Ottoman Empire (1300-1650) / The Structure of Power, First Pub., by Palgrave, Great Britain, 2002, P75.

[٤٧] بڕوانە: ئـەوليا چـەلەبی، سـياحەتنامەی ئـەوليا چـەلەبی/ كـورد لـە مێـژووی دراوسـێكاندا، وەرگێڕانی: ناكام، چاپی٢، بەغـدا ١٩٧٨، ل١٩١- ١٩٣، هاممـەر، دولـت عثمانيـة تـاريخي، مترجمي: محمد عطا، جزء ٥، استانبول ١٣٣٠ رومي، ص١٤٩.

[٤٨] بڕوانە: رحلة مطراقي زادە.

[٤٩] شـرفنامە، ص٦٨٥، بێگومـان ئـەم مـیرەی بـەدلیس لەسـاڵی ١٥٣٣دا كـوژراوە (هــەمان سەرچاوە، ص٦٨١-٦٨٢) كەواتە دەبێ ئەم ڕووداوە پێش ئەم ساڵە بێ.

[٥٠] ئەمە شەڕی چلدر بـوو كـە لەسـاڵی ١٥٧٨دا ڕوویـدا و چـەند میرێكـی كـوردی تێـدا كـوژرا. بڕوانە: يلماز اوزتونا، م . س، مج١، ص٤٠٠.

[٥١] شرفخان البدليسی، م . س، ص٢٤٥.

[٥٢] هــەمان سەرچـاوە، ص٢٤٩-٢٥٠، د. شەمسـی محەمـەد ئیسـكەندەر، مێـژووی كـورد لـە سەدەی ١٦هەمدا، وەرگێڕانی: شوكور مستەفا، هەولێر ١٩٩٨، ل٩٩.

[٥٣] شرفخان البدليسي، م . س، ص٢٥٠.

[٥٤] بڕوانـە: هـەمان سەرچـاوە، ص٢٤٩، هـەروەها: شەمسـی محەمـەد ئیسـكەندەر، س . پ، ل٩٨. شایانی باسە ئەم سەرچاوەی دوایی دەڵێ ئەم ڕووداوە لەساڵی ١٥٦٣ز دابـوو، بـەلاَم پێناچێ ساڵەكە ڕاستبێ چونكە لەم ماوەیەدا هـیچ شـەڕێك لـەنێوان عوسمـانی و سـەفەوی لەئارادا نەبوو.

(٥٥) شرفخان البدليسي، م . س، ص٢٤٥، ٢٤٨.

(٥٦) هەمان سەرچاوە، ص٢٤٦.

(٥٧) هەمان سەرچاوە، ص٢٤٨.

(٥٨) ستيفن همسلي لونكريك، م . س، ص٦٠.

(٥٩) هاممەر، م . س، ج٤، ص١٧٦–١٧٨، محمد امين زكي، خلاصة تأريخ الكرد وكردستان، ترجمة: محمد علي عوني، الطبعة ٢، بغداد ١٩٦١، ص١٧١. بۆ زانیاریی زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە: سعدي هروتي، كوردستان والامبراطورية العثمانية، ص٦٣–٦٨.

(٦٠) هاملتون جيب و هارولد بوين، المجتمع الاسلامي والغرب، ترجمة: عبدالمجيد حسيب القيسي، دمشق ١٩٩٧، ج ١، ق١، ص٢٠١–٢٠٢. هەروەها بڕوانە: ئەولیا چەلەبی، س . پ، ل٣٥–٣٦.

(61) Ismail Hakki Uzunçarşili: Osmanli Tarihi, cilt. 2, Ankara, 1995, S.580

(62) Ayni Ali Efendi, Osmanli Imparatorlugunda Eyalet Taksimati, Toprak Dagitmi ve Bunlarin Mali Gucleri, Ceviren: Hadiye Tuncer, Ankara 1964, S.13.

(٦٣) ئەولیا چەلەبی، س . پ، ل٢٨–٢٩. بۆ زانیاریی زیاتر لەبارەی ئەم ماف و جیاووكانە بڕوانە: د.سعدي عثمان، كوردستان الجنوبية في القرنين السابع عشر والثامن عشر، اربيل ٢٠٠٦، ص٨٠–٨١.

(٦٤) سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبی، ل٢٠٨–٢٠٩.

(٦٥) هەمان سەرچاوە، ل٢١١–٢١٢.

(٦٦) شرفخان البدليسي، م . س، ص٤٨٧، محمد جمیل ڕۆژبەیانی، فەرمانڕەوایی موكریان، بەغدا ١٩٩٢، ل٤٧.

(٦٧) بۆ نموونە بڕوانە: شرفخان البدليسي، م . س، ص٢٤٦، ٢٤٩، سعدي هروتي، كوردستان والامبراطورية العثمانية، ص١٠٤.

(٦٨) بڕوانە: شرفخان البدليسي، م . س، ص٢٤٨–٢٤٩.

(٦٩) هەمان سەرچاوە، ص٢٤٩.

(٧٠) زاوای سوڵتان سلێمان بوو، دوو جار بۆتە سەدری ئەعزەم لەماوەی (١٥٤٤–١٥٥٣) و (١٥٥٥–١٥٦١)، كەسێكی پیلانگێڕ و بەرتیل خۆر بوو. یلماز أوزتونا، م . س، مج١، ص٣٤٩–٣٥٢.

(٧١) بۆ وردەكاریی ئەم ڕووداوانە بڕوانە: شرفنامە، ص٢٤٥–٢٤٩.

(٧٢) بڕوانە: محمد فريد بك المحامي، تاريخ الدولة العلية العثمانية، تحقيق: د.احسان حقي، دار النفائس، الطبعة ١٠، بيروت ٢٠٠٦، ص٢٤٦، يلماز أوزتونا، م . س، مج١، ص٣٤٩.

(٧٣) شرفخان البدليسي، م . س، ص٢٥٠–٢٥١.

(٧٤) هەمان سەرچاوە، ص٢٤٩، بۆ نموونەی تر لەم بارەیەوە بڕوانە: ص٢٤٧، ٢٤٨.

(٧٥) کەسێکی هەلپەرست بوو و لە سەردەمی سوڵتان موڕادی سێیەم (١٥٧٤– ١٥٩٥) سێ جار بووەتە سەدری ئەعزەم، ئەویش لە ساڵەکانی (١٥٨٠– ١٥٨٢) و (١٥٨٩– ١٥٩١) و (١٥٩٣– ١٥٩٥). يلماز أوزتونا، م . س، مج١، ص٤٠٧، ٤٢٧–٤٢٩.

(٧٦) فلۆری پارەیەکی زێڕ بوو لەبنەڕەتدا لە فلۆرەنسای ئیتالیا لێدراوە و ناوەکەشی هەر لەوەوە هاتووە، دواتر لەوڵاتە ئەوروپییەکان و هەروەها دەوڵەتی عوسمانی و هەموو ڕۆژهەڵات ناسراوە، نرخەکەی بەپێی سەردەمەکان گۆڕاوە. عباس العزاوي، تاريخ النقود العراقية، بغداد ١٩٥٨، ص١٣٠–١٣١.

(٧٧) شرفخان البدليسي، م . س، ص٢٥١، شەمسی محەمەد ئیسکەندەر، س . پ ، ل٩٩.

(٧٨) شرفخان البدليسي، م . س، ص٢٥١–٢٥٢.

(٧٩) زەینەل بەگ خوشکی خۆی دابووە سوڵتان حوسێن بەگ. أنور المايي، الأكراد في بهدينان، ط٢، مطبعة خبات، دهوك ١٩٩٩، ص١٢٤.کاوە ئامێدی، م . س، ص٣٥، ١١٧.

(٨٠) شرفخان البدليسي، م . س، ص٢٤٥–٢٤٦، ٢٤٨.

(٨١) يلماز أوزتونا، م . س، مج١، ص٣٤٩.

(٨٢) هەمان سەرچاوە، ص٣٥١.

(٨٣) شرفخان البدليسي، م . س، ص٢٤٨. زەعامەت: پارچە زەوییەکی دەرەبەگایەتییە کە لە تیمار گەورەترە و لە خاص بچووکترە، داهاتەکەی لەنێوان ٢٠ تا کەمتر لە ١٠٠ هەزار ئاقچەیە. ئاقچەش پارەیەکی زیو بوو کە وەکو درهەم وابوو. بڕوانە: عبدالرحمن شرف، فذلكة تاريخ دولت عثمانية، ط١٢، استانبول، ١٣٢٦–١٣٢٨،ص٨٣–٨٦.

(٨٤) بڕوانە: کاوە ئامێدی، م . س، ص١١٧، د. عماد عبدالسلام رؤوف، السلطان حسين الولي/ امير بهدينان ٩٤٠– ٩٨١هـ/ ١٥٣٣–١٥٧٣م، مطبعة گۆڤار، هەولێر ٢٠٠٩، ص٤٤.

(٨٥) بڕوانە: شرفخان البدليسي، م . س، ص٢٤٨–٢٤٩.

(٨٦) هەمان سەرچاوە، ص٢٥١.

(٨٧) کاوە ئامێدی، م . س، ص١١٧.

(٨٨) هەمان سەرچاوە، ص٣٤، عماد عبدالسلام، السلطان حسين الولي، ص٤٤. شایانی باسە ئەوان دەڵێن سوڵتان حوسێن بەگ هەمان هەژموونی بەسەر سۆران و بابانیشەوە هەبوو.

(٨٩) بڕوانە: محفوظ العباسي، امارة بهدينان العباسية، مطبعة الجمهورية، الموصل ١٩٦٩، ص٥٨.

(٩٠) عماد عبدالسلام، السلطان حسين الولي، ص٨٢–٨٣.

(٩١) شـــرفخان البدليســـي، م . س، ص٢٦٣. شـــەرەفخان دەڵـــێ نـــاوبراو پـــەنای بردەبـــەر شائیسماعیلی دووەمی سەفەوی، کەواتە ئەمە لەماوەی ساڵانی ١٥٧٦–١٥٧٧دا ڕوویداوە. چونکە ئەم شایە تەنیا لەم ماوەیەدا حوکمڕانی کردووە. بڕوانە: ڕاجر سێیڤری، س. پ، ل١٢٦–١٢٧.

(٩٢) شرفنامە، ص٢٦٣.

(٩٣) أنور المايي، م . س، ص١٢٥، کاوە ئامێدی، م . س، ص٣٥.

(٩٤) شرفخان البدليسي، م . س، ص٢٦٣–٢٦٤، ستيفن همسلي لونكريك، م . س، ص٦٠.

(٩٥) أنور المايي، م . س، ص١٢٥–١٢٦.

(٩٦) دفتر مهمة ٥٢، ص٨٣. بەوەرگرتن لە: عماد عبدالسلام رؤوف، دراسات وثائقية في تأريخ الكرد...، ص٢١٤–٢١٥.

(٩٧) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: شرفخان البدليسي، م . س، ص٢٦٣–٢٦٤، هەروەها: ستيفن همسلي لونكريك، م . س، ص٦٠.

(٩٨) لەم بارەیەوە بڕوانە: شرفخان البدليسي، م . س، ص٤٩٩.

(٩٩) هەمان سەرچاوە، ص٧٠١.

(١٠٠) هەمان سەرچاوە، ص٢٨٣.

(١٠١) هەمان سەرچاوە، ص٥١٠.

(١٠٢) دفتر مهمة ٧١، ص٣٦٥، بەوەرگرتن لە: عماد عبدالسلام، دراسات وثائقية في تأريخ الكرد...، ص١٦٥.

## لیستی سەرچاوەکان

**یەکەم: بەڵگەنامەی بڵاوکراوە:-**

Ayni Ali Efendi, Osmanli Imparatorlugunda Eyalet Taksimati, Toprak Dagitmi ve Bunlarin Mali Gucleri, Ceviren: Hadiye Tuncer, Ankara 1964.

د.عبدالحسين نوائي، شا اسماعيل صفوي/ اسناد و مكاتبات تاريخي همراه بایاداشتهاي تفصيلي، انتشارات ارغوان، چاپ ٢، چاپخانه ارژنگ، تهران ١٣٦٨هـ.ش.

- د. عماد عبدالسلام رؤوف، دراسات وثائقية في تأريخ الكرد الحديث وحضارتهم، منشورات وزارة الثقافة، اربيل ٢٠٠٨.
- فاضل بيات، البلاد العربية في الوثائق العثمانية/ النصف الأول من القرن ١٠هـ ١٦م، مج١، استانبول ٢٠١٠.

**دووەم: گەشتنامە و یاداشت :-**

- ئەولیا چەلەبی، سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبی/ کورد لە مێژووی دراوسێکاندا، وەرگێڕانی: ناکام، چاپی٢، بەغدا ١٩٧٨.
- رحلة مطراقي زاده / لنصوح افندي السلاحي الشهير بمطراقي زاده (توفي بعد ٩٥٧هـ)، ترجمة: صبحي ناظم توفيق، تحقيق: د.عماد عبدالسلام رؤوف، اصدارات المجمع الثقافي، ابوظبي ٢٠٠٣.
- شاه طهماسب بن اسماعيل بن حيدر الصفوي (٩١٠- ٩٨٤هـ)، تذكرهٔ شاه طهماسب، انتشارات شرق، چاپ٢، تهران ١٣٦٣هـ. ش.

**سێیەم: کتێب:-**

**أ- بەزمانی تورکی:**

- شمس الدين سامي، قاموس الاعلام، مهران مطبعه سى، مج٣، استانبول، ١٣٠٦رومي/١٨٨٩م.
- عبدالرحمن شرف، فذلكة تاريخ دولت عثمانية، ط١٢، استانبول، ١٣٢٦-١٣٢٨.
- هاممەر، دولت عثمانية تاريخي، مترجمي: محمد عطا، جزء ٥، استانبول ١٣٣٠ رومي.
- Ismail Hakki Uzunçarşili: Osmanli Tarihi, cilt. 2, Ankara, 1995.

**ب- بەزمانی فارسی:**

- اسكندر بيگ تركمان، تاريخ عالم آراى عباسى، ج١، چ٢، انتشارات امير كبير، چاپخانه گلشن، تهران ١٣٥٠هـ.ش.

- حسن بيگ روملو، احسن التواريخ، تصحيح: د.عبدالحسين نوايى، جزء١، انتشارات اساطير، چاپ ١، تهران ١٣٨٤.

**ج- بەزمانی عەرەبی:**

- أنور المايي، الأكراد في بهدينان، ط٢، مطبعة خبات، دهوك ١٩٩٩.
- د. درويش يوسف حسن هروري، بلاد هكاري ٩٤٥-١٣٣٦/ دراسة سياسية حضارية، مطبعة وزارة التربية، اربيل ٢٠٠٥.
- د. زرار صديق توفيق، كردستان في القرن الثامن الهجري/ دراسة في تأريخها السياسي والاقتصادي، مؤسسة موكرياني، اربيل٢٠٠١.
- ستيفن همسلي لونكريك، اربعة قرون من تاريخ العراق الحديث، ط٥، دار الرافدين، بيروت ٢٠٠٤.
- د.سعدي عثمان، كوردستان الجنوبية في القرنين السابع عشر والثامن عشر، اربيل ٢٠٠٦.
- د.سعدي عثمان هروتي، كوردستان والامبراطورية العثمانية/ دراسة في تطور سياسة الهيمنة العثمانية في كوردستان، مؤسسة موكرياني للنشر- اربيل، مطبعة خاني، دهوك ٢٠٠٨.
- شرفخان البدليسي، شرفنامة، ت: محمد جميل الملا أحمد الروژبيانى، ط٢، مؤسسة موكرياني، اربيل٢٠٠١.
- عباس العزاوي، تاريخ النقود العراقية، بغداد ١٩٥٨، ص١٣٠-١٣١.
- د. عماد عبدالسلام رؤوف، السلطان حسين الولي/ امير بهدينان ٩٤٠- ٩٨١هـ/ ١٥٣٣-١٥٧٣م، مطبعة گۆڤار، هەولێر ٢٠٠٩.
- كاوه فريق احمد شاولي ئاميدي، امارة بادينان ١٧٠٠-١٨٤٢/ دراسة سياسية اجتماعية ثقافية، منشورات مؤسسة موكرياني/ اربيل، مطبعة خبات- دهوك ٢٠٠٠.
- محفوظ العباسي، امارة بهدينان العباسية، مطبعة الجمهورية، الموصل ١٩٦٩.
- محمد امين زكي، خلاصة تأريخ الكرد و كردستان، ترجمة: محمد علی عوني، الطبعة ٢، بغداد ١٩٦١.
- محمد فريد بك المحامي، تاريخ الدولة العلية العثمانية، تحقيق: د.احسان حقي، دار النفائس، الطبعة ١٠، بيروت ٢٠٠٦.

- هاملتون جيب و هارولد بوين، المجتمع الاسلامي والغرب، ترجمة: عبدالمجيد حسيب القيسي، دمشق ١٩٩٧، ج ١، ق١.
- يلماز اورزتونا، تاريخ الدولة العثمانية، ت: عدنان محمود سلمان، مج١، منشورات مؤسسة فيصل، استانبول ١٩٨٨.

**د- بەزمانی کوردی:**

- رابیعە فەتاح شێخ محەمەد، کوردستان لە سەدەی پازدەی زاینیدا، چاپکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری، هەولێر ٢٠٠٥.
- ڕاجر سێیڤری، ئێرانی سەردەمی سەفەوی، و: سەلاحەددین ئاشتی، بنکەی ژین، سلێمانی ٢٠٠٦.
- د. سەعدی عوسمان هەروتی، چەند لایەنێکی مێژووی ڕامیاری و کۆمەڵایەتی و ئابووریی کوردستان لە سەردەمی عوسمانیدا. ئەکادیمیای کوردی، هەولێر ٢٠١٣.
- د. شەمسی محەمەد ئیسکەندەر، مێژووی کورد لە سەدەی ١٦هەمدا، وەرگێڕانی: شوکور مستەفا، هەولێر ١٩٩٨.
- د. عەبدوڵلا غەفور، فەرهەنگی جوگرافیایی کوردستان، چ٣، دەزگای موکریانی، هەولیر ٢٠٠٨.
- محمد جمیل ڕۆژبەیانی، فەرمانڕەوایی موکریان، بەغدا ١٩٩٢.

**هـ- بەزمانی ئینگلیزی:**

- Colin Imber: The Ottoman Empire (1300-1650) / The Structure of Power, First Pub., by Palgrave, Great Britain, 2002.

## ملخص البحث

## علاقات امراء هكاري مع المسؤولين العثمانيين خلال القرن السادس عشر

كانت إمارة هكاري تعدُّ من الأمارات القوية والكبيرة في كوردستان خلال القرن السادس عشر. لذلك كان أمراء هكاري يتفاعلون بأستمرار مع أحداث المنطقة في تلك الفترة. وكان أهم حدث في بداية ذلك القرن هو التهديد الصفوي الذي شمل المنطقة عموماً ومن ضمنها إمارة هكاري. وقد تقبَّل الأمير الهكاري زاهد بك النفوذ الصفوي، من أجل الحفاظ على كيان إمارته. ولكن حينما إتبع الشاه اسماعيل الصفوي (١٥٠١-١٥٢٤) سياسة القضاء على الكيانات الكوردية، قرر إحتلال إمارة هكاري أيضاً. وإزاء ذلك ساند الأمير الهكاري السلطان العثماني وكان له دور متميز في معركة جالديران ١٥١٤. ونتيجةً لذلك ارتبط مصير الأمارة بالدولة العثمانية وكان لأمراء هكاري دور مهم في الصراع العثماني الصفوي. حيث كانوا يساعدون العثمانيين بالمعلومات الأستخباراتية وكذلك بالقوة العسكرية. حتى ان الأمير زينل بك الهكاري فقد حياته خلال أحدى معارك ذلك الصراع. كما تعرضت المناطق التابعة للأمارة الهكارية لحملات التخريب الصفوية.

ولكن من جهة أخرى، فإن أمراء هكاري تمكنوا من الأحتفاظ بسلطاتهم الوراثية في ظل الدولة العثمانية. وعلى الرغم من أن الأمارة كانت من الناحية الأدارية تابعة لولاية وان، فإنها كانت تتمتع بقدر كبير من الأستقلال الداخلي كما إحتفظت بقوتها العسكرية الخاصة. بل انها كانت تسمى رسمياً ب "حكومت". وفي مقابل ذلك كانت القوة العسكرية الهكارية تستخدم لصالح العثمانيين في كثير من المجالات. بالرغم من ذلك فإن علاقات أمراء هكاري مع المسؤلين العثمانيين لم تكن جيدة على الدوام. وخاصة وإن المشاكل الداخلية والصراع بين الأمراء قد مهدت الطريق لتدخُّل السلطات العثمانية في شؤون الأمارة وحتى قتل أحد الأمراء (سيد محمد بك بن زاهد بك). وفي بعض الأحيان كان المسؤلين العثمانيين يخلقون تلك المشاكل في هكاري لمصالحهم الخاصة. وفي الغالب كانوا يستغلون حاجة أمراء هكاري الى الأعتراف الرسمي العثماني لكي يصبح حكمهم شرعياً. بالرغم من ذلك فإن أمراء هكاري لم يفقدوا ثقلهم السياسي والعسكري، حيث كان لهم دور ملحوظ في معظم حوادث المنطقة. ونتيجة لذلك فإن بعض الأمراء (وخاصةً زينل بك- توفي عام ١٥٨٥)، كان لهم مكانة متميزة عند المسؤلين العثمانيين.

# Abstract

## The Relations between the Emirs of Hakkari and the Ottoman authorities, During the sixteenth century

During the sixteenth century, the Emirate of Hakkari was one of the powerful and large Emirates in Kurdistan. So the emirs of Hakkari in that period were constantly interacting with the events of the region. The most important event in the beginning of the century was the threat of the Safavid, which included the region as well as the Emirate of Hakkari. The emir of Hakkari Zahid begs accepted Safavid influence, in order to preserve his emirate. But when the king of Safavid, Shah Ismail (1501-1524) implemented a policy of eliminating the Kurdish entities, decided to occupy the emirate of Hakkari, too. Because of this, the emir of Hakkari supports the Ottoman Sultan and had a distinct role in the Battle of Chalderan 1514. As a result, the Hakkari Emirate linked to the Ottoman Empire, and the emirs of Hakkari played an important role in the Ottoman - Safavid conflict. They helped Ottomans with intelligence information and military force. Even Prince Zainal beg lost his life in this way. This has exposed the emirate lands to the destruction by the Safavids.

On the other hand, the emirs of Hakkari were able to retain their genetic authorities under the Ottoman Empire. In spite of that the emirate was administratively under the auspices of vilayet of Van, they were enjoying a great deal of internal independence and had its own military force , until it was officially called the "Hukumet/ the Government". Apposite of this, the Ottomans used the Hakkari military forces in many aspects. However, the relationship between the emirs of Hakkari and Ottomans were not consistently positive. Especially, the internal problems and the conflict between the emirs had paved the way for the intervention of the Ottoman authorities in the affairs of the Emirate. Even they killed one of the emirs (Sayed Mohammad beg). In some cases, the Ottomans Officials were creating these problems in Hakkari for their own interests. They took advantage of the emirs of Hakkari need to recognize the Ottomans in order to their rule become legitimate. Nevertheless, the emirs of Hakkari did not lose their political and military powers, so they had a significant role in most of the events of the region. As a result, some of the emirs, especially Zainal beg, who died in 1585, had a privileged prestige near the Ottomans.

# سنووری باشووری کوردستان
# له پارێزگای نەینەوادا

**پ.ی.د. عەبدوڵلا غەفوور**
بەشی جوگرافیا – کۆلێژی ئاداب – زانکۆی سەلاحەددین– هەولێر

سنووری باشووری کوردستان له بەشی باشووردا، واته له پارێزگاکانی دیالا له رۆژهەڵاتدا و کەرکووك له ناوەڕاستدا و نەینەوا له رۆژئاوادا، لە لایەن کۆمەڵێك له جوگرافیازان وەکو ئازاد نەقشبەندی، سلێمان عەبدوڵلا، جەزا تالیب و شاکر خەسباك و منەوە[1] و هەروەها مێژووزانان وەکو سەعدی عوسمان[2] و دەرەجەدار و سیاسەتمەدار و ئەدەبزان و هیدیکە، لە سەری نووسراوە و شیکراوەتەوە و دەستنیشان کراوە. سەرجەمیان پێیان وایە، هەڵبەتە نووسینەکانیان به هیچ شێوەیەك رەخنەی نیگەتیڤانە، لەبەر ئەوەی زانستانە نووسراون، نایانگرێتەوە، به هێڵێك له باشووری بەدرەوە دەست پێدەکات و بە باشووری بەلەدروز و چیای حەمرین تاکو رووباری دیجله و لێرەشەوە بەو رووبارە هەڵدەگرێت و له باشووری موسڵ بەرەو رۆژئاوادا لار دەبێتەوە و بە گردەکانی مەکحول و مکێحل و عەتەشانە تێدەپەڕێت و پاشان بە باشووری تەلەعفەر و شنگاڵ بەرەو سنووری عێراق و سوریا مل دەنێت و تەواو دەبێت. کەوابێت ئەوەی دەیکەم له دووبارەکردنەوەی ئەوانەی کراوە بەدەر نابێت! نەخێر وانابێت بەڵکو مەبەستی من دەستنیشانکردنی سنوورەکەیە، زۆر بە وردی و لەسەر بنەمای ئیتنی و جوگراف و مێژوویی و کارگێڕی کەرت بە کەرت و تەنیا لە پارێزگای نەینەوادا، ئەوەش هەر لەبەر ئەوە کراوە چونکه له بەشەکانی دیکەی ئەوەندەی ئێرە ئاڵۆز نەکراوە.

توێژینەوەی بەردەست لەبەر ئەوەی لەسەر بنەمای کەرت ئەنجام دەدرێت پێویستی بە سەرلەدوونانی تۆڕی یەکە کارگێڕییەکان له ساڵانی رابردوو و ئێستادا هەیە.

## سنوور و رووپێو و ژمارهی دانیشتوانی پارێزگای نهینهوا:

پارێزگای نهینهوا له باکووری رۆژئاوای باشووری کوردستان هه‌ڵکهوتووه و هاوسنوورهکانی ئهمانهن: له باکووردا ــ پارێزگای دهۆك. له باشووردا ــ پارێزگای ئهلئهنبار (عێراق) له رۆژههڵاتدا ــ پارێزگای دهۆك و ههولێر. له رۆژئاوادا ـــ سوریا (قهزای ئهلمالکیه) (نهخشه١).

رووپێوی پارێزگای نهینهوا، بهگوێرهی دابهشبوونی کارگێڕی له ساڵی ٢٠٠٩دا ٣٧٣٢٣ کیلۆمهتری چوارگۆشه بوو. ژمارهی دانیشتوانیش ٣١٠٦٩٤٨ کهس بوو[٣].

## پێکهاتهی کارگێڕی پارێزگای نهینهوا:

پارێزگای نهینهوا له کۆتایی سهدهی نۆزدهههمهوه تاکو ئهورۆ، به مهبهستی دابهشکردنی دهسهڵاتی کارگێڕی و ئاسانکردنی کاروباری هاوڵاتییان و گهیاندنی خزمهتگوزاری بۆ ناوچهکانی دوور له سهنتهرهکانهوه ستاتوسی کارگێڕی تاك تاك گوند بۆ ناحیه و ناحیه بۆ قهزا بهرز دهکرێتهوه. ههندێ جاریش به مهرامی سیاسیش، چهند قهزایهك له ئهوانی دیکه دادهبڕێن و به ناوێکی تازه دهکرێن به پارێزگایهکی هاوشانی ئهوانی دیکه.

### سنجاقی موسڵ له ساڵی١٣٣٠ی مالی (١٩١٢ زاینی)دا.

ناوبراو له ٦ قهزا و ١٥ ناحیه پێکهاتووه[٤]. ناوهکانیان ئهوانهی خوارهوهن:

١. موسڵ. ناحیهکانی: جهەت شرقیه. شێخان. عهشایر سهبعه. جههت غربیه. زمار. شهرقات املاك امیریه هۆبه.

٢. عهقره. گوندهکانی ئاکرێ. سوورچی. زێبار.

٣. دهۆك. ناحیهکانی: گوندهکانی دهۆك. مزووری.

٤. عهمادیه. ناحیهکانی: عهمادیه. بهرواری بالا. بهراوری ژێر. رێکان. نیروه. داودیه.

٥. زاخۆ. ناحیهکانی: گوندهکانی: سلیڤانی ــ زاخۆ. سندی ــ گولی.

٦. سنجار. ناحیهکانی: سنجار. تهلهعفهر.

**لیوای موسڵ له ساڵی ١٩٦٥دا**

ناوبراو له ٨ قەزا و ٢٣ ناحیه پێکهاتووه[٥]. ناوەکانیان ئەوانەی خوارەوەن:

١. قەزای موسل. ناحیەکانی: ـ بەعشیقە. حەمدانیه. حومیدات. تلکیف.

٢. قەزای تەلەعفەر. ناحیەکانی: ـ رەبیعە. زمار. عیازیه.

٣. قەزای دهۆك. ناحیەکانی: ـ دۆسکی. زاویته. سمیل.

٤. قەزای زاخو. ناحیەکانی: ـ سلیڤانی. سندی. گولی.

٥. قەزای سنجار. ناحیەکانی: ـ سنجار. شیمال.

٦. قەزای شێخان. ناحیەکانی: ـ مەرکەزی قەزای شێخان. ئەلقوش. مزووری.

٧. قەزای عەقرە. ناحیەکانی: ـ سوورچی. عەشائر سەبعە. نەهلە.

٨. قەزای عەمادیە. ناحیەکانی: ـ مەرکەزی قەزای عەمادیە. بەرواری بالا. سەرسەنگ. نێروه و رێکان.

**پارێزگای نەینەوا له ساڵی ١٩٩٧دا:**

له ٩ قەزا و ٩ ناحیه پێکهاتووه[٦]. ناوەکانیان ئەوانەی خوارەوەن:

١. قەزای موسڵ. ناحیەکانی: ـ مەرکەزی قەزای موسڵ. بەعشیقە. حەمام عەلیل. شۆرە.

٢. قەزای حەمدانیه. ناحیەکانی: ـ مەرکەزی قەزای حەمدانیه. نەمروود. بەرتلە.

٣. قەزای تلکێف. ناحیەکانی: ـ مەرکەزی قەزای تلکێف. ئەلقوش.

٤. قەزای سنجار. ناحیەکانی: مەرکەزی قەزای سنجار.

٥. قەزای تەلەعفەر: ـ مەرکەزی قەزای تەلەعفەر. زمار.

٦. قەزای شێخان. ناحیەکانی: ـ مەرکەزی قەزای شێخان.

٧. قەزای حەزەر. ناحیەکانی: مەرکەزی قەزای حەزەر.

٨. قەزای بەعاج. ناحیەکانی: ـ مەرکەزی قەزای بەعاج.

٩. قەزای عەقرە. ناحیەکانی: ـ مەرکەزی قەزای عەقرە. عەشائر سەبعە.

**پارێزگای نەینەوا له ساڵی ٢٠٠٩دا.**

ناوبراو، له ١٠ قەزا و ٢٢ ناحیه پێکهاتبوو[٧]. ناوەکانیان ئەوانەی خوارەوەن:

١. قەزای موسڵ. ناحیەکانی: ـ سەنتەری قەزای موسڵ. بەعشیقە. شۆرە. حەمام عەلیل. قەیارە. محەلەبیە.
٢. حەمدانیە. ناحیەکانی: ـ سەنتەری قەزای حەمدانیە. نەمروود. بەرتلە.
٣. تلکێف. ناحیەکانی: ـ سەنتەری قەزای تلکێف. ئەلقۆش. وانە.
٤. سنجار. ناحیەکانی: ـ سەنتەری قەزای سنجار. شیمال. قیرەوان.
٥. تەلەعفەر. ناحیەکانی: ـ سەنتەری قەزای تەلەعفەر. زمار. رەبیعە. عیازیە.
٦. شێخان. ناحیەکانی: ـ سەنتەری قەزای شێخان. زیلکان (فاروق).
٧. حەزەر. ناحیەکانی: ـ سەنتەری قەزای حەزەر. تەل.
٨. بەعاج. ناحیەکانی: ـ سەنتەری قەزای بەعاج. قەحتانیە.
٩. مەخمور. ناحیەکانی: ـ سەنتەری قەزای مەخمور. گوێڕ. کەندێناوە. قەراج. مەلا قەرە (عەدنانیە).
١٠. سمێل. ناحیەکانی: فایدە.

شیکردنەوەی نەخشەی کارگێڕیی پارێزگای نەینەوا لە ساڵی ١٩١٢ تاکو ٢٠٠٩ دەرئەنجامی جۆراوجۆری لێ دەکەوێتەوە. هەرە لەبەر چاوەکانی، وەکو من بۆی دەچم، دەبێت ئەوانەی خوارەوەبێت.

١. زیادبوونی ژمارەی قەزا و ناحیەکان لە ئەنجامی گۆڕینی ستاتوسی کارگێڕیی هەندێك شوێنی نیشتەجێبوون. بە نموونە. ئەگەر ژمارەی قەزایەکان لە ساڵی ١٩١٢ دا شەش بووبێت ئەوە لە ساڵی ٢٠٠٩دا بوو بە دە قەزا. هەمان شت لە ژمارەی ناحیەکانیش بەرچاو دەکەوێت.

٢. دابڕاندنی قەزایەکانی دهۆك و زاخۆ و ئامێدی و ئاکرێ لە لیوای موسڵ لە رووی کارگێڕییەوە و لێك بەستنەوەیان بە ناوی لیوای دهۆك.

کەمێك بە درێژی، لەبەر ئەوەی پەیوەندی بە سنوورەوە هەیە، باس لە چۆنیەتی ئەو یەکە کارگێڕییە دەکەم.

کوردستان لە گفتوگۆیەکانیدا لەگەڵ عێراقدا، بە مەبەستی چارەسەرکردنی کێشەکانی نێوانیاندا، داوای جیاکردنەوەی" قەزایەکانی کوردی" ــ ئەوانەی زۆربەی دانیشتوانەکەی کورد بوون ـ، لە لیوای موسڵ کردووە. داواکارییەکە لەبەر ئەوەی عێراق بە رێگە خۆشکردن بۆ جیابوونەوەی دەزانی زۆر کەڕەت رەت

کراوەتەوە. بە نموونە، وەزارەتی ناوەخۆی عێراق لە وەڵامێکیدا بۆ سەرکردایەتی شۆڕش دەڵێت: ــ "نە لیوایەکی تازە دەکرێتەوە و نە هەندێ قەزا لە لیوایەك دادەبڕێت و بە لیوایەکی دیکە دەبەسترێتەوە"[(٨)]. داوایەکی لەو بابەتەوە، لەبەر ئەوەی دەستبەردان بوو لە بەشەکانی دیکەی لیوای موسڵ هەڵەیەکی مێژوویی گەورە و لە دەستدانی خاك بوو.

داواکەی کوردستان لە کۆتایی شەستەکانی سەدەی بیستەم لە لایەن عێراقەوە، دوای هەست بە قازانجکردن، رەزامەندی لەسەر درا و جێبەجێکرا.

پارێزگای دهۆك بە گوێرەی قەراری مەجلسی قیادەی سەورە ژمارە ٢١١ لە ١٩٦٩/٥/٢٧ و مەرسومی کۆماری ژمارە ١٠٦٦ لە ١٧ ئەیلول ساڵی ١٩٦٩ لە قەزایەکانی: ــ دهۆك و زاخۆ و ئامێدی و ئاکرێ کراوەتەوە[(٩)]. وەلێ قەزای ئاکرێ، تاکو ئەو کاتەی بەربەستەکانی کارگێڕی یەکلایی دەکرێنەوە، بە شێوەیێکی کاتی بە لیوای موسڵ بەسترایەوە. مەجلس قیادەی سەورە لە کۆبوونەوەی ١٩٨٠/٤/١٥ بڕیاری دەنگدانی نهێنی بۆ یەکلاییکردنەوەی چارەنووسی قەزای ئاکرێ دەرکرد. ناوبراو لە ١٩٨٠/٥/١٨ و لەسەر بنەمای دەنگدانەکە ئەو بڕیارەی دا: ــ "قەزای ئاکرێ بە سنووری کارگێڕیی ئێستاکەی بە پارێزگای نەینەوا دەبەسترێتەوە". دابڕاندنی ئاکرێ لە قەزایەکانی دیکەی پارێزگای دهۆك، کێشەی سنووری نێوان باشووری کوردستان و عێراقی پێ ئاڵۆزتر بوو.

٣. ناوهێنانی قەزای مەخمور، لە هەندێ سەرچاوەی دەوڵەتدا، وەکو یەکەیەکی کارگێڕی، لە سنووری ئیداری پارێزگای نەینەوادا.

کەمێك بە درێژی، لەبەر ئەوەی پەیوەندی بە سنوورەوە هەیە، باس لەو خاڵەش دەکەم.

مەخمور یەکێکە لە قەزایەکانی پارێزگای هەولێر و لە بەشی باشووری هەڵکەوتووە. لە ناحیەکانی مەرکەز و قەراج و کەندێناوە و گوێر و مەلا قەرە پێکهاتووە. جگە بەشێك لە دانیشتوانی ناحیەی قەراج نەبێت دەنا ئەویدیکەی هەمووی کوردە. چۆنێتی نیشتەجێبوونی عارەب لەو یەکە کارگێڕییەدا، بە گوێرەی گێڕانەوەی خەڵکی ناوچەکە بەو شێوە بوو: بەدوەکان (بدو الرحل) بە مەبەستی لەوەڕاندنی مێگەلە مەڕەکانیان لەو بەری بۆ ئەم بەرەی زێی دیجلە

پەرپیونەتەوە. موڵکدارەکان بەرەنگاریان بوونەتەوە. وەلێ بەدوەکان، گوێیان بە ناڕەزایی خەڵك نەداوە و ئاخرەکەی شەڕوشۆڕ لە نێوانیاندا قەوماوە. بەدوەکان، بۆ رازیکردنی موڵکدارەکان، بۆ لای ئاغای مەخمور هاتوون. ئەویش نەوەکو هەر ملکەچی داواکارییەکەیان نەبووە بەڵکو بە توندی لە دژیان وەستاوەتەوە. بەدوەکان، کەوتوونەتە فرتوفێڵ ـــ پیشەی باوباپیرانیان ـــ. ئەوەبوو دوو کچی خۆیان لە ئاغا مارە کردووە. ئەویش لە شوێنی ئەو چاکەیە رێگەی لەوەڕاندنی، نەوەکو نیشتەجێبوون، پێداون. وەلێ بەدوەکان بە وەندە وازیان نەهێناوە بەڵکو رەشماڵیان هەڵداوە و خانووی قوڕیان بۆ خۆیان و حەیوانەکانیان دروستکردووە و بیریان لێداوە و عەردیان زەوت کردووە و بە پشتیوانی حکومەت لەسەر خۆیان تاپۆ کردووە. بە گوێرەی زانیارییەکانی قایمقامیەتی قەزای مەخمور دانیشتوانی ئەو گوندانە لە ناحیەی قەراج عارەب نشینن ئەمانەن: ـــ رواڵە. خەربانی. مەحمودیە. گردە هارە. زاگە. تەل غەزال. عەرەبۆك. خەندەق کەبیر. خەندەق سەغیر. گرد گلێخە. قەبر سەید. پاشبەند کەبیر. پاشبەند سەغیر. لاکەچە. دۆمە ئیدریس. دۆمە عەزیز. حەدیقە. خەزرە. دیوانە. بندیان غەربی. بندیان شەرقی. حەرفوشیە. عەزیز عەبدە. عەدلە. راشیدیە. شندر تەحتانی. شندر فەوقانی. عەنکاوە. قودیلە. شەیالە. خرەبەردان. خربە حەرجان. سرناج کەبیر. کەرمردی. ئەگرەح. خرائب جەبەر.

نیشتەجێبوونی عارەب لە گوندەکانی ناحیەی قەراج، یەکێکە لەو بهانانەی کە عێراق، بۆ جیاکردنەوەی قەزای مەخمور لە پارێزگای هەولێر، لە چلەکانی سەدەی بیستەمەوە تاکو ئەوڕۆ دەستی پێوە گرتووە. عێراق لە ساڵی ١٩٤٥ تەقەلای لەو بارەوە داوە. وەلێ لەبەر بەدەنگهاتنی خەڵك و دەربڕینی ناڕەزایی لە هەموو لایەکەوە، بێ دەنگی لێوە کردووە. گۆڤارێکی ئەو سەردەمە، پێی وایە جیاکردنەوەی قەزای مەخمور و بەستانەوەی بە قەزای شەرقات لە سێ لاوەوە: ـــ هەبوونی بەربەستێکی سروشتی (زێی دیجلە). جیاوازیی زمان (لێرە کوردی و لەوێندەر عارەبی). لە دەستدانی پاوانی مەڕدارەکان ـ گونجاو نییە و زەرەری بۆ دانیشتوانی قەزایەکە لێ دەکەوێتەوە[١٠]. لەمانەش گەورەتر زەوتکردنی (اغتصاب) خاکە لە باشووری کوردستاندا. وەلی دوای بەسەرچوونی پەنجا ساڵ و

له ساڵی ١٩٩٦دا به زارەکی، واتـه بـێ دەرکردنـی مەرسـومێکی کۆمـاری کـه بـۆ کاری لەو چەشنه پێویسته، خراوەته سەر پارێزگای نەینەوا[١١]. لەگەڵ ئەوەشـدا، کاروباری کـارگێڕی و فێرکـردن و کۆمەڵایـەتی و سـەربازی، لەبـەر ئـەوەی، وەکـو دەکومێنتــەکان پــێ داگـری لـێ دەکـەن (دەکومێنتــەکان لـه لاپــەڕەکانی دواوه خراونەته بەرچاو)، یەکێکه له قەزایەکانی پارێزگای هەولێره لەو شارەوه فـەرمانی بۆ دەردەکرێت و کارمەندانی کارگێڕی پارێزگـای نەینـەواش، ناوەنـاوه، سـەردانی فەرمانگەکانی قەزایەکه دەکەن.

دەستنیشانکردنی سنووری باشـووری کوردسـتان لـەو توێژینـەوەدا، لەسـەر ئەو بنەمایانه کراوه: مێژوویی ــ واتـه ئـەو شـوێنانەی لـه کۆنـەوه کوردیـان تێـدا نیشتەجێ بووه. جوگراف ــ ناوچه شاخاوییەکان شوێنی نیشـتەجێبوونی کـورده و دەشتاییەکان (بیابانەکان) ــ عارەبه. کارگێڕی ــ دیاریکردنی سـنووری کـارگێڕی یەکـه کارگێڕییـەکان (پارێزگـا. قـەزا. ناحیـه. کـەرت) لـه باشـووری کوردسـتان و عێراقدا، بەر لەهەر شتێك، لەسەر بنەمای نەتەوەیی و عەشیرەتی، ئەنجام دراوه و دەدرێت.

سنووری باشووری کوردستان لـه پارێزگـای نەینـەوادا، لـه ڕۆژهەڵاتـەوه بـۆ ڕۆژئاوا، به ناحیه و کەرتەکانی خوارەوه، تێدەپەڕێت (نەخشـه ٢)[١٢]. بـۆ ئـەوەی کارەکه ڕێکوپێکتربووایه دەبوایه ئاماژه به سنووری جوگراف کەرتەکان بکرابوایـه. وەلێ ئەفسـووس سەرچـاوەیەکی ئـەوهام بـه دەسـت نەکـەوت و دەرفـەتی کـاری پراکتیکیشم، لەبەر نالەباری باری ئاسایشی، بۆ نەڕەخسا.

**ناحیەی نەمرود**

سنووری ڕۆژهەڵاتی کەرتی ژمـاره : ٧٨ (وردك). ٨٩ (البـزخ). ٩١ (المـره). ٩٢ (تل حمد). ٩٨ (عمر مندان).

سنووری باشووری ڕۆژهەڵاتی کـەرتی ژمـاره: ـــ ١١٦ (کـنش صـغیر). ١١٧ (کنش کبیر).

سنووری باشووری کەرتی ژماره: ــ ١٠٨ (قهاره). ١٠٧ (المیاجور ــ ابراهیم خلیل). ١٠٦ (المعدله). ١٠٥ (کبیبه). ١٠٤ (المخلط).

سنووری رۆژئاوای کەرتی نمرە: ــ ١٠٣ (الجايف). ١٠٢ (صنديج الشرق). ٨٥ (الخورطة). ٨٤ (الجرمة). ٨٣ (السيد حمد). ٨٢ (النيابيه). ٨١ (حويجه حصـان). ٨٠ (المفتيـات). ٥٠ (النابغـه). ٤٨ (السـلاميه). ٤٧ (باشـنطمان). ٤٥ (حـاوى ارسلان).

### ناحیەی عیازیە

سـنووری رۆژهـەلاتی کـەرتی: ـــ ٤٥ (امغـير). ٢٨ (عبـدان). ٢٧ (ابصـير فوقانى و تحتانى قرمز و تل دراج و مويلحات و تل عاكول)

باشووری کەرتی ٢٢ (ارفيع فوقانى و وسطاني و تحتانى).

رۆژئـاوای کـەرتی ٢٤ (المصـطاح). ٢٣ (بصـرا). ٣٦ (الشـعيريات). ١٩ (تـل عواد). ٣٣ (تل جمال).

### ناحیەی مەرکەزی حەمدانیە

سنووری رۆژئاوای کەرتی نمرە: ــ ٢١ (زنكوبه). ٢٤ (قرەقويلى الغربية). ٢٥ (بلدية قرەقوينلى). ٢٣ (قرەقوينلى الشمالية). ٣١ (قزفخرة).

### ناحیەی مەرکەزی موسڵ

سـنووری باشـووری کـەرتی:ــ ٥ (الحركـة والغابـات). ٤ (الحـاوي). ٦ (وادي الدير الشمالية). ٩ (وادى الدير الجنوبية).

سنووری رۆژئاوای کەرتی: ــ ١٩ (تل رحمان الشمالية).

### ناحیەی حمیدات

سنووری رۆژهەلاتی باشووری کەرتی: ٤٠ (الملاوى وغدير الشمالية).

سنووری باشووری رۆژئاوای کەرتی: ــ ٤١ (تل الرحمان الجنوبية).

رۆژئاوای کەرتی: ــ ٤٣ (المزلان).

سنووری باشووری کەرتی: ــ ١٨ (خربـه مشـكور). ٧١ (تـل كيصـوم). ١١٣ (السـحابى). ١١٧ (المصـايد). ١٠٥ (المـوالى الجنوبيـة). ٥٧ (الكونسـية). ٦٤ (نحاريين ــ اسكيريات).

### ناحیەی قیرەوان

سنووری باشووری کەرتی نمره: ــ ٤٩ (عين الحصان الجنوبية). ٤٠ (شـويره ابو زيد). ٣٠ (خرائج العامود والاصكع وسيبايه عزيز اغا).

سنووری رۆژهەلاتی کەرتی نمره: ــ ٧٩ (خرابة حجاب وخربة رمح). ٣٣ (ابـو بريج).

سـنووری باشـووری کـەرتی نمـره: ـــ ٣١ (هـذيل الشـرقي). ٦٥ (هـذيل الوسطي). ٨٠ (هذيل الكبير الغربي). ٦١ (تل عاكول). ٦٠ (ارفيع).

### ناحیەی قەحتانیه

سـنووری باشـووری کـەرتی نمـره: ــ ٥١/٤٧. ٥١/٤٦ (زرا حمكـى). ٥١/٤٥ (قصـــــركى). ٥١/٤٣. ٥١/٢٠. ٥١/٢١. ٥١/٢٢. ٥١/٢٣. ٥١/٢٤. ٥١/١٦. ٥١/١٤. ٥١/٨. ٥١.١٢. ٥١/١٠ و بە سنگی نمره (دعامة رقم) ٥٢ تەواو دەبێت.

## سەرچاوە و تێبینی

(١). تەماشای ئەو سەرچاوانە بکە:
ـ ئازاد نەقشبەندی. دەربارەی دەستنیشانکردنی سنووری کوردستان، سیاسەتی دەولی، ژمارە(٢) ساڵی سێیەم، تەموزی ١٩٩٤ ، ل ٢٠ ـ ٢٢.
ـ سلێمان عەبدوڵڵا، سنووری هەرێمی کوردستان لە کۆماری عێراقدا، ئەکادیمی_ کۆواری کۆڕی زانیاری کوردستان، ژمارە (٣) ساڵی ٢٠٠٥، ل ٣٢٩ ـ ٣٣٠.
ـ جەزا تۆفیق. تحدید حدود اقلیم کوردستان العراق، السلیمانیة، ص ٣٢ ـ ٣٣.
ـ شاكر خصباك، الكرد والمسالة الكردية، الطبعة الثانية، بيروت، ١٩٨٩، ص ٢٢ ـ ٢٤.
ـ عەبدوڵڵا غەفور، سنووری کوردستان، چاپی سێیەم، هەولێر ، ٢٠٠٦ ل ٤٥ .
(٢) تەماشای ئەو سەرچاوە بکە:
ـ سەعدی عوسمان، سنووری خوارووی کوردستانی باشوور لە سەدەی نۆزدەهەمدا، دهۆك، ٢٠٠٧، ل ٢٣ ـ٢٩ .
(٣) جمهورية العراق، وزارة التخطيط، الجهاز المركزي للاحصاء، المجموعة الاحصائية السنوية، ٢٠١٠ ـ ٢٠١١، ص ٩ ـ ١٠ و ٤٧.
(٤) ساڵنامەی موسڵ، ١٣٢٧ مالی/ ١٣٣٠ کۆچی/ ١٩١٢ زایینی، چەندین لاپەڕە.
(٥) الجمهورية العراقية، وزارة التخطيط، دائرة الاحصاء المركزية، قسم الابحاث والنشر، المجموعة الاحصائية السنوية العامة ١٩٦٥، مطبعة الحكومة، بغداد، ص ٣٨ ـ ٤٠.
(٦) جمهورية العراق، وزارة التخطيط، الجهاز المركزي للاحصاء، المجموعة الاحصائية السنوية، ١٩٩٧، ص ٨ ـ ٩.
(٧) جمهورية العراق، وزارة التخطيط، الجهاز المركزي للاحصاء، المجموعة الاحصائية السنوية، ٢٠١٠ ـ ٢٠١١، ص ٩ ـ ١٠ و ٤٧.
(٨) وزارة الداخلية
مديرية المخابرات السرية والسياسية
الرقم ق. س/٩٥٥
التاريخ ٢/١١/ ١٩٦٥
الى/ متصرفية لواء السليمانية
الموضوع/ رأي الحكومة في حل مشكلة الشمال
(١). نرجو تبليغ السيد عكيد صديق بان رأي الحكومة بحل مشكلة الشمال تتضمن النقاط المعروفة في الملحق (ك) المرفق لينقلها بدوره الى الملا مصطفى البارزاني.
(٢). كما ونرجو اخبارة بما يلي:

أ. لايمكن اضافة وزارة باسم وزارة الشؤون الكردية ترتبط بها الالوية الشمالية من كافة الوجوه. اذ ان معنى ذلك استقلال ذاتي مبطن. فبدلا من ان يكون اسم المسؤول عن المنطقة (حاكم) اصبح اسمه وزير وبدلا من ان يكون مقر الحاكم (السليمانية) اصبح بغداد.

ب. لايمكن احداث لواء جديد او فك اقضية من لواء وربطها بلواء آخر.

ج. لايمكن الموافقة بالاحتفاظ بالبيش مركة (العصاة المسلحين) كقوة مسلحة ثالثة بأي شكل من الاشكال.

التوقيع
صبحي عبدالحميد
وزير الداخلية

(٩) تەماشای دەقی مەرسومی کۆماری نمره ١٠٦٦ و قەراری رەقەم ٢١١و رەقەم ٥٢٩ و رەقەم ٧٥٧ بکە.

عبدالله غفور. التشكيلات الادارية في جنوبي كوردستان. الطبعة الثالثة. اربيل ـ ٢٠١٤ ص ٧٢ ص١٥١ ص ١٦٨ ـ ١٦٩

(١٠) یێکێتی تێکوشین. (ساڵ١). ژماره (٣). ل. ١ــ ٥. تەماشای گۆڤارەکە بکە لە: کوردستان سەدەی ٢١ ژمارەی ناوەڕاستی ساڵ ــ خولی دووەم ـ (١٥) ل. ٤٨٧ ــ ٤٩١.

(١١) به گوێرەی گوتەی کارمەندێکی بەڕێوەبەرایەتی کشتوکاڵ لە قەزای مەخموردا، دابڕاندن و لکانی ئەو قەزایە بە بڕیاری مەجلسی قیادەی سەورە نمرە ١١٧ بووە. ناوەرۆکی بڕیارەکە، بە گوتەی خۆی، بەو شێوە بووە.

قرار ١١٧

\الصادرة من مجلس قيادة الثورة حول اطفاء اراضي الزراعية ملك العائدة الى المواطنين الاكراد في منطقة عمل دائرة تسجيل العقاري مخمور الى وزارة المالية الجمهوريَة العراقية،

مصادرة الدور في ناحية كنديناوة العائدة للمواطنين والمسجل باسمائهم ملكا صرفا.

لا شائبة عليه ولا مانع من تسجيل معاملة مصادرة وبموجب امر محافظة نينوي الاداري/ شعبة المعلومات السكانية والمرقم ٢٢٨٦ في ٢٠٠١/١٠/٤ و قرار اللجنة المشكلة و كتابنا الرقم ١٩٦٧ في ٢٠٠٢/٧/٧ وكتاب مديرية عقارات الدولَة نينوي/ ١١١٢٧ في ٢٠٠/١٢/٢.

عەبدوللا غەفور. جوگرافیای دانیشتوانی باشووری کوردستان. هەولێر ـ ٢٠١١. ل. ٢٦٨

(١٢) (مديرية المساحة العامة). مجموعة فهارس محافظة نينوى. فهرس مقاطعات محافظة نينوى المقياس ١ : ٠٠٠ ٢٥٠



بسم الله الرحمن الرحيم

جمهورية العراق
وزارة البلديات والأشغال العامة
المديرية العامة لديوان الوزارة
قسم : القانونية و الأملاك

Republic of Iraq
Ministry of Municipalities
and Public Works (MMPW)
Ministry's Divan

وزارة البلديات والأشغال العامة
MMPW

العدد / ١٤٥٠١
التاريخ ٢٢/٨/٥٠٠٢

الى / مجلس الوزراء / الأمانة العامة
م/ قضاء مخمور ـ
**************************

نهديكم اطيب التحيات ...

ونشير الى كتابكم المرقم (ق/٢/١/١٣/٧٧٩٩) فـــــي ٢٠٠٥/٧/٢٤ ونود أعلامكم بأن قضاء مخمور تابع الى محافظة أربيل ويتألف من النواحي التالية :-

١- ناحية الكوير ومركزها الكوير .

٢- ناحية قراج ومركزها باقرته .

٣- ناحية كنديناوه ومركزها ديبكه .

٤- ناحية العدنانية ومركزها جامع الشهيد عدنان .

للتفضل بالأطلاع .... مع التقدير .

المهندسة
نسرين مصطفى برواري
وزير البلديات والاشغال العامة
٢٠٠٥/٨/٢١

نسخة منه الى

مكتب الوزير / الحاقا بكتابنا المرقم ١٣١٩ فـــي ٢٠٠٥/٨/٤ للتفضل بالأطلاع ... مع التقدير .
المديرية العامة للتخطيط العمراني / كتابكم المرقم ٢٤١٤ في ٢٠٠٥/٨/١٥ للعلم ...مع التقدير .
قسم المتابعة / الحــاقــا بكتــابنــا أعــلاه للتأشير ،
القسم القانوني والأملاك / مـــــع الاولــــيات .
محمد ٨/١٨

بسم الله الرحمن الرحيم
جمهورية العراق

Republic of Iraq
Ministry of Agriculture
Directorate General
Of Planning & Follow – up

وزارة الزراعة
دائرة التخطيط والمتابعة
القسم : المتابعة

Ref /
Date /

العدد / ١٣٨٦٤
التاريخ / ١٩/٩/٢٠٠٥

مديرية زراعة نينوى
الواردة
العدد/
التاريخ / / ٢٠٠

الى / مديرية زراعة نينوى
م/ قضاء مخمور

كتاب مجلس الوزراء / الامانة العامة المرقم ٣٢٧ في ٢٠٠٥/٨/٣٠ .
المعطوف علـــــــــى كتاب وزارة البلديات والاشغال العامة المرقم ١٤٥١ في ٢٠٠٥/٨/٢٢ ( صورة مرفقة) بعائدية قضاء مخمور ونواحيه اداريا لمحافظة اربيل ضـــمن حكومـــة اقلـــيم كوردستان/ اربيل .

لاتخاذ مايلزم ... مع التقدير

المرافقات/
صورة كتاب وزارة البلديات .

د . عبد الحسين نوري الحكيم
عـ / وزير الزراعة
٢٠٠٥/٩/١٥

نسخة منه الى :
مكتب السيــد الوزير/ للتفضل بالاطلاع ... مع التقدير .
دائرة التخطيط والمتابعة / قسم المتابعة – مع الاولويات .
الانسة امنة / للمتابعة ... مع التقدير .

٩/٢٠

بغداد – ساحة الأندلس
هاتف : ( ٧١٨٦١٠٧ – ٧١٨٦٦١١ – ٧١٩٥٣٨١ ) ١ ٩٦٤ +
بريد إلكتروني : Minis_of_agr@yahoo.com
ص . ب / ٥٩٢٣ – المركزي

ghdad – Al – Andalus Square
l: + 964 1 ( 7186107 / 7186611 / 7195381 )
Mail : Minis_of_agr@yahoo.com
Box: 5923 - Central

بسم الله الرحمن الرحيم

جمهورية العراق

وزارة الزراعة
مديرية زراعة محافظة نينوى
قسم التخطيط والمتابعة

العدد/ ٩١٢١
التاريخ/ ٢٥/٩/٢٠٠٥

الى/ محافظة نينوى / مكتب السيد المحافظ

م / قضاء مخمور

تهديكم مديريتنا اطيب تحياتها

بناءاً على ماجاء بكتاب وزارة الزراعة / دائرة التخطيط والمتابعة / قسم المتابعة المرقم ١٧٨٧٤ في ٢٠٠٥/٩/١٩ المعطوف علي كتاب مجلس الوزراء / الامانة العامة المرقم ٢٣٢٧ في ٢٠٠٥/٨/٣٠ والمعطوف على كتاب وزارة البلديات والاشغال العامة المرقم ١٤٥١ في ٢٠٠٥/٨/٢٢ حيث تم ربط قضاء مخمور ونواحيه اداريا بمحافظة اربيل ضمن حكومة اقليم كردستان / اربيل.

للتفضل بالاطلاع مع التقدير...

د. عبدالستار اسمير الرجبو
مدير زراعة نينوى

مديرية زراعة نينوى
الصادرة
العدد/
التاريخ / / ٢٠٠



نسخه منه الى/

- الاقسام كافة / للتفضل بالاطلاع مع التقدير.
- شعبة المتابعة/ للعلم الطفا.
- قسم التخطيط والمتابعة.



وزارة الموارد المائية
المديرية العامة لتشغيل وصيانة مشاريع الري
مديرية الموارد المائية نينوى

بسم الله الرحمن الرحيم



القسم / الفني
العدد: ١٢٥٢
التاريخ: ٩/١٠/٢٠٠٥

إلى/ شعبه ري القيارة
م/ قضاء مخمور

نرفق طيا صورة كتاب وزارة البلديات والاشغال العامه العدد ١٤٥١ في ٢٠٠٥/٨/٢٢ المتضمن بان قضاء مخمور تابع الى محافظة اربيل مع نواحيه الاربعه... للتفضل بالاطلاع وعدم تمشية أي معاملة تابعة للقضاء مستقبلا للاطلاع .. مع التقدير .

المرفقات
١/ صورة كتاب

يوسف وديع انطوان
مدير الموارد المائية /نينوى
٢٠٠٥/١٠/٩

نسخة منه الى/
- القسم الفني لنفس الغرض رجاء.

## ملخص البحث

تناول العديد من الباحثين الكورد موضوع تحديد الحدود الجنوبية لجنوب كوردستان مع العراق وقد حددها معظمهم بخط يمتد من جنوب بدرة مارا بغرب من بلدروز و شارەبان (المقدادية) ثم جبل حمرين ومكحول ومكيحل وصولا الى نهر دجلة، حيث يتبع من هناك مجرى النهر باتجاة الشمال ثم ينحرف غربا مارا بجنوب كل من الموصل و تلعفر وشنگال (سنجار) الى الحدود العراقية ـ السورية عند قصبة تل كوچر (اليعربية) حيث ينتهي هناك.

ان هذا البحث، وخلافا لكل البحوث والدراسات السابقة، يحدد خط الحدود على اساس المقاطعات الزراعية (انظر الخارطة رقم ٢)، وهذا يقلل، بالتاكيد، من التفسيرات المتباينة حول مسار خط الحدود المذكور.



## Abstract:

This study deals with the product of Kurdish researchers that had studied the topic of southern border of Southern Kurdistan with Iraq. Most of them specified that border with a line stretching from south of Bedre to the west of both Beledruz and shahraban(Al-Miqdadiya), and then to Hamreen Mountain, Mekhul and Mekhil, and finally reaching the Tigris river, from there on the course of the river heads northwards and after that lowers to the west, passing the south of Mosul, Telefar, and Shingal(Sinjar) and the line reaches the Iraq – Syrian border near the town of Tel Kocher(Al – Yahrubia) which ends there.

Contrary to all the previous researches and studies, this study specifies the border line on the base of the Agricultural areas(see Map, no,2), and surely this study will minimize the different interpretation about the directions of the above mentioned borderline.

# بەراوردێکی قەولی ئیزدییەکان لەگەڵ کەلامی یارسانییەکان لەبەر تیشکی سرووتە ئێرانییە رۆژئاواییەکاندا

**د. ئومید تەبیب زادە**

پ. ی. لە زمانناسیی گشتی، زانکۆی بوعەلی سینا (هەمەدان).

وەرگێڕ: د. رەحیم قادر سورخی- بەشی زمانی کوردی – زانکۆی سەلاحەددین– هەولێر

**پوختە:**

لەم وتارەدا سرووتە ئێرانییەکانمان بە دوو دەستەی گشتی دابەش کردووە:

ئەو سرووتانەی کە نەریتێکی زارەکی و کۆنیان هەبووە، و ئەو سرووتانەی کە بەدوای پێکهاتنی شیعری عەروزیی فارسی و کاریگەریی شیعری عەرەبی بەدیهاتوون. دەستەی یەکەم، بە سرووتە زارەکییەکان و دەستەی دووەم بە سرووتە نووسراوەکان ناومان بردوون و پاشڕۆڤەکردنێکی کورتی قەولی ئیزدییەکان و کەلامی یارسانییەکان، وەك دوو نموونە لە سرووتە زارەکییە (کوردییەکان)[*] لە هەندێك تایبەتمەندیی فۆرمیدا وەك بەستنەوەی ناوەوەی دەق، دێر، لادێر و سەروا پێکەوە بەراوردیان دەکەین. بە پێی گۆڕانی تایبەتمەندیيە فۆرمییەکانی قەول و کەلامەکان و سرووتە ئێرانییە رۆژئاواییەکانی دیکە، گەیشتینە ئەو ئەنجامە کە قەولی ئێزدییەکان کۆنترین جۆری سرووتە زارەکییەکانی رۆژئاوای ئێرانن، کەچی، کەلامی یارسانییەکان لەوانەیە لەبەر کاریگەریی نەریتی نووسین و بەهێزیی عەرووزی فارسی، زۆربەی تایبەتمەندییە زارەکییەکانی خۆی لەدەست دابێ، لە سرووتە نووسراوەکان نزیك بووەتەوە. لە هەمان کاتدا هەندێ تایبەتمەندیی گرنگترین سرووتە ئێرانییە رۆژئاواییەکانمان شیکردووەتەوە.

وشە سەرەکییەکان: سرووتە ئێرانییەکان، سرووتە کوردییەکان، قەولی ئیزدییەکان، کەلامی یارسانەکان.

## پێشەکی

بە بڵاوکردنەوەی سرووتە ئایینییەکان یان قەولە کوردییە ئێزدییەکان (جەلیل ١٩٧٨ . سلێمان[1] ١٩٨٥) خوێنێکی نوێ لە دەماری توێژینەوە رەچەڵەک ناسییەکانی ئێزدییەکاندا رایی بوو و باس لەبارەی ریشەی ئەم ئایینە و قۆناغەکانی بەدیهاتنی، کە ماوەیەکی درێژ بوو، بە بنبەست گەیشتبوو، سەرلەنوێ بەرەوی سەندەوە و لە سەر بنەمای نوێ دامەزرا. یەکەم بەرهەمەکانی ئەم برەوسەندنە، بڵاوبوونەوەی دوو کتێبی گرنگ بوو؛ یەکیان "ئێزدییەکان– بەستێن، داب و نەریتە دەقییەکانی" (کرێین برۆك[2] ، ١٩٩٥" و ئەوەی دیکەیان "خوا و شێخ ئادی تەواون، هۆنراوە شاراوەکان و فەرموودە ئایینییەکانی نەریتی ئێزدی"، کرێین برۆك و جندی ڕەشۆ[3]، ٢٠٠٥)ن. نووسەرانی ئەم کتێبانە بەپێی قەولی ئێزدییەکان ئاماژە بە هەندێ ڕەچەڵەك لە ئایینەکانی پێش ئیسلام و تەنانەت پێش زەردەشتیش لە ئایینی ئێزدی دەکەن و دەریانخستووە کە هەر چەند تێڕوانینە عیرفانی و ئیسلامییەکانی هەندێ ڕێبازی سۆفیگەری، دەورێکی گرنگیان لە بەدیهاتنی ئەم ئایینەدا هەبووە، بە تاکە سەرچاوەی پێکهاتنی ئەم ئایینە ناناسرێن. بە بۆچوونی ئەوان ئەو قەولە چاپکراوانەی ئێستا هەن، کە نزیکەی تەواویان لەتوێی ئەم دوو کتێبەدا کۆکراونەتەوە، دەنگنووسی کراون و بە ئینگلیزیش وەرگێڕدراون، باشترین سەرچاوەن بۆ دەرهێنانی تایبەتمەندییە نائیسلامییەکانی ئەم ئایینە. لەلایەکی دیکەشەوە، زۆربەی تایبەتمەندییە نائیسلامییەکانی ئێزدییەکان لە سرووتە ئایینییەکان یان کەلامی یارسان (ئەهلی هەق)یشدا دەکرێ بەدی بکرێ. چەندین ساڵە توێژەران ئاگاداری سرووتە ئایینییەکانی یارسان بە زاری گۆرانی هەن[٢]، بەڵام هۆگرانی تا ئەم ساڵانەی دوایی دەستیان بەم دەقانە ڕانەدەگەیشت. تا ئەو کاتەی بە بڵاوکردنەوەی دەقی کتێبی (نامەی سەرەنجام) (صفی زادە ١٣٧٥)، دەرفەتێکی زێڕین بۆ توێژەران ڕەخسا، ئەم سرووتە یارسانییانەیان لەبەردەست بێت. ئەو، سەرەڕای هێنانی دەقی شیعرەکان بە زمانی سەرەکی (کوردی)، هەموو لادێرەکانیشی دەنگنووسی کردووە و بە فارسیش وەریگێڕاون[٣].

## زمانی کوردی

زمانی کوردی لە پاڵ زمانەکانی وەك فارسی، بەلووچی و پەشتوون، لە ڕیزی زمانە ئێرانییە نوێیە ڕۆژئاواییەکان دادەنرێ. ئەم زمانە جۆری زۆر و فرە جیاوازی هەیە. جۆرەکانی کوردی بە دوو دەستەی کرمانجی و پەهلەوانی دابەش دەکەین. جۆری کرمانجی بە دوو لقی کرمانجی باکووری یان بادینانی، و کرمانجی باشووری یان سۆرانی دابەش دەبێت و جۆری پەهلەوانی بە دوو لقی گۆرانی و زازا یان دیملی دابەش دەبێت. گۆرانی جۆرەکانی وەك لەکی، کرماشانی و هەورامانی دەگرێتەوە (بڕوانە ئیزدی[4] ، ١٩٩٢: ١٧٤-١٧٢)[(٤)] لە نێوان جۆرەکانی کوردیدا، گۆرانی کۆنترین بەرهەمە ئەدەبییەکانی پێنووسراوەتەوە، تاڕادەیەك کە لە نێوان جۆرە جۆراوجۆرەکانی کرمانجی و زازادا، وشەی "گۆرانی" بە واتای ئەدەبیاتی شیعری لیریکی (غنایی) بەکاردێت. لێکۆڵینەوەکان لەبارەی شیعری کلاسیکی کوردی دەریدەخەن کە لە نێوان گشت بەرهەمە ماوەکانی شیعری کوردیدا تا سەرەتای سەدەی بیستەم، سەت و نۆزدە بەرهەم بە کوردی گۆرانی، دە بەرهەم بە کرمانجی باکووری یان بادینی و هەشت بەرهەم بە کرمانجی باشووری یان سۆرانی بووە (هەمان سەرچاوە: ١٧٩). هەروەها "نامەی سەرەنجام" کە کەلامی پیرۆزی یارسانەکانە، بە زاری گۆرانی هۆنراوەتەوە. ئەمڕۆ ژمارەی ئاخێوەرانی کوردی گۆرانی بە بەراورد لەگەڵ گشت دانیشتوانی کورد زۆر کەمە و جۆری گۆرانییەکەی بەگشتی وەك جۆری کۆن و ئەدەبی لەبەرچاو گیراوە.

## قەولی ئیزدییەکان

قەولەکان، سرووتە پیرۆزەکانی ئایینی ئێزدیین بە کوردیی کرمانجیی (ژووروو)، ئەم سرووتانە هەندێك جار تاڕادەیەك کورت و هەندێك جاریش زۆر درێژن. درێژترین قەول لە کتێبەکەی کرێین بڕۆك (١٩٩٥: ٣٠٦-٣٠٧)دا هاتووە، (١٤١ لادێڕ)و بچووکترینیشیان (٤٢) لادێرە[(٥)]. هەر قەولێك چەند بەندێك[5] و هەر بەندێکیش لە چەند لادێڕێك پێکهاتووە (زیاتر ٣ لادێری هاوسەروا). هەر بەندێك سەروای تایبەت بە خۆی هەیە، هۆی جیابوونەوە و دابەشکردنی بەندەکانیش سەروایە. ئەم نموونەیەی خوارەوە بەشێکە لە قەولێکی ئێزدی:

**قەولی داماوەکان**[٦]:

**١) هەی بەنی ئادەمۆ**

**مسکینۆ ژارۆ ئادەمۆ**

**٢) ئەڤ دنیا مەستەخانەیە**

**وەك خەونا شەڤانە**

**هەر ڕۆ یارا هێنانە**

**٣) کا سلێمان حوکم دکر**

**کا بلقیزا (نان) دکر**

**توژی خۆشبی، ئەوان دنیا ژ خۆڕا تەرك دکر**

**٤) کا سلێمان پێغەمبەران**

**کا بلقیزا ب زێڕێ زەران**

**تو ژی خۆشبی، ئەوان ژی چوون ناڤ ئاخ و بەران**

ئێزدییەکان سەرەڕای دەقە زارەکی و پیرۆزەکەی خۆیان، دوو کتێبی نووسراوی کورتیشیان بە کوردی بە ناوەکانی "جیلوە"و"مەسحەفا ڕەش" هەیە. زۆربەی توێژەران گومانیان لە متمانەپێکراوی ئەم دەقانەیە کە لە شێوەی پەخشانن و بە هۆی نەریتی زارەکی ئێزدییەکان چی وایان لە بارەوە نازانن (کرێین برۆك:، ١٩٩٥: ١٦–١١ و ٥٠–٣٨). ئەم دوو دەقە پەخشانن و لەم لێکۆڵینەوەیەدا لەمە زیاتریان لەبارەوە نادوێین[٧].

**کەلامی یارسانەکان**

کەلامەکان سرووتە پیرۆزەکانی یارسانییەکان بە کوردیی گۆرانیین. قەبارەیان جۆراو جۆرە. بە شێوەی لادێری هاوسەروا لە بەندی جۆراوجۆردا ڕێکخراون. لێرەدا چەند بەشێك لە "بارگە بارگە"ی کتێبی "نامەی سەرەنجام" دەخەینە ڕوو (صفی زادە، ١٣٧٥: ٤٦ و ٩٢)[٨].

بەندی١. کەردەی١:

**پیر سلێمان سیستانی مەرمۆ**

**ئەو کۆی کەس نەزان، ئەو کۆی کەس نەزان**

**بارگەی شام وستان ئەو کۆی کەس نەزان**

**مەردان مەگێڵان قاف تا قاف جەهان**
**شام ها نە جامەی شەرت و ڕای دیوان...**

بەندی ١– کەردەی ٢:
**ئەو کابەی ئەقدەم، ئەو کابەی ئەقدەم**
**بارگەی شام وستان ئەو کابەی ئەقدەم**
**یاران نە جەم دا دل باران وەهەم**
**هەرگیز نەستانان بەشی زیاد و کەم**

**بەستنەوەی ناوەوەی دەق**

مەبەست لە بەستنەوەی دەق[6] ، ئەو پێوەندی و یەکێتییەیە کە بەهۆی کەرەستە فۆرمییەکان، لە نێوان بەشە جۆراوجۆرەکانی دەقێك یان وردە دەقەکانی دەقێکی گەورەتر بەدی دێت. بە واتایەکی دیکە، لەم وتارەدا، بەستنەوەی ناوەوەی دەق هەموو ئەو هۆکارانە دەگرێتەوە کە دەبنە هۆی دەقایەتی[7] لە چەند پارچەدا، بە جۆرێك کە بەبێ ئەم بەستنەوەیە، دەقەکە دەبێتە چەند پارچەیەك کە بە هەموو شێوەیەك دەکرێ لەپاڵ یەکتریان دابنێی (بڕوانە، پرێمینگێر و بروگان[8]، نێوان دەقایەتی[9]). سرووتە ئێزدییەکان و کەلامی یارسانییەکان هەردووکیان لە نەریتێکی زارەکییەوە هاتوون. بەڵام لەوانەیە ئازادیی زیاتری ئەهلی هەق لە ئێران پێوەندییان لەگەڵ کۆمەڵە ڕۆشنبیرییەکان و ئەدەبی فارسیدا بووەتە هۆی ئەوەی کە سرووتەکانیان بەشێکی گەورەی تایبەتمەندییە زارەکییەکانیان لەدەست بدەن. گرنگترین و بەرچاوترین دەرکەوتنی ئەم جیاوازییانە دەکرێ لە ڕادەی تایبەتمەندییە پێوەندیدارەکان بە بەستنەوەی ناوەوەی دەق لە قەولی ئێزدییەکان و کەلامی یارسانەکاندا ببینرێ.

قەولی ئێزدییەکان بۆ یەکەم جار لە کۆتاییەکانی دەیەی حەفتای سەدەی بیستەمدا تۆمار کرا و پاشان لە ڕێگای هەوڵی مەیدانیی توێژەرانەوە، بەرە بەرە ژمارەیان زیاد بوو. بەر لەوە کتێبێك کە قەولی ئێزدییەکانی لەخۆ گرتبێت، نەبوو و پاش ئەوەش ڕێسا تۆمارکراو و نووسراوەکانی ئەم گوتانەش بەبێ هیچ ڕیزبەندییەکی تایبەت، لەپاڵ یەکتر ڕیزکراون. هەڵبەت پەیکەرەی نەریتە

زارەکییەکان، وەك دەقێکی درێژ کە ژێر دەقی بچووکتر دەگرێتە بەر، بەردەوام هۆکاری بەستنەوەی ناوەوەی تایبەتییان هەبووە، بەڵام ئەم هۆکارانە بەر لە هەر شت، پشتی بە بیری جەماوەر یان کەسانێك بەستووە کە بەرپرسی لەبەرکردن و پاراستنی ئەم دەقانە بوون. بۆ نموونە ئەم هۆکارانە لە قەولی ئێزدییەکاندا بەستراوە بە بیری قەول بێژ (قەوال)ەکانەوە کە ئەرکیان ئەوە بووە، قەولەکان لە باوباپیرانیان فێربن و لەگەڵ گوتنەوەیان لە رێورەسمە جۆراوجۆرەکاندا، فێری نەوەکانی دوای خۆشیان بکەن.

نەبوونی هۆکارەکانی بەستنەوەی دەق لە دەقە زارەکییەکانی ئێزدییەکاندا تایبەتمەندییەکی هەموو دەقە زارەکییەکانە و شێوە لێکچووەکەی لە زۆربەی نەریتە ئێزدییەکاندا دەکرێ بدۆزرێتەوە. بۆ نموونە هۆنراوە عامیانە فارسییەکان لەو دەقە زارەکییانەن کە هیچ کات مەگەر بە مەبەستی ئیتنیك ناسی و زمانناسی و لەوانە — کۆنەکراونەتەوە و نەنووسراونەتەوە، لەو بوارانەش کە ئەم هۆنراوانەیان تۆمارکردووە، ئەوانەیان بە شێوەی پارچەی لێکدابڕاو و بەبێ هیچ ریزبەندییەکی تایبەت، لە پاڵ یەکدا داناون (طبیب زادە، ١٣٨٢).

ئەم هۆنراوانە بەردەوام سینگ بە سینگ گوازراونەتەوە و کەسێك بۆ فێربوونیان بە دوای کتێبدا ناگەڕێ. لە نێوان ئەم هۆنراوانەدا بەستنەوە نییە و ئەگەر بڕیار بێت، رۆژێك هەموویان کۆبکەنەوە، دەبێ شێوەیەکی تایبەت بۆ ریزبەندی و پۆلینکردنیان دابهێنن. ئەدەبی جەماوەری ناوچە جۆراوجۆرەکانی ئێران، لە شیعر و گۆرانی تا دەگاتە مەتەڵ و هەقایەتە جۆراوجۆرەکان، وەك قەولی ئێزدییەکان، هەموویان سەر بە نەریتێکی زارەکی زۆر کۆنن کە پێش ئیسلام لە ئێراندا باو بووە و هەمووشیان لەبەر زارەکی بوونیان هیچ جۆرە هۆکارێکی فۆرمی بەستنەوەی ناوەوەی دەقیان نەبووە:

" لە ئێرانی پێش ئیسلامدا نەریتی تۆمارکردنی بەرهەمە ئەدەبی و ئایینییەکان زۆر باو نەبووە. بەشێوەیەك کە بۆ ماوەیەکی زۆر ئەم ئاسەوارە چەندین سەدە سینگ بە سینگ هاتوون و.... کتێبی ئاڤێستا چەندین سەدە سینگ بە سینگ پارێزراوە تا سەرئەنجام لە سەردەمی ساسانییەکان نووسراوەتەوە و لەپاش ئەوەش پێشەوایانی ئایینی بۆ بەرێوەبردنی ئایینەکەیان

کـەمتر گەڕاونەتـەوە سـەری و هـەر لەبـەر خوێندوویانەتـەوە". (تفضـلي، ١٣٧٦: ١٣).

هەڵبـەت هـەبوونی ناوەنـدی بەربـەرینی پێوەنـددار پێکـەوە لـە سـەردەمی ساسانی و چاودێریی سەرچاوە و مەرجەعە گـەورە دیـنی و دەوڵەتییـەکان بەسـەر کاری ئەو ناوەندانەدا، ببووە هۆی ئەوەی کە دەقی زەردەشـتەکان ریزبەندییـەکی تایبـەت بـەخۆی وەربگـرێ و فێربوونیشـیان هاوکـات لەگـەڵ فێربـوونی ئـەو دابەشـکردنانەی نـاوەوەی دەق بـەدی بێـت. بـەڵام دەقـە زارەکـی و ئێزدییـەکان، لەبـەر پـرش و بڵـاوی و لـە پێوەندیـدا نـەبوونی ناوەنـدە ئێزدییـەکان و نـەبوونی مەرجەعیـەتێکی بـەهێز بـە ڕواڵـەت لـە نـاوەوە نەبەسـتراونەتەوە، بەڕادەیـەك کـە قەولبێـژەکان ئـەم دەقانـە بـەبێ هـیچ ریزبەندییـەکی تایبـەت لەبەردەکـەن و هـەر کامەیان، تەنیا بەبۆنەی ڕێوڕەسمێك کە تێیدا بەشـدارن، بـۆ جـەماوەر دەڵێنـەوە. لـەم واتایـەدا، دەکـرێ هۆکـاری بەسـتنەوەی نـاوەوەی دەق لـە دەقـە زارەکییـە ئێزدییەکاندا سەر بە نەریتی زۆر کۆنتر لە نـەریتی زارەکـی دەقـە زەردەشـتییەکان لەپێش نووسینەوەیان دابنرێ.

بەسترانەوەی نـاوەوەی دەقـە یارسـانییەکان، فـۆرمێکی زۆر ورد و تۆکمـەی هەیە. گرنگترین کەلامەکانی یارسان لە کتێبێکی سەربەخۆدا بە ناونیشانی "نامەی سەرەنجام" کە هەموو سرووتەکانی سوڵتان ئیسحاق و یارانی بە گۆڤەری کـوردیی گۆرانییە، کۆکراوەتەوە و چاپ کراوە. شـێوەی ڕێکخسـتنی نـاوەرۆکی کتێبەکـە و دابەشکردنی کەلامەکان، ئەوە دەگەیەنێت کە ئەم کتێبە، بـەر لـە چـاپی ئێسـتای چـەندین جـار سـاغ کراوەتـەوە، ڕێکخـراوە و لەبـەری گیراوەتـەوە. ڕێکخسـتنی ناوەرۆك لە"نامەی سەرەنجام"دا، وەك کتێبی پیرۆز یان قورئان ئەوەندە ورد نییە کە بکرێ بە دیاریکردنی سـوورەت یـان ژمـارەی ئایەتـەکانی لادێـڕ یـان دێرەکـانی بدۆزییـەوە، بـەڵام لـەم ڕووەوە هێنـدە لـە ئاڤێسـتا دەچـێت، کـە دەکـرێ بـە نموونەیـەکی لەبـەرگیراوەی دابنـرێ. نامـەی سـەرەنجام شـەش بەشـە کـە ڕیزبەندییەکی تایبەتییان هەیە. ئەم شـەش بەشـە کـە دابەشـکردنێکی تایبـەتییان هەیە، بریتین لە: بارگـە بارگـە، دەورەی هەفتەوانـە، گلـێم وەکـۆڵ، دەورەی چـل تەن، دەورەی ئابدین و دەورەی وردە سەرەنجام.

بارگە بارگە کە گرنگترین بەشی نامەی سەرەنجامە، لە حەفتا و دوو بەند بە ژمارەی لەدوای یەك هاتووە کە هەر بەندێکی لە چەند کەردەیەك و هەر کەردەیەکیش لە چەند لادێر دروست بووە. ئەمە ڕاست ئەو شێوازەیە کە لە ڕێکخستنی بەشەکانی "یەسناکان" لە ئاڤێستادا بەکار هاتووە. هەڵبەت ئەم دابەشکردنانە لە بەشەکانی دیکەی ئاڤێستادا شێوەیەکی سادەتر بەخۆ دەگرێ، بۆ نموونە بەشی"دەورەی هەفتەوانە" شەست بەند دەگرێتەوە، بەشی"گلێم وەکۆڵ" بیست و نۆ بەند، بەشی"چل تەن" شەست بەند و "دەورەی ئابدین" سی و دوو بەندە و هەرکام لە بەندەکانیش لە چەند دێڕێك پێکهاتوون. لەم بەشانەدا بەندەکان بە کەردە دابەش نەکراون. بەشی کۆتایی، واتە "وردە سەرەنجام"، بریتییە لە هەندێ باس بە پەخشان و بە هۆنراوە و هیچ دابەشکردنێکی بۆ نەکراوە. هەر وەك ئاماژەمان پێدا، هۆکارەکانی بەستنەوەی ناوەوەی دەق لە کەلامی یارسانییەکاندا ڕاست وەك ئاڤێستایە. بۆ نموونە بڕواننە شێوەی ڕێکخستنی ناوەرۆکەکان لە بەشی یەکەمی ئاڤێستا (یەسناکان) و بەشی یەکەمی نامەی سەرەنجام (بارگە بارگە):

I– ئاڤێستا — I– نامەی سەرەنجام

١–١ یەسناکان (٧٢ هات) — ١–١ بارگە بارگە (٧٢ بەند)

١–١–١– هاتی یەکەم (٢٣ بەند) — ١–١–١ بەندی[1] (دوو کەردە)

١–١–١–١ بەندی یەکەم (پێنج دێر بێ ژمارە دانان)

١–١–١–١ کەردەی یەکەم (١٢ لادێر بێ ژمارەدانان)

١–١–١–٢ بەندی دووەم (پێنج دێر بێ ژمارە دانان)

١–١–١–٢– کەردەی دووەم (٦ لادێر بێ ژمارەدانان)

١–١–٢– هاتی دووەم (١٨ بەند) — ١–١–٢– بەندی ٢ (٢کەردە)

١–١–٢–١– بەندی یەکەم (٩ دێڕی بێ ژمارە)

١–١–٢–١– کەردەی یەکەم (٣ دێڕ بەبێ ژمارە)

١–١–٢–٢– بەندی دووەم (٥ بێ ژمارە)

١–١– ٢–٢– کەردەی دووەم (١٠ دێڕ بێ ژمارە)

.... ..... ....

لێکچوونی ئاڤێستا و نامەی سەرەنجام لەوە زیاترە کە بە هەڵکەوتی دابنێین. ئەم گریمانەیەش کە هەر دوو کتێبەکە بەپێی نەریتێکی هاوبەش دابەشکردنی تەواو یەکسانیان هەیە، جێگای تێڕامانە. دابەشکردنەکانی ئاڤێستا، چ ئەوانەی لە دەستنووسە کۆنەکاندا هەبوون و چ ئەوانەی ڕۆژهەڵاتناس و وەرگێڕە ڕۆژئاواییەکانی ئاڤێستا، بۆ ئاماژەدانەوەی ئاسان بە باسەکانی ئاڤێستا پێیان زیاد کردوون، زیاتر لایەنی مەرجەداریان هەیە یان بەپێی نیشانە بابەتییەکان پێکهاتوون (بڕوانە هومباخ[10] ، ١٩٩١: ٦٠-٥٦). بەڵام دابەشکردنەکانی باسەکان لە نامەی سەرەنجامدا هەم بەپێی نیشانە بابەتییەکان و هەم بەپێی پێوەرە فۆرمییەکان پێکهاتووە. بۆ نموونە هەر کام لە بەندەکانی بەشی "بارگە بارگە" لەسەر بابەتی تایبەت دەسووڕێن. سەرەڕای ئەوەش، یەکەم، هەربەندێك بەناوی پیرێك یان سەییدێك دەست پێدەکات کە لادێڕەکان دراونەتە پاڵی، دووەم، یەکەمین لادێڕی هەر بەند و کەردەیەك لە وشەیەکی دووبارەکراو دروست بووە. سێیەم، هەموو لادێڕەکانی هەر کەردەیەك هاوسەروان و بە گۆڕانی کەردەکان سەرواکانیش دەگۆڕێن. ئەم نموونەیەی خوارەوە، دابەشکردنی بەند و کەردەکانی لە چەند بەندی "بارگە بارگە"دا دەخاتە ڕوو (صفی زادە، ١٣٧٥: ٤٦ و ٩٢).

بەندی ١- کەردەی (١): پیر سلێمان سیستانی مەرمۆ: ئەو کۆی کەس نەزان/ ئەو کۆی کەس نەزان

بارگەی شام وستان ئەو کۆی کەس نەزان/ مێردان مەگێلان قاف تا قاف جەهان...

بەندی ١- کەردەی (٢): ئەو کابەی ئەقدەم، ئەو کابەی ئەقدەم/ بارگەی شام وستان، ئەو کابەی ئەقدەم/ یاران نەجەمدا دل باران وە هەم...

بەندی ٢ کەردەی (١): پیر قابیل سەمەرقەندی مەرمۆ: ئەو کوهی و ئەهلی، ئەو کوهی و ئەهلی/

بارگەی شام وستەن، ئەو کوهی و ئەهلی...

بەندی ٣- کەردەی (١): پیر روکنەدین مەرمۆ: ئەو دڵی دەری، ئەو دڵی دەری/ بارگەی شام وستەن ئەو دڵی دەری/ ها بنیامینەن شەریك و سەری...

بەندی ٤– کەردەی (١): پیر میکائیل دودانی مەرمۆ: ئەو کۆی عەربەتی، ئەوکۆی عەربەتی/ بارگە شام وستەن ئەو کۆی عەربەتی/ حیرس و نەفس بودەن ئیمان قووەتی...

بەندی ٤– کەردەی (٢): نەوزەر شای کیان، نەوزەر شای کیان/ شام بی نە ئەو دەم نەوزەر شای کیان/ شام بنیامین بی چوگانو زەمان...

هەموو ئەمانە دەریدەخەن کە دابەشکردنەکانی(نامەی سەرەنجام) نەك تەنیا هەر لەسەر بنەمای ئاڤێستا کراوە، بەڵکو ئەم کارە خۆی هۆنەر یان هۆنەرانێك هاوکات لەگەڵ هۆنینەوەی هۆنراوەکان کردوویانە. لە پێشەکی "نامەی سەرەنجام"دا هاتووە کە کەلامەکانی ئەم کتێبە لەلایەن سوڵتان ئیسحاق و یارانییەوە لە سەدەی حەوتەم و هەشتەمی کۆچی گوتراوە (صفی زادە: ١٣٧٥: ٤٥–٢)، بەڵام لەبەر لێکچوونی لە ڕادەبەدەری نێوان دابەشکردنەکانی(نامەی سەرەنجام) و دابەشکردنی گێڕانەوەکانی ئەم دواییانەی ئاڤێستادا هەیە، زۆر ئەستەمە کە ئەم کەلامانە لە سەدەی حەوت یان هەشتدا بەم شێوەیە هۆنرابێتەوە. تەنانەت ئەم ئەگەرەش کە ئەم هۆنراوانە سینگ بەسینگ بە دەورەکانی دواتر گەیشتبن و پاشان بە شێوەی ئێستا ڕێکخرابن و نووسرابێنەوە، مەنتیقی نایەتە بەرچاو، چونکە هاوسەرواکردنی لادێرەکانی هەر بەند و کەردەیەك، ناکرێ کاری کەس جگە لە هۆنەر یان هۆنەرەکانی ئەم کەلامانە بێت. لە پێشەکی کتێبەکەدا هاتووە کە نامەی سەرەنجام لەبەر دوو دانەی دەستنووسی ساڵانی (١٣١٥ و ١٣٤٢ ك.م) ساغ کراونەتەوە و وەرگێڕدراون (صفی زادە ١٣٧٥: ٢١). شیمانە دەکرێ کاتی گوتن و سرووتنی کەلامەکانیش – بەو شێوەیەی لەم کتێبەدا هاتووە، لە کاتی نووسینەوەیان، لەو دوو دانەیەی ئاماژەیان پێکرا، زۆر کۆنتر نەبێت.

لەهەر حاڵدا، بەپێی هۆکارەکانی بەستنەوەی ناوەوەی دەق، لێبڕاوانە دەکرێ قەولی ئێزەدییەکان زۆر کۆنتر لە کەلامی ئەهلی هەق دابنرێت. قەولەکان، لەوانەیە لەبەر دابڕانی ئیزدییەکان و دوورە پەرێزییان لە گەل و کەلتوورە دراوسێکانیان، زیاتر بە شێوە سەرەتاییەکانیان وەفادار مابێتنەوە، بەڵام هۆکارەکانی بەستنەوەی ناوەوەی دەق لە کەلامی یارسانەکاندا، لانی کەم بەو

جۆرەی کە لە کتێبی "نامەی سەرەنجام" دا هاتووە، نوێبوونی ئەم سرووتانە و هەبوونی تایبەتمەندیی نەریتی نووسراو و بەهێز لەم دەقانەدا دەگەیەنێ.

## دێڕ و لادێڕ:

دێڕ (بەیت) بریتییە لە دوو لادێڕی پێکەوە بەندکراو کە یەکەم وەك یەکەیەکی کێشی(عەرووضي) ڕەفتار دەکات و دووەم، یەکێتییان لەگەڵ سەروا یان ڕستەسازی یان هەردووکیان نیشاندار کرابێت (پرۆمینگێر و بروگان ١٩٩٣، دەروازەی couplete). سرووتە ئێزدی و ئەهلی هەقییەکان هەردووکیان دێڕیان نییە، و ئەمە تایبەتمەندیی هەموو سرووتە ئێرانییە ناوەندی و نوێیەکانی ڕۆژئاواییە(٩).

زۆربەی بەندەکان لە سرووتە ئێزەدییەکاندا کە لە سێ لادێڕی هاوسەروا پێکهاتوون و ژمارەی بڕگەکان لە هەر بەندێکدا وەك پێویست یەکسان نییە. لە بابەت کەلامی یارسانەکانیشەوە ژمارەی لادێڕەکان لە زۆربەی بەندەکاندا تاکە. ئەمە بەم واتایەیە کە لەم سرووتانەدا دێڕ نییە. بەڵام لادێڕەکانی قەولی ئێزەدییەکان بەپێی بوونی لادێڕە هاوسەرواکان لەنێو هەر بەندێکدا، شێوەیەکی ڕێکوپێك[11] یان وەرگرتووە، بەڵام درێژایی لادێڕەکان لە یەك پارچە هۆنراوەدا و لە یەك بەنددا زۆرجار یەکسان نین. هەڵبەت جۆراوجۆریی لادێڕەکان لەهەر بەندێکدا زۆر لە ڕادەی ئەم فرەیی و جۆراوجۆرییە لەگشت لادێڕەکانی یەك قەول کەمترە، لەگەڵ ئەوەشدا، تەنانەت لادێڕەکانی بەندێکیش بەردەوام هاوئەندازە نین، بۆ نموونە بەپێی بڕگەکانی هەر لادێڕێك لە سەت لادێڕ لە بەندەکانی قەولی یەکەم لە کتێبەکەی کرێین برۆك (١٩٩٥: ١٧٠–١٤)دا، گەیشتینە ئەو ئەنجامەی کە بڵێین ١٩ لە سەتای لادێڕەکان ٧ بڕگەیی، ١٥ لە سەت ١٢ بڕگەیی، ١٣ لەسەد ٨ بڕگەیی، ١٢ لە سەت ٩ بڕگەیی، ٨ لە سەت ١٠ بڕگەیی، ٧ لە سەت ١١ بڕگەیی، ٦ لە سەت ٦ بڕگەیی، ٤ لە سەت ١٣ بڕگەیی، ٤ لە سەت ١٤ بڕگەیی، ٤ لە سەت ١٥ بڕگەیی، ٣ لە سەت ١٦ بڕگەیی، ٣ لە سەت ١٧ بڕگەیی و ٢ لە سەتەکەی دیکەی ٥ و ١٨ بڕگەیین. بۆ سادەکردنەوەی ژماردنەکە، ئەو ژمارانەی سەرەوەی لەم خشتەیەی خوارەوە دەخەینە ڕوو:

| | | | | | | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ژمارەی برگەکان | ٧ | ١٢ | ٨ | ٩ | ١٠ | ١١ | ٦ | ١٣ | ١٤ | ١٥ | ١٦ | ١٧ | ٥ | ١٨ |
| رێژەی بەکارهێنان | ١٩ | ١٥ | ١٣ | ١٢ | ٨ | ٧ | ٦ | ٤ | ٤ | ٤ | ٣ | ٣ | ١ | ١٠ |

لەو خشتەیەی سەرەوە بە باشی دەردەکەوێ کە لادێڕەکان لە قەولی ئێزدییەکاندا بەهیچ شێوەیەك تەنراو و یەکدەست نین و جۆراوجۆریی لادێڕەکان لە رووی ژمارەی برگەکان گەلێك زۆرە.

ژمارەی برگەکان لە کەلامی یارسانەکان لە قەولی ئێزدییەکان زۆر یەکدەستترە. لادێڕەکان لە زۆربەی کەلامەکانی هەر بەشێکدا، لە سەرەتاوە تا کۆتایی برگەی یەکسانیان هەیە. بۆ نموونە تاڕادەیەکی زۆر هەموو بەندەکان لە بەشەکانی بارگە بارگەدا، دەورەی هەفتەوانە، دەورەی گلیم وەکۆڵ، دەورەی چل تەن، و وردە سەرەنجام، لەلادێڕی دە برگەیی پێکهاتوون. جۆراوجۆریی لادێڕەکان لە "دەورەی ئابدین"دا زیاترە لە بەشەکانی پێشوو، بەڵام لەم بەندەشدا ژمارەی برگەکانی لادێڕەکان لە هەر بەندێکدا چەسپاو نییە، ئەم بەشە، لەبەندی هەشت برگەیی، بەندەکانی (١) تا (١١)، (٢٦) تا (٢٨) و بەندی (٣٠) بەندی (١٢)(١٠) و (٢٥) و لادێڕە برگەیییەکان (بەندەکان (١٣) تا (٢٤)، (٢٩)، (٣١) و (٣٢) پێکهاتووە، کەواتە ژمارەی برگەکان لە لادێڕەکانی کەلامی یارسانەکاندا ورد و یەکدەستە، بە جۆرێك کە سەت دێڕی سەرەتای بەشی "بارگە بارگە" هەموو لە دە برگە پێکهاتوون.

لە درێژەدا ژمارەی برگەکان لە لادێڕەکانی سرووتە ئێرانییەکانی دیکەدا تاوتوێ دەکەین:

١. کۆنترین سرووتە ئێرانییەکان، ئەو "یەسنا"یانەن کە بەشی گاتاکانی "ئاڤێستا" پێکدێنن. ئەم سرووتانە کە بە زمانی ئاڤێستایین و دروانەتە پاڵ زەردەشت، خاوەن دێڕ (بیت)ن و لە نێوان سرووتە ئێرانییەکاندا شێوەیەکی زۆر تاقانەیان هەیە. بۆ نموونە دێڕەکانی یەسناکانی ٢٨ تا ٣٤ (گات ئەهونود) هەمووی لە برگەی حەوت و نۆ برگەیی پێکهاتوون، یان لە یەسنەکانی ٤٣ تا ٤٦ (گات ئەشتود)دا دێڕەکان لە دوو لادێڕی چوار و حەوت برگەیی پێکهاتوون،

بارێكی ئاوا لە هیچ كام لە شیعرە ڕۆژئاوایی و نوێیە ئێرانییەكانـدا نـەبینراوە و لـە بنەڕەتدا هۆنراوەكانی قۆناغەكانی داویە تا سەرهەڵدانی شیعری عەرووزی فارسی، هەموویان بەبێ دێڕ (بیت) بوون[11].

بەهۆی جیاوازبوونی پێكهاتەی شیعری سرووتە گاتاییەكان، ئەم سـرووتانە لەم بەشەدا تـاوتوێ ناكـەین، بـەڵام سـرووتە ڕۆژئاواییـەكانی ناوەڕاسـت و نـوێ، پێوەنـدیی مێـژوویی و لێكچـوونێكی زۆریـان لەگـەڵ قـەولی ئیزدیـی و كـەلامی یارسانییەكاندا هەیە، بە شێوەیەك كە ئەگەر ئەندازەی لادێڕەكانی ئـەم سـرووتانە لـە ڕووی مێژووییـەوە پێكـەوە بـەراورد بكـەین، ڕەوتێكـی مێـژوویی لـە ڕەوتـی گۆڕانەكانیان دەدۆزینەوە.

٢. "درەخـتی ئاسـۆریك" نـاوی هۆنراوەیـەكی پەهلەوییـە كـە ئەسـڵەكەی پارتییە و لەوانەیە لە دەورەی ساسانییەكاندا بە زمان و خەتی پەهلەوی ساسـانی نووسرابێت (تفضلي ١٩٧٤)[12]. ئەم بەرهەمە هۆنراوەیەكی پێداهەڵدانـە لـە نێـوان "بزن" و "داری خورما" كە تێیدا هەر كامەیان لە قازانج و لایەنە باشەكانی خۆیان دەدوێن و لە كۆتاییدا بـزن سـەردەكەوێ (تفضـلي ، ١٣٧٦: ٢٥٧). بێنڤێنیسـت[12] یەكەم كەس بـوو كـە هۆنراوەبـوونی ئـەم بەرهەمـەی درك پێكـرد و كێشـەكەی بـە بڕگەیی ناوبرد (بێنڤێنیست، ١٩٣٠: ٢٢٥–١٩٣). لە پاش ئەو هەنینگ لە وتـارێكی گرنگدا بۆچوونەكەی بێنڤێنسیتی ڕەت كردەوە و كێشەكەی بە كێشی دەنگی دانـا (هەنینگ، ١٩٥٠: ٤٨–٤١). بە ژماردنی بڕگەكانی سەت لادێڕی یەكەمی درەخـتی ئاسۆریك گەیشتینە ئەم ئەنجامەی كە ٣٤ لە سەتی لادێڕەكانی ١٢ بڕگەیی؛ ٢٨ لە سەتی ١١ بڕگەیی؛ ٢١ لـە سـەتی ١٠ بڕگـەیی؛ ١٠ لـە سـەتی ١٣ بڕگـەیی؛ و ٧ لـە سەتەكەی دیكەی بە شێوەیەكی تاڕادەیەكی زۆر یەكسان ٢، ١٤ و ١٥ بڕگەیین[13]. خشتەكەی خوارەوە ژمارەی بڕگەكانی هـەر لادێڕێـك و ڕێـژەی بەكارهێنانـەكانیان دەخاتە ڕوو:

| ژمارەی بڕگەكان | ١٢ | ١١ | ١٠ | ١٣ | ٢ | ٤ | ١٥ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ڕێژەی بەكارهێنان | ٣٤ | ٢٨ | ٢١ | ١٠ | ٣ | ٢ | ٣ |

٣. "دەرکـەوتنی شـا بـارامی وەرجاوەنـد" نـاوی هۆنراوەیـەکی کـورتی زەردەشـتییەکانی پـاش ئیسـلامە لـە (٢) بەنـد و (٢٤) دێـر یـان لادێـردا. لـەم پارچەیەدا، شاعیر خۆزگە دەخوازێ کە شا بارام هەرچی زووتر بێت و ئێرانییـەکان لە شەڕی عەرەبەکان ڕزگار بکات. یەکەم جار تاڤەدیا[13] هۆنراوەبوونی ئەم پارچە شیعرەی درك پێکرد (تاڤـەدیا، ١٩٥٥: ٣٦–٢٩). ئـەم دەقـە لـە کۆمەڵـەی دەقـە پەهلەوییەکانـدا (جاماسـپ– ئاسـانا[14]، ١٨٩٧: ١٦١–١٦٠)دا هـاتووە و مـەلیکو شـوعەرای بـەهار وەریگێڕاوەتـە (سـەر زمـانی فارسـی) و زۆربـەی وشـەکان و دەستەواژەکانی شەرح کردووە و لێکداوەتەوە (بەهار، ١٣٤٧: ٩٠–٨١).

ئەم دەقـە یـەك دوو لادێـڕی زۆر درێـژی هەیـە کـە لەوانەیـە لەگـەڵ فۆڕمـە سەرەکییەکان زۆر جیاواز بن (هەمان سەرچاوە: ٨٤). لێرەدا تەنیا بیسـت لادێـڕی ساغی ئەم شیعرانە بژار و ژمارەی بڕگەی لادێڕەکانیان دەژمێرین(١٤). لـەم دەقـەدا ٢١ لە سەتی لادێڕەکان ١١، ١٣، و ١٤ بڕگەیین، ١٦ لە سـەتی ١٥ بڕگـەیی؛ ١١ لـە سەتی ٥ بڕگەیی؛ و ٥لە سەتی ٩ و ١٢ بڕگەیین:

| ژمارەی بڕگەکان | ١١ | ١٣ | ١٤ | ١٥ | ٥ | ٩ | ١٢ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ڕێژەی بەکارهێنانەکان | ٢١ | ٢١ | ٢١ | ١٦ | ١١ | ٥ | ٥ |

٤. یـەکێك لـە پەندنامـە پەهلەوییـەکان بـە نـاوی "ئەنـدەرزی زاناکـان بـۆ مەزدیەسـنا"(٢٤) لادێـڕی هـۆنراو و هاوسـەروای هەیـە (تفضـلي، ١٣٧٦: ١٨٦ و ئـەبولقاسمی، ١٣٧٤: ٧٣). ئـەم دەقـە لـە کۆمەڵـەی دەقـە پەهلەوییـەکان (جاماسپ– ئاسانا ١٨٩٧: ٥٤) دا هاتووە و چـەندین جـار کـراوە بـە فارسـی (بـۆ نموونە بڕوانە: عریان ١٣٧١: ٩٤). بە ژمـاردنی ژمـارەی بڕگـەکانی هـەر لادێڕێکـی ئەم ئەندەرزنامەیە، گەیشـتینە ئـەو ئەنجامـەی کـە ٤٨ لـە سـەتای لادێڕەکـانی ٧ بڕگەیی؛ لە ٢٠ لە سەتای ٨ بڕگـەیی؛ ١٢ لـە سـەتای ٥ بڕگـەیی؛ ٨ لـە سـەتای ٦ بڕگەیی؛ ٨ لە سەتای ٩ بڕگەیی؛ و ٤ لە سەتای ١٠ بڕگەیین(١٥).

| ژمارەی بڕگەکان | ٧ | ٨ | ٥ | ٦ | ٩ | ١٠ |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ڕێژەی بەکارهێنانەکان | ٤٨ | ٢٠ | ١٢ | ٨ | ٨ | ٤ |

٥. یەکێك لە شیعرە دەگمەنە ماوەکانی قۆناغە سەرەتاییەکانی فارسیی نوێ، وەرگێڕدراوێکی دوو بەشی قورئانی پیرۆزە کە لەوانەیە سەر بە کۆتاییەکانی سەدەی سێیەم یان سەرەتاکانی سەدەی چوارەمی کۆچی مانگی بێت (رجائی بخارانی، ١٣٥٣: نۆ، سی و شەش تا پەنجا). وەرگێڕانی ئایەتەکان لە دەقی دەستنووسی ئەم بەرهەمەدا، لەوانەیە، بە لاساییکردنەوە لە دەقە زەردەشتییەکان، بەبێ هیچ مەودا یان نیشانەیەکی دیار لە دوای یەك هاتبێت، بەڵام ساغکردنەوەی کتێبەکە خۆی ئەوانەی وەك لادێڕی سەربەخۆ لە یەکتر جیاکردووەتەوە. بە تاوتوێکردنی ١٠٠ لادێڕ لە سورەی یوسف (هەمان سەرچاوە: ٧٢– ٦٧)، گەیشتینە ئەم ئەنجامە کە ٤٠ لە سەتای لادێرەکانی ٩ بڕگەیی؛ ٣٦ لە سەتای ١٠ بڕگەیی؛ ١٨ لە سەتای ١١ بڕگەیی؛ ٣ لە سەتای ٨ بڕگەیی؛ و ٣ لە سەتاشیان ١٢ بڕگەیین:

| ژمارەی بڕگەکان | ٩ | ١٠ | ١١ | ٨ | ١٢ |
|---|---|---|---|---|---|
| ڕێژەی بەکارهێنانیان | ٤٠ | ٣٦ | ١٨ | ٣ | ٣ |

٦. جگە لە سرووتەکانی سەرەوە، هەندێ شیعری دیکەش سەر بەدەورەی ناوەڕاستی زمانە ئێرانییە ڕۆژئاواییەکان دەکرێ بدۆزیتەوە، بەڵام یان لە هۆنراوەبوونیان دڵنیانین (وەك جاماسپ نامە[١٦] و یادگاری زریران[١٧]) و یان بە ڕادەیەك کورتن کە ناکرێ لە ژماردنی بڕگەکانیان بگەینە ئەنجامێکی دڵنیاکەر، وەك "سرووتی خەڵکی بوخارا"، "ئاوە و نەبیزە" و "سرووتی وێرانییەکانی سەمەرقەند"[١٨].

٧. سرووتە ئێرانییە ڕۆژئاواییە نوێیەکان، لە ڕووی ژمارەی بڕگەکان، یەکدەستیی زیاتری سرووتەکانی دەورەی ناوەڕاست دەخەنە ڕوو. بۆ نموونە بە تاوتوێکردنی ١٠٠ لادێڕ لە یەك پارچە شیعری عامیانەی بەلوچی[١٩] گەیشتینە ئەم ئەنجامەی کە ٨٤ لە سەتی لادێڕەکان ٨ بڕگەیین؛ ١٤ لە سەتی ٩ بڕگەیی؛ ٤ لە سەتی ٧ بڕگەیین[٢٠]:

| ژمارەی بڕگەکان | ٨ | ٩ | ٧ |
|---|---|---|---|
| ڕێژەی بەکارهێنانەکان | ٨٤ | ١٤ | ٤ |

وەك دەبینن، زیاتر لە ٩٥ لە سەتای لادێڕەکان لەم سرووتەدا هەشت یان نۆ بڕگەیین، چڕبوونەوەیەکی ئەوتۆ لە سرووتەکان لە ناوەڕاستدا نییە.

٨. هۆنراوە عامیانە فارسییەکان زۆرجار کورتن، بەڵام بەگشتی ٧٠ لە سەتی ئەوانە لادێڕی حەوت یان هەشت بڕگەیین (طبیب زادە، ١٣٨٢). بەتاوتوێکردنی پارچە شیعرێکیش تاڕادەیەك درێژیی عامیانەی فارسی بۆمان دەردەکەوێت کە ٤٩ لە سەتای لادێڕەکانی ٧ بڕگەیین؛ پتر لە ٤٩ لە سەتی دیکە ٧ بڕگەیین، و کەمتر لە یەك لە سەتیان ٩ بڕگەیین:

| ژمارەی بڕگەکان | ٧ | ٨ | ٩ |
|---|---|---|---|
| ڕێژەی بەکارهێنانەکان | ٤٩/٥ | ٤٩/٥ | ١ |

٩. وەك نموونەیەك لە جۆرەکانی شیعری نووسراوی ئێرانی، سەت دێڕ لە شانامەی فیردەوسی تاوتوێ دەکەین (فرۆرانفەڕ، ٥٦: ١٣٦٩_٥٢). تەواوی لادێڕەکانی شانامە لە ١١یەکەی بڕگەیی پێکهاتووە، کەواتە دەکرێ بڵێین هەموو لادێڕەکانی شانامە یازدە بڕگەیین:

| |
|---|
| ژمارەی بڕگەکان ١١ |
| ڕێژەی بەکارهاتنەکان ١٠٠ |

تەواوی لادێڕەکانی پارچەیەك لە شانامەدا، ژمارەی بڕگەکانیان یەکسانە و گشت دیاردە ریزپەڕ و شازەکانیش لەگەڵ یاساکانی کێش گونجاو و شیاوی پاساودانن.(٢١)

١٠. ئەگەر چاوپۆشی لە نموونەکان کەمتر لە (٥) لە سەتی خشتەکانی سەرەوە بکەین و جۆراوجۆریی لادێڕەکان لە ڕووی ئەندازەکانیان لەهەر شیعرێکدا تاوتوێ بکەین، لادێڕەکان لە سرووتەکانی پەهلەویدا لە چوار هەتا حەوت ئەندازەی جیاوازن: لە"درەختی ئاسۆریك"دا لە چوار ئەندازەی ١٣،١٠،١١،١٢ بڕگەییدا؛ لە"دەرکەوتنی شابارام وەرجاوند"١١،١٣،١٤،١٥،٥،٩،١٢ بڕگەیی؛ و لە "ئەندەرزی زانایان بە مەزریدسنان"، لە پێنج ئەندازەی ٧،٨،٥،٦،٩ بڕگەیی. ئەم

جۆراوجۆرییە لە وەرگێڕانی قورئاندا کە سەر بە کۆتاییی‌یەکانی فارسی ناوەڕاست یان سەرەتاکانی فارسی نوێیە، بۆ ڕادەی ٩،١٠و ١١ بڕگەیی کەم دەبنەوە. لە دەقە فارسییە نوێیەکاندا جۆراوجۆریی ئەندازەی بڕگەکان لە هەر شیعرێکیدا دەکاتە دوو: لە شیعری عامیانەی بەلوچیدا لادێڕەکان لەدوو ئەندازەی ٨ و ٩ بڕگەیی، و لە شیعری عامیانەی فارسیدا لە دوو ئەندازەی ٧ و٨ بڕگەییدا دەردەکەون. ئەمە بەم واتایەیە کە گۆڕانی سرووتە زارەکییەکانی ئێران لە ئێرانی ناوەڕاستەوە تا ئێستا، دوولایەنی سەرەکی دەخاتە روو: یەکەم، کەمبوونەوەی جۆراو جۆریی لادێڕەکان لە رووی ئەندازەکانیان لە هەر شیعرێکدا، و دووەم گۆڕانی لادێڕە ١٠ تا ١٥ بڕگەییەکان لە فارسیی ناوەڕاستدا بە لادێڕە ٧ تا ١٠ بڕگەییەکان لە فارسیی نوێدا.

ئێستا بابزانین قەولی ئێزیدییەکان و کەلامی یارسانەکان لەکوێی ئەم گرووپانەدان. لادێڕەکان لە سرووتە ئێزەدییەکاندا – بەچاوپۆشی لە حاڵەتەکانی کەمتر لە ٥ لە سەت – لە حەوت ئەندازەی ٦،١١،١٠،٩،٨،١٢،٧ بڕگەییدا دەردەکەون، کەچی لادێڕەکانی کەلامی یارسانەکان تەنیا لە یەك ئەندازەی ١٠ بڕگەییدا دەردەکەون. ئەمە بەو واتایەیە کە سرووتە ئێزدییەکان دەچنەوە سەر قۆناغێکی کۆنتری سرووتەکانی قۆناغی ناوەڕاستی ئێرانی، و سرووتەکانی ئەهلی هەق لە نوێترین جۆرەکانی سرووتە ئێرانییە نوێیەکانیش زیاتر گۆڕاون. خشتەی خوارەوە پلەکانی ئەم گۆڕانە بەڕوونی دەخاتە ڕوو:

خستنەڕووی گۆڕانی ئەندازەی لادێڕەکان لە سرووتە ئێرانییە ڕۆژئاواییی‌یە ناوەندی و نوێیەکاندا

ژمارەی بڕگەکان

| ژمارەی بڕگەکان / ناوی سرووتەکان | ٥ | ٦ | ٧ | ٨ | ٩ | ١٠ | ١١ | ١٢ | ١٣ | ١٤ | ١٥ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| قەولی ئێزیدییەکان | | ٪٦ | ٪١٩ | ٪١٣ | ٪١٢ | ٪٨ | ٪٧ | ٪١٥ | | | |
| درەختی ئاسۆریك | | | | | | ٪٢١ | ٪٢٨ | ٪٣٤ | | | |

| | | | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| شابارام وەرجاوند | ١١٪ | | | | ٥٪ | ٢١٪ | ٥٪ | ٢١٪ | ٢١٪ | ١٦٪ | |
| ئەندەرزی دانایان | ١٢٪ | ٨٪ | ٤٨٪ | ٢٠٪ | ٨٪ | | | | | | |
| وەرگێڕانی قورئان | | | | | ٤٠٪ | ٣٦٪ | ١٨٪ | | | | |
| شیعری عامیانەی بەلوجی | | | | ٨٤٪ | ١٤٪ | | | | | | |
| شیعری عامیانەی | | | ٥.٤٩٪ | ٥.٤٩٪ | | | | | | | |
| فارسی | | | | | | | | | | | |
| کەلامی یاری | | | | | | ١٠٠٪ | | | | | |
| شانامە | | | | | | | ١٠٠٪ | | | | |

وەك دەبینین، کەلامی یارسان لە رووی جۆراوجۆریی لادێڕەکانییەوە، راست وەك شیعری فەرمی فارسییە، واتە تەواوی دێڕەکان (ابیات)ی هەر پارچەیەکی شیعری، لە لادێڕی هاو ئەندازە پێکهاتووە:

ئەم تایبەتمەندییە کە تایبەت بە سرووتە نووسراوە ئێرانییەکانە، دەکرێ لەبەر نووسرانەوەی کەلامەکان و دوورکەوتنەوەی پلەبەپلەیان لە تایبەتمەندییەکانی سرووتە زارەکییەکان بێت، هەبوونی سەروا و بەندەکان لە سرووتە ئێزدییەکاندا ئاماژە بە شیعربوونی ئەم سرووتانە دەکات، بەڵام لەلایەکی دیکەشەوە، ئاڵۆزی لە ئەندازەی لادێڕەکانیدا کە بەپلەی یەکەم، دەربڕی ئاڵۆزیی لە رۆنانی کێشە، لەگەڵ بنەمای پێکهاتەمەندی ناتەبایە. ئاڵۆزی لە ئەندازەی لادێڕەکاندا و کێشی ئەم سرووتانە، لەوانەیە لەو رووەوە بێت کە هاوکات لەگەڵ مۆسیقا و بە شێوەی گۆرانی دەیلێن، واتە بەشێوەیەك کە بێژەرەکە بتوانێ بە درێژ و کورتکردنەوەی درێژایی بزوێنەکان یان برگەکان، ئیرادی کێشی شیعرەکە لەناوبەرن. لەوانەیە بکرێ قەولی ئێزیدییەکان بە جۆرێکی پاشماوەی نەریتی خوسرەوانی و گۆرانیبێژی پێش ئیسلام لە ئێران دابنرێ (بۆیس ١٩٦٨).

كـەلامی یارسـانەكانیش وەك قـەولی ئێزیدییـەكان، لـە بنەڕەتـدا بـۆ ئـەوە دروسـتكراون كـە بـە گـۆرانی و لەگـەڵ مۆسـیقادا بگـوترێن، بـەڵام ئـەم سـرووتانە خاوەن لادێڕی بەتەواوی هاوئەنـدازە و لـە ئەنجامـدا هەربۆیـە كێشـێكی دیـارتر و وردتریـان هەیـە. كەلامـەكان لـەم رووەوە دەكـرێ لەگـەڵ هـۆنراوەی تازییـە (شینگێڕی) بەراورد بكرێن كـە هەرچـەند بـۆ گـوتن بـە شـێوەی گـۆرانی و لەگـەڵ میلۆدی هۆنراونەتەوە، تـەواو هـاوكێش و هاوسـەروان، بەشـێوەیەك كـە زۆربـەیان دەكـرێ بەئاسـانی دیكلمـە و بـەبێ میلـۆدی بخوێندرێنـەوە. هـۆنراوەی ئـەوتۆ لەبنەڕەتدا بەرهەمی ئەو كلتوورانەیە كە خاوەنی نووسین و نەریتـەكانی نووسـینی كۆن و بەهێزن و لێرەدا دەكرێ بەمەودایەكی گەورەی نێـوان قەولـەكان و كـەلامی یارسانەكان بزانین.

**ئەنجام:**

سرووتە نووسراوەکان، واتە شیعرە عەرووزییە فارسییەکان یان ئەو شیعرانەی دیکە کە بەزمانی ئێرانییەکان بەچاولێکەری لە شیعری عەرەب-یان دواتر بە چاولێکەری لە شیعری فارسی- بەشێوەیەکی عەرووزی گوتراون، هەموویان لە یەکەمین سەدەکانی سەرهەڵدانیاندا، لە ڕووی تایبەتمەندییەکان وەك بەستنەوەی ناوەوەی دەق، کێش، سەروا و دێڕ، بەشێوەی دوایی، واتە فۆرمی ئێستایان لێهاتووە؛ بەڵام سرووتە زارەکییە ئێرانییەکان، لەدرێژایی چەندین سەدەدا گۆڕانی جۆراوجۆریان بەسەرهاتووە و ئەو جیاوازییانەی کە ئێستا لە فۆرمی ئەم هۆنراوانەدا دەبینرێ، لەبەر ڕەوتی ئەم گۆڕانانە بووە. بۆ نموونە گۆڕانی لادێڕەکانی سرووتە زارەکییە ئێرانییەکان، لە ئێرانی ناوەڕاستەوە تائێستا، دوو ڕەوتی سەرەکی دەخاتە ڕوو: یەکیان کەمبوونەوەی جۆراوجۆراویی لادێڕەکان لەڕووی ئەندازەکەیان لەهەر شیعرێکدا، و دووەم گۆڕینی لادێری ١٠ تا ١٥ بڕگەیی لە فارسیی ناوەڕاستدا بۆ لادێڕی ٧ تا ١٠ بڕگەیی لە فارسیی نوێدا. تاوتوێکردنی هۆکارەکانی بەستنەوەی ناوەوەی دەق و لادێڕ و دێڕەکان لە قەول و کەلامەکاندا بەباشی دەریدەخەن کە قەولی ئێزدییەکان سەر بە یەکێك لە کۆنترین جۆرەکانی سرووتە زارەکییەکانی ڕۆژئاوای ئێرانە، بەڵام کەلامی یارسانەکان، زۆرێك لە تایبەتمەندییە زارەکییەکانی خۆیان لەدەست داوە، و لە سرووتە نووسراوەکان، بەتایبەتی شیعری فەرمیی فارسی نزیك بوونەتەوە. دوورەپەرێزی و دابڕانی ئێزیدییەکان لە کلتوور و ئیتنیکە دراوسێکانیان و هەروەها پابەندبوونیان بە نەریتی زارەکی و لەئەنجامدا نەنووسرانەوەی وتەکانیان لەو هۆکارانەن کە بوونە مایەی بەچەسپاوی مانەوەی تایبەتمەندییە کۆنە زارەکییەکان تێیاندا، بەڵام مەیلی یارسانەکان بۆ هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ ئیتنیك و کەلتوورە دراوسێکانیان، بەتایبەتی لەگەڵ شیعەکان و ئەدەبی فارسی، و هەروەها ئازادیی پتری ئەوان لە دەربڕینی بیر و باوەڕەکانیان، لەو هۆکارانەن کە بوونەتە هۆی لەناوچوونی زۆربەی تایبەتمەندییە زارەکییەکان لەم هۆنراوانەدا، و نزیکبوونەوەیان لە سرووتە نووسراوەکان. تەنیا هۆکارێك کە کەلامی یارسانەکان لە زومرەی شیعری زارەکی ئێرانییەکاندا دەیهێڵێتەوە، کێشی دەنگی- بڕگە یان بەناو"پەنجەیی"یانە؛ ئەم کێشە تایبەتمەندییەکی گشت سرووتە زارەکییە ئێرانییەکانە.

## پاشکۆ:

(١) بەپێویسـتی دەزانم سپاسـی "پرۆفیسـۆر کـرایێن بـرۆك"، سـەرۆکی سیمیناری ئێراناسی زانکۆی گوتینگن، بکەم کە بە ڕووخۆشی وەڵامی زۆربەی پرسیارەکانمی دایەوە. سپاسی (دکتۆر ڕەشۆ)ش دەکەم کە لەسەر داوای من وتـارێکی تێروتەسـەلی لـەبارەی بـاوەڕ و بۆنـە کلتـووری و کۆمەڵایەتییـەکانی ئێزیدییەکان ئامادە کرد؛ وتارەکەیان دواتر لە گۆڤارێکی ئاڵمانی زمان تایبـەت بـە "لێکۆڵینـەوە ئێـران ناسـییەکان" (٢٠٠٤) بەسەرنووسـەریی خـۆم بڵاوکرایـەوە. هـەروەها، سپاسـی هـاوڕێی زانـام جـەنابی دکتـۆر (ئـامر ئەحمـەد) دەکـەم کـە دەستنووسی وتارەکـەی بـەوردی خوێنـدەوە و تێبینیـی زۆری ئامـاژە کـرد. ئـەم وتـارە پێشـکەش دەکـەم بەمامۆسـتای بـەڕێزم، جـەنابی (دکتـۆر فـەتحوڵڵا موجتەبایی).

(٢) بۆنموونە، بڕوانە هەنینگ ١٩٩٥. هـەنینگ لـەم وتـارە کـە زمـانی کـۆنی ئازربایجانی تـاوتوێ کـردووە، بەئاشـکرا ئامـاژەی بـە "ئـەدەبیاتی دەوڵەمەنـدی" ئەهلی هەق یان یارسان بەزمانی کوردی کردووە.

(٣) بۆ زانیاریی زیاتر لەبارەی ئەم شیعرانە بڕوانە سوری ١٣٤٤و موکری ١٩٦٦.

(٤) بۆ کوردی و جۆرەکانی دابەشکردنی دیکەش کراوە، بۆ نموونە هاوێڕست ١٩٩٨:٦٤.

(٥) ئەم تایبەتمەند و ڕێژانە لە کۆمەڵەی نوێی قەول ئێزیدییەکانیشدا دەکرێ ببینرێ (بڕوانە کرێین بروك و جندی ڕەشۆ، ٢٠٠٥).

(٦) قەول بێژ (قوال)ە ئێزیدییەکان ئەم گوتانەیان لە ماڵی ئەو کەسەی تازە کۆچی دوایی کردووە، لەسەر مردووەکە دەخـوێنن (قـەولی ١٨ لـە کتـێبی کرایـان بروك، ١٩٥٥: ٣٠٦-٩)، لێرەدا ڕاست نووسراوەکەی کرێین برۆکمان هێناوەتەوە.

(٧) بۆ زانیاریی زیـاتر لـەم دەقانـە، بڕوانـە، جۆرزێـف ١٩٠٩؛بیتنێـر، ١٩١٣ و فـورلانی ١٩٤٠؛ هـەروەها بـۆ وەرگێڕانـی فارسـییەکانی ئـەم دوو دەقـە بڕوانـە (التونجی،١٣٨٠: ٢٥٧ -٢٣٣).

(٨) دەقی نووسینەوە و وەرگێڕانەکەی سەڤ زادە وەك خۆی هێنراوە.

(٩) سەرهەڵدانی دێڕ لەشیعری فەرمیی فارسیدا لەبەر کاریگەریی شیعری عەرەب بووە و لەوانەیە هیچ پێوەندییەکی بە ڕەوتی سروشتی گۆڕانی ڕۆنانە شیعرییەکانی زمانە ئێرانییەکانەوە نەبێت. تەنانەت لەشیعری فارسیدا دێڕ هیچ کات نابێتە یەکەیەکی پێوەری کێش و بەردەوام لادێڕ (مصراع) ئەم ئەرکەی بینیوە. دێڕ لە ڕێگای ئەدەبی فارسییەوە چووەتە ناو زمانە ئێرانییەکانی دیکەی وەك کوردیشەوە و(بڕوانە، جزری، ١٩٥٨)و پەشتون (بڕوانە دارمێستێتر١٨٩٠)، بەڵام گرنگترین و بەرجەستەترین بەکارهێنانی لە زمانە ئێرانییەکاندا لە فارسیدا چڕبووەتەوە.

(١٠) بەندی ١٢بیست و دوو لادێڕە کە بیست لادێڕی شەش بڕگەیی و دوو لادێڕی کۆتایی هەشت بڕگەیین.

(١١) باری دێڕە نایەکسانەکان، بیرخەرەوەی ئەدەبی شینگێڕییە[15] لەشیعری یۆنانیی کۆندا دەبینرێ. ئەم دێڕانە لادێڕی شەش و پێنج بڕگەییان هەیە. سەیر ئەوەیە کە دێڕەکانی شینگێڕی لە سەدەکانی شەش و حەوتی پێش زایین لە یۆنان سەریان هەڵداوە، واتە هاوکات یان کەمێك پاش لە سەرهەڵدانی زەردەشت و ئاڤێستا لە ئێرانە و(بڕوانە پرومنیگەر و بردگان، ٩٩٣): دەروازەی ( elegiac distich).

(١٢) ئەم بەرهەمە چەندین جار بەفارسی کراوە (بۆنموونە بڕوانە ماهیار نوابی، ١٣٤٦و عریان،٣٧١).

(١٣) لەم ژمارانەدا لە دەقی دەنگنووسی (عریان،١٣٧١:١٥١–١٤٥) سوودمان وەرگرتووە.

(١٤) لەم ژمارانەدا لە دەقی دەنگنووسی فارسی بەهار (٨٢:١٣٤٧) و دەنگنووسیی لاتینی عوریان (١٣٧١) سوود وەرگیراوە.

(١٥) لەم هەڵسەنگاندنەدا دەقی دەنگنووسی عوریان (١٣٧١: ١٥١–١٤٦) بەکارهاتووە.

(١٦) لەبارەی جیاوازیی بۆچوون لەبارەی بەهۆنراوەبوون یان نەبوونی جاماسپ نامە، بڕوانە (تفضلي، ١٧٤:١٣٧٦٢).

(١٧) بێنێڤنیست بەکەمکردن و زیادکردنی چەند وشەیەك بەیادگاری زریـران، هەوڵیدا هەمووی لە چوارچێوەی لادێڕی شەش بڕگەییدا کۆبکاتەوە (١٩٣٢: ٢٩٣-٢٤٥). هەنینگ پێیوایە کە لە یەکەم، تـەنیا بەشـێك لـەم دەقـە هۆنراوەیـە و نـەك تەواوی، و پاشان کێشی پەنجەیە، نەك بڕگـەیی (هـەنینگ،١٩٥٠). ماهیـار نـەوابی پێیوایە کە یادگاریی زریران کۆنترین نامـەی ئێرانییـە کەلـە بنەڕەتـەوە بۆنوانـدنی سەرسەکۆ نووسراوە و تەنیا قەولی ئەکتەرەکانی بەهۆنراوەیە. ئەو بەشەکانی ئەم هۆنراوەیەی لە ڕاپۆرتەکـەی خۆیـدا نووسـیوەتەوە (ماهیـار نـوابی، ١٣٧٤: ١٣٩-١٠٥). بەژماردنی ژمارەی بڕگە١٠٠ دێڕییەکان لە دەنگنووسییەکەی ماهیـار نـەوابی دەگەینە ئەم خشتەیەی خوارەوە:

| | | | |
|---|---|---|---|
| ژمارەی بڕگەکان | ٨ | ٧ | ٦ |
| ژمارەی بەکارهێنانەکان | ٧٥ | ١٩ | ٦ |

بـەپێی ئـەو خشـتەیەی سـەرەوە، لادێڕەکـانی یادگـاریی زریـران بەڕێـژەی سرووتە ڕۆژئاواییە ئێرانییەکان یەکدەستی و تۆکمەییەکی زیاتریان پێوە دیـارە. بـە ئەگـەری زۆر ئـەم تۆکمـەیی و بەسـتنەوەیە بەرهـەمی ئـەو چاکسـازی و دەستکارییانەیە کە لەسەر دەقەکە کراوە تـا هەرچـی زیـاتر بەشـێوەی هـۆنراوەی لێبکەن. لەهەر حاڵدا ئەم دەقەمان نەخستە ژماردنەکانی خۆمانەوە.

(١٨) بـۆ ئاگـاداربوون لـەم سـرووتانە، بڕوانـە صـادقی (١٣٥٧: ٩٩-٥٤ وریمپیس[16]،١٩٥١).

(١٩) لەبارەی سرووتە بەلوچییەکانەوە بڕوانە (دامێس[17]، ١٩٠٧).

(٢٠) لەم ژمارانەدا لـە دەقـی دەنگنووسـی ئـێلفین بـین[18] ( (١٩٨٥: ١٧٨-١٥٩) سوودمان وەرگرتووە.

(٢١) ئاشکرایە کە ئەم بنەمایـە لـە شـیعری (نیمـایی)دا ڕاسـت نییـە؛ بـەڵام تەنانەت شیعرە نماییەکانیش، سـەرەڕای کـورت و درێـژیی لادێرەکانیـان، کێشـی هەر کۆپلە شیعرێکی چەسپاوە و لە درێژایی شیعرەکەدا گۆڕانێك تێیدا بەدی نایە.

## سەرچاوەکان:


- ابوالقاسمی، محسن (١٣٧٤)، شعر در ایران پیش از اسلام، تهران: بنیاد اندیشه اسلامی.
- التونجی، محمد (١٣٨٠)، یزیدیان یا شیطان پرستان، ترجمه احسان مقدس، تهران: مؤسسة انتشارات عطائي.
- بهار، ملك الشعرا (١٣٤٧)، ترجمه چند متن پهلوی، به کوشش محمد گلبن، تهران: مرکز نشر سپهر.
- تفضلي، احمد (١٣٧٤)، تاریخ ادبیات ایران پیش از اسلام، به کوشش ژاله آموزگار، تهران: سخن.
- جزری، (١٩٥٨)، العقد الجوهري في شرح دیوان الشیخ الجزري، به همت احمد بن الملا محمد الزفنگی مفتي القامشلي، مطبعة الرافدین.
- جلیل، ا(و)ج(١٩٧٨)" قول و بیت ازدیه"، در:kurdskij folklor، دوره٢، مسکو.
- جندی، خلیل (١٩٩٢)، نحوه معرفت حقیقت الدیانت الیزیدیه، عراق (بی جا).
- رجائی بخارایی، احمد علی(١٣٥٣)، پلی میان شعر هجایی و عروضی فارسی در قرون اول هجری؛ ترجمه‌ای آهنگین از دو جزء قرآن مجید، تهران: بنیاد فرهنگ ایران.
- سوری، ماشاء الله (١٣٤٤)، سروده‌های دینی یارسان، تهران: امیر کبیر.
- فروزانفر، بدیع الزمان (١٣٤٩)، سخن و سخنوران، تهران: خوارزمی.
- صادقی، علی اشرف (١٣٥٧)، تکوین زبان فارسی، تهران: دانشگاه آزاد ایران.
- صفی زاده، صدیق (١٣٧٥)، نامه سرانجام یا کلام خزانه؛ یکی از متون کهن یارسان (اهل حق)،

تهران: هیرمند.

- طبیب زاده، امید (١٣٨٢)، تحلیل وزن شعر عامیانه فارسی، تهران: نیلوفر.
- عریان، سعد، (گزارش و آوانگاری)، (١٣٧١)، متون پهلوی، گرداوری جاماسب جی دستور منوچهر جی جاماسپ– اسانا، کتابخانه جمهوری اسلامی ایران.

– ماهیار نوابی، یحی (١٣٤٦)، منظومه درخت آسوریك؛ ترجمه چند متن پهلوی، تهران. (١٣٧٤)، یادگار زریران، متن پهلوی، با ترجمه فارسی و آوانویسی لاتین و سنجش آن با شاهنامه، تهران: انتشارات اساطیر.

Benveniste, E (1930), "Le texte du Deraxt Asūtīk", in: JA, 217, p. 193-225.

Benveniste, E (1932), "Le Mèmorial de zarēr", in: IA, 220, p. 245-93.

Bittner, M (1913), Die Heiligen Bücher der Jeziden Oder (Teufelsanbeter) Kurdish und Arabisch), Vienna (=Denkschriften der Kaiserlichen Akademie der Wissenschaften in Wien, Klasse, Band LV.

Boyce, Mary (1968), "Manrchaen Literature", in: Handbuch der Orientalistik، hers, B.Spuler, p. 67-79.

Dames, M.L (1907), Popular poetry of the Baloches: Text and translation ،Royal Asiatic Society.

Darmesteter, J (1890), Chants populaires des Afghans, Paris, lmprimerie Nationale.

Elfenbein, J (1985), Poputar poetry of the Baloches", in: Acta Iranic, 24, Popers in Honour of professor Mary Boyce Difusion, E.J. Brill, Leiden, p. 159-178.

Furlani, G (1940), The Religion of the Yezidis: Religious Texts of the yezidis, trsl. J.M. Unvala, Bombay.

Henning, W.B (1950), "A Pahlavi Poem", in: BSOAS, 1316, p. 41-8.

Henning, W.B (1955), 'The Ancient Languages of Azerbaijan", in: Transactions of the philological Spciety, Herterford, p. 157-177.

Humbach, Helmut (1991), The Gōthōs of Zarathushtra and the other old Avestan texts, in collaboration with Josef Elfenbein and Prods O.

Skjærvø, part 1: introduction-Text and translation, Heidelberg, Carlwinter، Universitätsverlag.

Izadi, M (1992), The Kurds: A Concise Handbook, Taylor & Francis, USA، Bristol.

Harvest, L (1998), Sprachpolitik, Sprachenrecht Und Sprachplanungim geteilten Kurden Land, Passagen Verlag, Manz, Wien.

Jamasp-Asana (1897), Pahlavi Texts, Bombay.

Jelîl, O. and J (1978), "Qewl û Beytê Êzdiya", in: Kurdskij Folklor, Vol. II، pp. 5-30, Moscow.

Joseph, I (1909), "Yezidi texts", in: AJSL 25, pp. 111-56, 218-54.

Kreyenbroek, Philip G (1995), Yezidism- Background, Observances and Textual Tradition, Texts and Studies in Religion, Vol. 62, The Edwin Mellen Press, Lewiston, New York.

Kreyenbroek, Philip G. and Jindy Rashow, Khalil Jindy (2005), God and Sheikh Adi are Perfect; Sacred Poems and Religious Narratives from the Yezidi Tradition, Wiesbaden, Harrassowitz Verlag.

Mokri, M (1996), Le Livre des Rois de Vèritè: Histoire traditionelle des Ahle Haqq, Vol. I, Tehran/ Paris (Bibliothèque lranienne 14.( Silēman, K. h (1985), Gundiyatī, Baghdad.

Preminger, A. and Brogan, T. V. F. (eds), 1993, The New Prince ton Encyclopedia of Poetry and Poetics, Princeton, Princeton University Press.

Rempich, Ch (1951), "Die älteste Dichtungen in Neupersischen", in: ZDMG، c 1.

Tafazzoli, A (1974), "Some Middle Persian Quotations in Classical Arabic and Persian Texts", in Philippe Gignoux and Ahmad Tafazzoli, eds،.

Mémorial Jean de Menasce, Louvain and Tehran, 1974, pp. 337-49.

(*) نووسەر زاراوەی سرووتە زارەکییە (ئێرانی)یەکانی بەکارهێناوە. لێرەدا بە باشم زانی (کوردی) بە کاربێنم، چونکە کورد بۆ خۆی خاوەن ئەدەبی نووسین و زارەکی تایبەت بە خۆیەتی، هەرچەند، زمانی کوردیش لە لقی زمانە ئێرانییە رۆژئاواییەکانە.

(1) Silēman
(2) Kreyenbroek
(3) Jindy Rashow
(4) Izadi
(5) stanza
(6) Cohesion
(7) textuality
(8) Preminger and Brogan
(9) intertextuality
(10) Humbach
(11) Verse
(12) Benveniste
(13) Tavadia
(14) Jamasp - Asana
(15) elegiac distich
(16) Rempich
(17) Dames
(18) Elfenbein

# شێوازێن قۆپیایێ یێن پتر بەربەلاڤ لدەف قوتابیێن ئامادەیێ لدویف بۆچۆنێن مامۆستاییێن وان لناڤەندا قەزا زاخۆ

**م.ھ. زاھد سامی محەمەد**
پشکا دەروونزانی– فاکولتیا زانستێن
مرۆڤایەتی – زانکۆیا زاخۆ

## پێشەکی:

قۆپیا یان گزی ژ کریارێن ناشرین و خرابن دەمێ دئێتە رویدان دناڤ جڤاکیدا بگشتی و دقوتابخانێدا بتایبەت، و رێژا پەیدابوونا ڤێ کریارێ بگەلەك ئەگەرا ڤە گرێداییە، بەلێ سەرەڕای خرِ ئەگەرا کریارەکا نەڕەوایە. د ماوێ چەند سالێن وانەگۆتن و سەرەدەریێ دگەل قوتابیان و کارکرنێ ل سەنتەرێن پەروەردەیی ، ئەڤ چەندە بۆ ڤەکولەری پتر ئاشکەرا بوو بتایبەت دەمێ رابووی ب بەرھەفکرن و دابەشکرنا راپرسینەکێ لسەر چەند مامۆستایەکا و د ھەمان دەمدا برێکا چاڤپێکەفتنێ دگەل ھژمارەکا قوتابیان بھاریکارییا ھەردوو بەرێزان (حبیب ابراهیم خلیل، شعبان عبدالقادر عبدالحمید) و گەھشتیە وێ باوەریێ کو دیاردا قۆپیایێ ژ وان دیاردێن پرانیا قوتابخانا ژێ دنالینن. و ئەڤ کارێ نەپەسەندکری دبیتن ب شێوەیەکێ راستەوخۆ یان نا راستەوخۆ ، ب ئاشکەرایی یان ب نھێنی بێتەکرن، و وەکی ھەر دیاردەیەکا دیتر ب شێوازێن تایبەت و جۆراوجۆر بێنە ئەنجامدان و ژ بلی نەشرینی یا وێ دئێتە ھژمارتن وەك کارەکێ زیانبەخش و دویر ژ رەوشت و یاساییێن گرێدای ب رەوشت و تیتالێن جڤاکی و ئایینی و یاسایی ڤە. لەورا پشتی ڤێ دویڤچونێ بۆ ڤەکۆلەری پرسیارەك خۆ دئینەتە پێش ئایا:

کیش جۆرێن قۆپیەکرنێ پترتر ژ ھەمی جۆرێن دیتر د ناف قوتابیێن خواندنگەھێن مەدا د بەربەلاڤن ؟ و ئەڤ پرسیارە بوویە ھێڤێنێ ڤێ ڤەکۆلینێ لدۆر ڤێ دیاردەیا لناڤ قوتابیاندا دئێنە ئەنجامدان.

## گرنگیا بابەتی ڤەکۆلینێ:

کردارا قۆپیایێ ژ دیاردێن بەربەلاڤە لناڤ زوربەی جڤاکێن سەردەم یێن جیهانێدا، چ بشێوازێن کۆم یان ب تاکی و لناڤ مەزنان یان ژی بچوویکان بیتن و یان ژی بکەرێ وێ چ نێر بیتن یان ژی مێ بیتن. هندەك ددەنە دیارکرن کو ژ رەفتارێن نا تەندروستە و نیشانا رەوشتێ لاوازە و دەستپێکا لادان و ڤارێبوونێیە، وە هاندەرەکە بۆ هندێ کە ڕاستیا و دروستیا و کەتواریا بگۆهۆڕیتن، و ئەو ژی ژ بەر ئەگەرێن وەکی پاراستنا هندەك بەرژەوەندیێن تایبەت و کەسی و یان مادی یان مەعنەوی (البدري، ٢٠٠٥: ١٣٦) و زیانمەندیا وێ و دژ بوونا وێ دگەل داب و نەریتێن جڤاکی و بهایێن مرۆڤایەتیێ ژ ڤێ ئێکێ دەردکەڤن.

هەرچەندە دبیتن دەستپێکا ڤێ دیاردێ وەك دیرۆك یا دیار نەبیتن چونکی رەفتارەکە گەلەك جاران د هەلویست و دەلیڤەیێن جیاوازدا مرۆڤ نەچار دبیتن پەنایێ بۆ ببەتن، لێ وەکی ژێدەرەکێ کەڤنارە و بو هنگی دزڤریتن دەمێ (شوعەیبی) پێغەمبەری (س.خ)، دناڤ نەتوێ خۆدا دەست ب بانگەشەیا خۆ کری دا بەرێ خەلکێ بدەتە باشیێ و قەنجیێ ، کو ژ لایێ وان ڤە دزی و قۆپیا د هاتە کرن دکرین و فروتنێدا و د تەرازییێدا، و د قورئانا پیرۆزدا ب ئاشکەرایی ئەڤێ چەندێ دیار دکەت. بسم الله الرحمن الرحيم"وَإِلَى مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا فَقَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَارْجُوا الْيَوْمَ الآخِرَ وَلا تَعْثَوْا فِي الأَرْضِ مُفْسِدِينَ"(سورة العنكبوت، الآية: ٣٦) وكذلك في قوله "وَيَا قَوْمِ أَوْفُواْ الْمِكْيَالَ وَالْمِيزَانَ بِالْقِسْطِ وَلاَ تَبْخَسُواْ النَّاسَ أَشْيَاءهُمْ وَلاَ تَعْثَوْاْ فِي الأَرْضِ مُفْسِدِينَ" (سورة هود، الآية:٨٥) (شيلاني،١٩٩٨: ٦٠٤ )

رەفتارێن دیاردەیا گزیێ و قۆپیایێ د بوارێ فێربوون و خواندنێدا وەك هەر رەفتارەکی دی یێن نادروستن د ژیانێدا دئێنە ئەنجامدان، وە قوتابی ڤی ڕەفتاری وەردگریت و فێردبیتێ نەك برپکا فاکتەرێن بۆماوەیی دئێتە ڤەگۆهاستن ، بەلێ ب رێکا وێ ژینگەهێ ئەوا ئەو تێدا دژیتن و ئەڤە بۆ چەندین فاکتەر و بناسان دزڤریتن کە ژ وانا ئەڤێن خوارێ نە: **"هۆکارێن ئاڤاکرنا جڤاکی ، و هۆکارێن پەروەردەیی و فێرکرنێ ، و هۆکارێن ئابووری...هتد"** (ربيع،٢٠٠٨: ٢١٧)

ڤەکۆلین ددەنە دیارکرن کە دیاردەیا گزیێ بەرەف زێدەبوونێیە، هەرچەندە (٧٠٪ ) ژ قوتابیان تاڕادەیەکی و ب دەڤ نەرازیبوون و دژایەتیا خۆ بەرامبەر ئەڤێ

دیاردێ ددەنە دیارکرن، لێ سەرباری وێ چەندێ (٨٠٪) ژ قوتابیان بو جارەکێ قۆپیایێ دکەن. و هەروەسا ڤەکۆلین ئاماژەی ب وێ چەندێ ددەن کە ئەو قوتابیێن خوّ بوّ ئەزموونێ باش بەرهەڤ دکەن قۆپیایێ ناکەن، لێ ئەوێن خوّ باش بەرهەڤ نەکەن پتر یێ بەرهەڤەن قۆپیایێ بکەن (عربیات، ٢٠٠٧: ٢٢٩ ).

قۆپیا ژ کریارێن درنیا هزرییە ب چ شێوەکێ بێتە ئەنجامدان، ئەو کریارەیە کو رێکی خۆش دکەتن قوتابی بگەهیتە بەرسڤێ بێی تێبگەهیتن، لەورا دئێتە هژمارتن ژ رەفتارێن مەترسیدار ژ لایێ بسپۆرێن پەروەردەیی و سایکۆلۆژی ڤە، کە دبیتە ئەگەرێ هەستکرنا قوتابیێ قۆپیاکار ب هەبوونا هەستا کێماسیێ، و دبیتە ئەگەر کە وی کەرب ژ خوّ ڤە بێن ، و ئەگەر هاتە گرتن دێ هەست ب سەرشۆرییێ و بێووچییێ کەتن (قەرەچەتانی ،٢٠٠٨: ١٥٣) ، و هەروەسا ژلایێ دەروونی ڤە ئەو کەس دێ هەست ب بێ رێزیێ کەتن (المعایرة، ٢٠٠٧: ١٦٧)، و ئەڤ کارە قوتابی بەرەڤ کەسەکێ لاواز و دووروویاتیێ و دووانیزمێ دبەتن (البدري،٢٠٠٥: ١٣٦)، هەروەسا بسپۆر و شەهرەزاییێن بوارێن زانستێن مرۆڤایەتی و نەخاسمە سایکۆ- سۆسیۆلۆژیێ ڤی سالوخەتی ب ئێک ژ مەزنترین و مەترسیدارترین رەفتارێن هەرفاندنا جڤاکێ دزانن ، کە دەڤەرێن وەکی مە سالەهای سالە بدەست وێ ڤە دنالینن (حیتو ، ٢٠١٣: ١٣٠- ١٦٣ )، کە وەك یاسین (٢٠١١) ئاماژەی پێددەتن هەمی گەندەلیێن دارایی و کارگێری لنك مە ژ ئەگەرێ بێئۆمێدی و نەخۆشیێن سایکۆلۆژی دروست دبن، و تەنها رێکێن چارەسەرکرنێ لایەنێن پەروەردەییە و سیستەمەکی دادپەروەر هەبیت ( یاسین، ٢٠١١: ٣١٢).

کریارا قۆپیایێ بەلگەیەکە دسەلمینیتن کە ئەو مرۆڤێ ئەوی کاری دکەتن باوەری بخوّ نینە یان یێ لاوازە، و ئەڤ کارە هندەك سالۆخەتێن نەباش لنك قوتابی پەیدادکەتن وەکی سستی و تەمبەلیێ و هەروەسا کەرب ڤەبوون ژ سیستەمێ خواندنێ و ئەزئەزوکیێ (ربیع،٢٠٠٨: ٢٢٢)، و گرنگییا ئەزموونێ و ئەنجاما سڤك دکەت و دبیتە ئەگەرێ نەهێلانا هەڤرکیا رەسەن دناڤبەرا قوتابیادا، کە رێکەکا زۆر گرنگە ژپێخەمەت پێشڤەبرنا ئاستێ زانین و زانستێ ل هەر جڤاکەکێ، چونکی هەڤرکاتیا دروست و لسەر بنەمایێن مرۆڤایەتیێ و زانستی ئێکە ژ بنەمایێن سەرکەفتن و پێشکەفتنێ لسەر ئاستێ مرۆڤی و جڤاکی و جیهانی.

ژلایێ لۆژیکی ڤە پێگەهشتنا جڤاکی ( Socialization ) پرۆسێسا گۆهۆڕینا مرۆڤییە، پێدڤی ب بهایێن جوان و مرۆڤایانەیە. و دیار دبیت ب رێکا پەیوەندیێن کەسی د ناڤبەرا وی دگەل خەلکا دیتر د سنوورێن کلتووریدا، و لدویڤ شیان، بها، مێنتالیتە و زانینێ و یا کۆ ب فەر دهێتە زانین بۆ ژیانەکا کلتووریان و سەردمیانە ( Neubeck & Glasberg, 2005: 11 ، Немов, 2007: 217)، و ناهێتە ڤەقەتاندن ژ ژینگەها جڤاکی و سروشتێ و جوگرافی و فیزیکی و ئەندازیاریێ..هتد کۆ پرۆسێسا خاندنێ نەشێتن خۆ ژ بن کاریگەریا وان قۆرتال بکەتن و بێ ئێك و دوو دکەڤیتە بەر کارتێکرنا ڤان فاکتەرێن گرنگ ( قطامی، ٢٠٠٤: ٢٥١) و دبیت ببیتە هاندەرەك ژبو پەیدابوونا کریارا گزیێ.

دیاردەیا قۆپیایێ دئێتە هژمارتن ب ئێك ژ رەفتارێن نارەوشتی و دبیتە ئەگەرێ بەلاڤەبوونا تاوانان ، نەخاسمە هەکەر زالّ بوو لسەر رەوشتێ مرۆڤی و گشتگیر بوو د جڤاکێدا. چونکە ئەگەرەکی سەرەکییە بۆ هەرڤاندنا هەستێ بەرپرسایەتیێ کە دبیتە گەفەك راستەوخۆ ل رەوشتێ جڤاکی و هەروەسا زیانێن مەزنێن هەین لسەر کەسی و وەل خودانێ خۆ دکەتن کە ل پاشە رۆژێ مالێ خەلکی بدزیتن و سەختەکاریا د کارێ و دگەل خەلکێدا بکەتن (صحار، ٢٠٠٩: ب.ل) ، و ژبەر گرنگیا خاندنگەها و ئەرکا ماموستا ژبو پەروەردەکرنا تەندروست یا قوتابیا هەر دوو پەروەردەکارێن سویدی گوستافسۆن و لیندهۆلم ( Gustavsson & Lindholm, 2002 ) د وێ باوەریێدانە کە ئێك ژ ئەرکێن گرنگ لنك مامۆستایەکێ هۆشیار و زیرەك هەستا بەرپرسیارەتیێ لنك قوتابیان دروست بکەن ، و ئێك ژ ڤان رێکا ژی پێدانا ئازادییێ ب وان و هەروەسا ئێکبوون و ئێکگرتنا وان (گوستافسۆن و لیندهۆلم، ٢٠٠٢: ١٢٢ ) و دبیتە ئەگەر کو مللەت پاشڤە ب مینیتن.

ژلایێ رەوشتی ڤە ئەو کەسێ قۆپیایێ دکەت دئێتە هژمارتن ژ کەسانێن درەوکەر چونکی کەسێ بەرامبەر دخاپینیتن و بسەردا دبەتن ، و دبیتە ئەگەرێ لاوازبوونا پەیوەندیا دناڤبەرا وی و یێن دیدا دکەت و ب تایبەت ماموّستایاندا کە دبیتە ئەگەرێ شکاندنا دیوارێ باوەریێ دناڤ واندا. د هەمان دەمدا دبیتە جهێ پەیدابوونا نادادپەروەریێ ، ژ بەر کۆ هەکەر ئەو کریارە لسەر مامۆستایێ را دەرباس بوو دێ مافێ هندەك قوتابیان هندابیتن یان دێ ئێتە خوارن و هندەك

قوتابییێن دی یێن نە ژ هەژی وێ پلەیێ دێ بدەستخۆ ڤە ئینن و دێ ئاستێ وان بەرز بیتن (المعايرة، ٢٠٠٧: ١٦٧)، لەورا قوتابییێ زیرەك هەست ب بێزارییێ دکەتن یان دێ ترس و دوودلیێ لدەف پەیدا بیتن دەمێ ئەڤ کریارە دهێتە ئەنجامدان (عربيات،٢٠٠٧: ٢٣١).

کریارا قۆپیایێ رەفتارەکی ئازرێنەرە و خۆ هاندەرە ژ بۆ دووبارەکرنێ ژ بەر کۆ ئامرازەکی ساناهییە و د شیاندایە د ماوەیەکی کێمدا ئارمانجێن مەبەست ب ساناهی بدەستڤە بهێن و پێداویستی یێن ڤی کەسی گەلەك ئاسان و بێ ماندیبوون بێنە تێرکرن (الشهری، الانترنیت، ب.ل).

**گرنگیا ڤی ڤەکۆلینێ ب کورتی بدەینە دیارکرن وەکو لخارێ هاتی:**

١- قۆپیا کریارەکا نەدروستە و زیانێن وێ یێن دەروونی و جڤاکی و ئابووری گەلەکن چ ل دەمێ نها بیتن یان ل ئایندەیدا.

٢- دبیتە ئەگەرێ پەیدابوون و بەربەلاڤبوونا نەدادپەروەرییێ دناڤ وان قوتابیێن وێ کریارێ نەکەن و وان بەرەف بێ ئۆمێدیێ دبەت ، و هەروەسا کارتێکرنێ ل هەستێ بەرپرسایەتیا وان دکەت.

٣- لەوانەیە ببیتە ئەگەرێ تێکچۆنا پەیوەندی یا دنافبەرا مامۆستا و قوتابیا و سەمیان و کەسوکارێن قوتابیان و کارتێکرنێ لسیستەمێ پەروەردێ و فێرکرنێ.

٤- ژبو پتر پەرەپێدان ب یاسا و رێنماییێن تایبەت ب دیاردەیا گزیێ ل دەمێ تاقیکرنادا ژ لایەنێ لیژنێن تایبەت ڤە.

**ئارمانجێن ڤەکۆلینێ:**

١. زانینا هەبوونا قۆپیاکرنێ دناڤبەرا قوتابیێن قوناغا (١٠ - ١١) ئامادەییدا دئەزموونێن نڤێسیندا ل دویف بوچوونا ماموستاییێن وان لناڤەندا قەزا زاخۆ.

٢. رێزکرنا شەش شێوازێن قۆپیایێ ئەوێن پتر بەربەلاڤ د ناڤبەرا قوتابیێن پولا (١٠-١١) ئامادەی لدویڤ بۆچۆنێن مامۆستاییێن وان لناڤەندا قەزا زاخۆ.

٣. زانینا شەش شێوازێن قۆپیایێ یێن هەرە بەربەلاڤ لناڤ قوتابیێن پولا (١٠-١١) ئامادەیی لدویڤ بۆچۆنێن مامۆستاییێن وان لناڤەندا قەزا زاخۆ لدویڤ بگۆهۆرێن (البدائل): أ-( رەگەزی) ، ب- (بسپوری) ج- (سالێن خزمەتێ).

**سنووریێ ڤەکۆلینێ:**

پێك دهێت ژ هەمی مامۆستایێن قوتابخانەیێن ئامادەیی یێن کۆ دزانن ب زمانێن کوردی بئاخڤن و بنڤیسن ل پۆلێن (١٠-١١) سالا خواندنێ ( ٢٠١٢ – ٢٠١٣) ل ناڤەندا بازێرێ زاخۆ.

**دەستنیشانکرنا تێگەها:**

١. **(عسری و شتری ) قۆپیایێ پێناسە دکەن کو** رێکەکا نەدروست ژ لایێ قوتابی ڤە دهێتە ب کارئینان ژ بۆ بدەستڤەئینانا بەرسڤا دروست، ئەڤجا چ ب زارەکی یان ب نڤێسین بیتن (المعایرة، ٢٠٠٧: ١٦٦).

٢. **(ربیع ، ٢٠٠٨) قۆپیایێ پێناسە دکەت** کە هەولدانەکا نەباشە ژلایێ قوتابی ڤە تێتە ئەنجامدان داکۆ بگەهیتە بەرسڤێن ئەزموونێ و برێکێن نەیاسایی کە کارتێکرنێ ل ئەنجامێن هەلسەنگاندنێ دکەتن (ربیع،٢٠٠٨: ٢١٤).

٣. (عبري، **٢٠٠٩) قۆپیایێ ددەنە پێناسەکرن** کە ئەو هەولدانێن چەوتن ژلایێ قوتابیا ڤە دئێنە ئەنجامدان داکو بگەهنە بەرسڤێن ئەزموونێ ژبو بدەستڤەئینانا نمرا (عبري،٢٠٠٩، الانترنت:ب.ل).

٤. **زاراڤێ قۆپیا ژ لایەنێ پەروەردەی ڤە**: رەفتارەکا نەدروستە قوتابی دکەت داکو ئەنجامەکێ بلند بدەست خوڤە بینیت، هەروەسا تێتە نیاسین کو قۆپیا دژی رەوشتێ مروڤایەتییێە (عربیات،٢٠٠٧: ٢٢٩).

٥. **زاراڤێ قۆپیا ژ لایەنێ شەرعی و ئایینی ڤە:** بریتییە ژ تێکەلکرنا قەنجی و خرابیێ و بلاڤەکرنا خرابیێە (العزاوي، ٢٠٠٦، ئینترنێت:ب.ل ).

**بەراوردی دنافبەرا زاراڤێ "قۆپیا" دبوارێ خاندن و فێرکرنێدا بکار دێت و هندەك زاراڤێن نزیك بو هەمان تێگەه:**

**سەختەکرن:** کرنا درەوێیە و دیارکرنا تشتێ نە رەسەن وەکی یێ رەسەن، ئانکو باشکرنا تشتێ خراب بەرامبەر یێ چاك.

**درەو:** گوتن یان کریارەکا نەوەسایە وەکی ئەو د دەتە دیارکرن، ئانکو ئەو ئاخفتنا پێچەوانەی راستییێە، ئەڤجا چ ئەف ئاخفتنە ب سووری یان ژی بێ دەستی بیت (فرج،٢٠٠٩: ٢٤٧).

**دوریاتی:** دوریاتی ئەوە کو هندەك تشتا ڤەدشێریت و هندەکێت دی دەردئێخیت، (القائمي،٢٠٠٤: ٢٩١).

**وەکهەڤیا (درەو ، دزی ، قۆپیا).**

ڤەکۆلەر دبێژن ئەوێ دزیێ دکەت دهەمان دەمدا درەوێ و قۆپیایێ ژی دکەت، و ئەڤە نە تشتەکێ سەرسورمانە، چونکە تێگەهەکە ڤان هەر سێکا پێکڤە گرێددەت، کە درەو نەئەمینییە د ئاخفتنێدا، و دزی و قۆپیا نە ئەمینییە د کریارێدا (القوصي،١٩٥٢: ٣٦١).

**ڤەکۆلەر قۆپیایێ (گزیێ) بشێوەیێ تیۆریکی دبوارێ پەروەردێدا ددەتە پێناسەکرن کە: رەفتارەکا نا تەندروستە کە قوتابی برێکێن دزی ڤە ئەنجام ددەن دا نمرەکا نە ژ هەژی بدەستخۆڤە بینیت.**

**ڤەکۆلەر قۆپیایێ (گزیێ) بشێوێ کرداری پێناسە دکەت کە: بریتییە ژ نمرا بەرسڤدەر بدەستخۆڤە دئینیت دەمێ بەرسڤێ لسەر وی پیڤەری ددەتن ئەوا د ڤێ تۆژینەوێدا هاتیە بکارئینان.**

**ئەدەبیاتێن تیۆری و خاندنێن بەروەخت لسەر قۆپیایێ:**

**١- ئەو هوکارێن دبنە پالدەر ژبو پەیدابوونا رەفتارێ قۆپیایێ:**

**أ- پەروەردەکرنا خێزانی:**

بێ گومان زاروك ژ خێزانێ فێری داب و نەرێت و رەوشت و تێگەها دبیت، ئەڤجا ئەو ئاریشە و هەڤریکی و نەخۆشی و ژێکڤەبوونێت دناڤبەرا دەیك و بابادا یان دخێزانێدا روویددەن هۆکارن کو زاروك فێری بهایێن نەدروست و نەباش ببیت و هەروەسا بەرەلاکرنا زاروکی ژلایێ خێزانێڤە و گرنگی پێ نەدان دبیتە رێ خۆشکەر کو زاروك (قۆپیایێ و درەوێ و دزیێ...هتد) فێر ببیت (ربیع،٢٠٠٨: ٢١٩). و هەروەسا دەمێ شێوازێ بەرسینگگرتنا رەفتارێن خراب ژلایێ خێزانێ ڤە یێ وەسابیت کو هەر دەمێ خەلەتیەك ژ زاروکێ خو دیت ئێکسە وی سزا بدەن بێی دانوستاندن و دیف چون (شیفر،ومیلمان،٢٠٠٨: ٤٤١)، ئەڤجا لڤێرێ زاروك دبێژیت مادەم چارەسەری بڤی شێوەیە ئەز نەچارم کو (درەوێ و قۆپیایێ و دزییێ) بکەم. لەورا دبینین پەروەردە پێدڤی ب زانین و شەهرەزایێ هەیە ژبو دروستکرنا کەساتیەکا ساخلەم. و پاشی بسپور و شەهرەزا دبوارێن زانستێن

مرۆڤایەتیێ د وێ باوەرێدانە کە نەساخێن دەروونی تووشی هندەك جۆرێن لادانێن رەفتاری دبن کە تێدا یاساییێن جڤاکی پێشێل دکەن و لدویڤ رەوش و تیتالێن جڤاکی ناچن و کاری پێ ناکەن، و د هەمان دەمدا نیشانێن تێکچوونێن دەروونی وەکی ستریس ( Stress ) یان نیگەرانی، و رەفتارێن نەگونجێنەر بەرەنجامێ ژینگەهەکا جڤاکی نەك بایۆلۆژیکی ( تاسیگ و دیگران، ١٣٨٦ك: ٤٠٧ ).

**ب- سیستەمێ ئەزموونا:**

سیستەمێن ئەزموونا ژ هوکارێن سەرەکی دێنە هژمارتن ژ بو پەیدابوونا قۆپیایێ، وەك زەحمەتیا ئەزموونا یان دەمێ ئەزموونێ یێ کێم بیت یان ترسا قوتابی ژ ئەزموونێ یان دەمێ رێژا سەرکەفتنێ کێم بیت یان لاوازیا ماموستایا دچاڤ دێریکرنێدا یان بەرچاڤ وەرنەگرتنا جیاوازیت تاکی دداناندنا پرسیارادا یان ژی دەمێ رێژا قوتابیان زور بیت د هولا ئەزموونێدا، یان دەمێ ماموستا پشت بەستنێ لسەر ئێك شێوازێ هەلسەنگاندنا قوتابی دکەت، و دهەمان کاتدا شێوازێن دیتر پشت گوه دهاڤێت، وەك چالاکین قوتابخانێ و ئەزموونێت زارەکی و دانا ئەرکێت مال...هتد (الخليلي،٢٠٠٥: ٣١٣).

**ج- ژینگەها قوتابخانێ ددەمێ ئەنجامدانا ئەزموونادا:**

بشێوەیەکێ گشتی بارودوخێ قوتابخانێ ل دەمێ ئەزموونادا ژ وان هوکارێن بەرچاڤە بۆ زێدەبوونا قۆپیایێ وەك توورەبوونا ماموستایا دگەل قوتابیان و سەرەدەرەیەکا نەچاڤەرێکری. ڕەنگە قوتابخانە بشێوەیەکێ ئێکسەر قوتابی فێری (درەوێ و قۆپیایێ و دزییێ) ناکەتن، بەلکی هندەك جارا وی نەچار دکەت کو ئەڤان جورە رەفتارا ئەنجام دەت (مرسي، ١٩٧٣: ٢١١).

**د-لاوازیو نەزیرەکیا ماموستای:**

ئەگەر ماموستایی بباشی وانە شروڤە نەکر و ئاستێ وی یێ زانستێ و فێرکرنا پەروەردەیی یێ نزم بیت، و ژمارەکا زورا قوتابیان تێنەگەهشتن وی دەمی دێ قوتابی بو ئەزموونا ڤی جورە ماموستای پەنایێ دبەتە بەر قۆپیایێ (قەرەچەتانی، ٢٠٠٨: ١٥٥).

**هـ- خەمساری و نەخواندنا قوتابی:**

بێ گومان ئەو قوتابین تەمبەل و نەخوێنن و بچاڤەکێ کێم بەرێخو ددەنە پروسا پەروەردە و فێرکرنێ ب رێژەکا زور پەنایێ بو قۆپیایێ دبەن (قەرەچەتانی،٢٠٠٨: ١٥٣).

**و- کارتێکرنێن جڤاکی و ئابووری:**

ڤەکولەرێن جڤاکی و ئابووری ددەنە دیارکرن کو لایەنێ جڤاکی و ئابووری هوکارێت گرنگن بۆ بەربەلافبوونا قۆپیایێ، و هەروەسا ددەنە خویاکرن کو ئەو خێزانێن ژ چینێن بلند (دەولەمەند) هاندانا زاروکێت خو دکەن بو بدەستڤەئینانا پلێت بلند و ئەف خێزانە وەسا دبینن بەس زاروکێت وان پلێت بلند بدەستخوڤە بینن ئەڤجا ب چ شێوە بیت دروستە، لێ خێزانێت ژ چینێن نزم (هەژار) کو جڤاك ب چاڤەکێ کێم لێ دنێرن و دهەمان دەمدا ئەف خێزانە وەسا تێ دگەهن کو کرنا قۆپیایێ ژ کارێن نەجوان و خرابە ژ لایێ ئاینی و رەوشتی ڤە، ئەفجا ژبەر ڤێ چەندێ ئەف خێزانە کێمتر گەشبینن ژ بو بدەستڤەئینانا پل و شوێنێت بلند، لێ رامانا وێ نە ئەوە کو قوتابین ژ چینێن نزم و ناڤین دسەردا ناچن و قۆپیایێ ناکەن (ربیع،٢٠٠٨: ٢١٧).

**٢- گەشکرنا قۆپیایێ لدویف قوناغێن تەمەنی:**

هندەك بسپۆرێن پەروەردەیی و دەروونی ددەنە خویاکرن کو تێگەهـ و رەفتارێ قۆپیایێ گەشە دبیت لدەف کەسێ قۆپیاکار لدویف قوناغێن لخارێ هاتین:

أ- قوناغا قۆپیایا بێ گونەهـ "بەرەلای" ژ(١-٧ سالی): ئەف قوناغە قوناغا فێربوونا راستیا و بنەمایا و رەوشتایە و دەمێ قۆپیا تێتە کرن نە ب شێوێ مەبەستا دروستە بەلکی چاڤلێکرنە.

ب- قوناغا قۆپیایا پێتڤی ژ (٨-١٢ سالی): د ڤێ قۆناغێدا قۆپیا تێتەکرن دەمێ قوتابی دکەڤیتە د دەلیڤەیەکا تەنگدا کو رادبیت ب کرنا قۆپیایێ، و ئەو نزانیت کو ئەڤە قۆپیایە وەك دەمێ ئەرکێ مال لبەر هەڤالێ خو چێکەت. و قۆپیا دڤێ قوناغێدا قۆپیایەکا کاتییە.

ج- قوناغا قۆپیایا کەسایەتی یان تێستی (١٣-١٨ سالی): ئەڤ قوناغە تێتە نیاسین ب قوناغا سنێلییێ، و دەمێ قوتابی قۆپیایێ دکەت رامانا وێ ئەوە کو قوتابی حەزەك یا هەی ئەوی دڤێت ڤێ حەزێ تژی کەت داکو خو دیارکەت. هەروەسا دەمێ قۆپیایێ دکەت رامانا وێ ئەو نینە کو قۆپیا یا بویە ساخلەتەك یان رەوشتەك ل دەف وی نەخێر بەلکی ئەوی ئارمانجەك یا هەی و وی دڤێت بگەهیتە وێ ئارمانجێ.

د- قوناغا قۆپیایا رێکخستی (ژ ١٩ سالیێ و پتر): دڤێ قوناغێدا قۆپیا دبیتە رەفتارەکا ریکخستی و ئارمانجدار و دبیت نە ب تنێ قۆپیا د بوارێ ئەزموونادا بهێتە بکارئینان بەلکی ژ دەرڤەی قوتابخانێ ژی بهێتە بکارئینان و ل دوماهیکێ ببیتە رەوشت (الزرکوشي،٢٠١٣، ئینترنێت: ب.ل).

### ٣- جورێن قۆپیاکرنێ دبوارێ خاندن و فێرکرنێدا:

أ- قۆپیا راستەوخۆ و قۆپیا ناراستەوخۆ: قۆپیا راستەوخۆ دئێتە ئەنجامدان ژلایێ قوتابی ڤە د هەمان کات و شوێن و ئەرکدا. بەلێ قۆپیا ناراستەوخۆ ئەوە دەمێ ماموستا دبێژیتە قوتابیان ئەڤە یا گرنگە بخوینن و ئەڤە نە یاگرنگە و نەخوینن (الخليلي،٢٠٠٥: ٢٢٣).

ب- قۆپیا تاك و قۆپیا کوم: قۆپیا تاك ئەو شێوێ هەولدانێیە کە بەرسڤدەر بەرسڤا دروست بدەستخۆڤە بینیت ب رێکێن نا رەوایی ب پالپشتی کرن ل سەرخوە بخۆ. بەلێ رامان ژ قۆپیا کوم ئەوە کە کارکرنا هندەك بەرسڤدەرا ژبو بدەستڤەئینانا بەرسڤێن دورست ب هاریکارییا کەسانێن دیتر ژ دەرڤەی کوما وان (شحاتة، النجار، ٢٠٠٣: ٢٢٧).

### ٤- سروشت و پالدەرێت قۆپیاکەری (غشاشی):

کەسێن قۆپیاکەر هندەك سالوخەت لسەر وان دیاردبن وەك: تەمبەلی ، و دەرفەت دیتن ، و پالپشتی لسەر کەسانێن دی، و حەزا پتر ژ شیان و مافێت خو ببەت، و حەزا دزیی، و شکاندنا یاسایێ، و حەزا موغامەرێ (کو قۆپیا **ریسکەکا** خۆشە و دشێت کارێت بمەترسی بکەت)، و سالوخەتێن کەسێ **سیکۆپاتیك** (Psychopathic personality) کو رێزێ ل داب و نەرێت جڤاکی ناگریت و بو حەزێن

خۆ دژیتن ، و هەروەسا کرنا درەوێ ، و سختێ و توند و تیژیی درەفتارێدا، و نەبوونا هەستا گونەهباریێ ( پورأفکاری، ۱۳۸۰ك: ۱۲۱۳ ).

**٥- پالدەرێن هاریکار بوکرنا قۆپیایێ:**

أ- **باوەری بخۆ نەبوون:** گرژی کەری دڤێت کەسایەتیا خۆ دیاربکەت کو ئەوژی وەك هەڤە.

ب- **لێ گەریان ل خوشتڤیێ:** کەسەکە هەست دکەت کو کەس حەش وی ناکەت، ئەڤجا رێکەکە ژبو سەرنجا کەسانێن دی بکێشیت.

ج- **خودانباشییە ژ درەو:** وەسا هزر دکەت کو هاریکاریا هەڤالا ب قۆپیایێ کارەکێ باشە (البدري، ۲۰۰٥: ۱۳٦).

**٦- سروشتێ چاڤدێر و سەروکێن لژنا لدەمێ رازیبوونا وان ب کرنا قۆپیایێ:**

أ- **لاوازیا رەوشتێ وی**، ئەو نزانیت کو کارەکێ خرابە و وەسا هزر دکەت ئەڤەژی جورەکێ دلسوزییێیە ئەو دگەل قوتابیا دکەت.

ب- **جوانکرنا کەسایەتیا خۆ**، دبیت ئەو بخو حەش قۆپیایێ ناکەت بەس نەڤێت دلێ کەسێ ژ خو بهێلیت و دا نەبێژن یێ خرابە.

ج- **کەسایەتیەکا نەرێنی یێ لاواز**، نەشێت بێژیتە خەلکی نە، دناڤا خودا دزانیت خەلەتە و حەژێ ناکەت، لێ وی نەڤێت خو تووشی ئاریشان بکەت.

د- **سایکوباتی**، ئانکو خودان بەرژەوەندیە رێکێ ددەت بو کرنا قۆپیایێ ژبەر بەرژەوەندیا خو ( پورأفکاری، ۱۳۸۰ك: ۱۲۱۳ ).

**بۆچوونێن هندەك بیردۆزا لدۆر بابەتێ خواندین:**

**۱- بیردوزا (سکنر)ی "ماندان""خەلات کرن":**

سکنر دبیردوزا خودا ددەتە دیارکرن کو ئەگەر زاروکی کارەکێ باش ئەنجام دا پێتڤیە بهێتە خەلاتکرن، ژبەرکو ئەڤ خەلاتکرنە دێ بیتە ئەگەرێ دووبارەبوونا وی رەفتارێ، و دهەمان دەمدا ئەگەر کارەکێ خەلەت ئەنجامدا پێتڤیە بهێتە سزادان یان دیرکرن ژ وی تشتێ خوشتڤی ل دەف وی ، ئانکو خێزانێ رولەکێ مەزن هەیە ، و هەر لسەر ئەڤی بنەمای دەمێ قوتابی رادبیت ب کرنا قۆپیایێ تێتە خەلاتکرن، رامانا وێ نەئەوە ماموستا وی خەلات دکەت بەلکی ئەو نمرا وی

بدەستخوڤە ئینای دبیتە خەلاتێ وی ، و ئەڤ خەلاتکرنە دبیتە ئەگەرێ وێ چەندێ کو وی رەفتاری دووبارە بکەت (الزيات،٢٠٠٤: ٢٠٢– ٢٠٦).

**٢– بیردوزا فێربوون ب چاڤلێکرنێ (باندورا)ی** (التعلم بالملاحظة)

باندورا دبیردوزا خودا دیار دکەت کو زاروك فێری رەفتارا دبیت برێکا تێبینی کرنێ نەئیلا ب فێرکرنێ، ئانکو دەمێ زاروکی دیت دەیکێ یان بابی درەو کر یان هەر رەفتارەکا دیتر ئەوژی دێ هەمان رەفتاری گریت (العزاوي،٢٠٠٦:ب.ل، و (Gleitman, Fridlund, Reisberg, 2004: 519).

**٣– بوچوونا ماکلیلاند:**

دویڤبوچۆنا "ماکلیلاند"ی ئەگەر " پالدەرێ ب دەستڤەئینانێ" گەلەك یێ بلند بیت، دبیت قوتابی بەرەڤ قۆپیاکرنێ ڤە بچیت، داکو نمرەکا بلند ب دەست خو ڤە بینیت ژ بەر هەڤرکییێ، و هەروەسا ئەگەر "پالدەرێ ب دەستڤە ئینانێ" گەلەك یێ نزم ژی بیت، دبیت قوتابی بەرەڤ قۆپیاکرنێ ڤە بچیت داکو سەرکەفتنێ بدەست خو ڤە بینیت (منصور، الشرقاوي، عزالدين، ابوعوف، ٢٠٠٣: ١٣٦ – ١٣٩ ).

**٤– بیردوزا (رولومای).**

رولومای دبێژیت (دڵەڕاوکێ) ئانکو (نیگەرانی ) بو مروڤی پەیدا دبیت دەمێ هەبوونا مروڤی دکەڤیتە د مەترسیێدا، هەر لسەر ئەڤی بنەمای بو مە دیار دبیت ئەوییێت رادبن ب کرنا قۆپیایێ هەبوونا وان یا د مەترسیێدا لەوما بڤێ رەفتاری رادبن، ئانکو ترسە وەل وان دکەت قۆپیایێ بکەن دا مەترسیا خۆ کێم کەت، ئانکودا خو ژ وێ نیگەرانیێ رزگار کەتن (عطية، ٢٠٠٨: ٨١).

**٥– بیردوزا (کارل یونگ)ی "رووپوش"(قناع)**

رامانا وێ ئەو وێنێ کەسیە کە مرۆڤ بو خۆ دروست دکەت یان لسەر وی پێتڤیە یێ چاوا بیت، و (یونگ) دبیردوزا خودا ئاماژە ب وێ چەندێ دکەت کو ئەو کەسێن لاوازی دکەڤیتە د خویەتیا واندا هەر چ کارەکێ خراب هەی دێ کەت (دليم، ١٩٩٠: ٨٨). و شروڤە دکەت، و دبێژیت ئەم هەمی رووپوشی بکاردئینیت ژبەر کو جڤاك بو هەرئێك ژ مە رولەکی پەیدا دکەت ئەڤجا دا بدروستایی ب ڤی

رولی رابـــبین پێتڤیـــە لســـەر مـــە رووپـــوش بکـــاربینین. و رووپـــوش رێکـــەکا هەڤگونجاندنێیـە دناڤبـەرا مروڤـی و جڤاکیـدا، ئەگـەر مروڤـی بکارنـەئینا دێ یـێ جیاواز بیت د جڤاکیدا، و بەروڤاژی ئەگەر مروڤی بکارئینا دێ ساخلەتێن خـو یـێن رەسەن ژ دەست دەت، و ئەڤ هەردوو تشتە ژی فێلبازینە مـروڤ دگـەل خـەلکی و دگەل خوژی دکەت (ژێدەرێ سەری،١٩٩٠: ٥٨). ئەڤجا ژڤێ بیردوزێ بومـە وەسـا دیـار دبیـت ئـەو قوتـابیێ قۆپیـایێ دکـەت رووپوشـی بکاردئینیـت، چـونکە دبیـت بسەرڤە وەسا خـو دیارکـەت کـو قۆپیـاکرن کـارەکێ نەڕەوایـە و خرابە...هتـد، لێ سـەرباری وێ چـەندێ خـو ژ ئـەڤێ چـەندێ نادەتـە پـاش یـان ئـەڤ رووپوشـینە دەلیڤەیەك دکەڤیتە دناڤبەرا مرۆڤی و بدەستڤەئینانا ئارمانجێن خۆ، کـە ئێکسـانە دگەل جۆرەکێ دووڕوویێ (Большой психологически словарь ,2007,275).

### ٦- بوچوونا تیوریا مرۆڤایەتی (ئابراهام ماسلو)

تیۆریا خۆ ئاڤاکریە لسەر بنەمایێن دابینکرنا پێدڤیاتیێن جیاواز یێن مرۆڤی و تێرکرنا ئێك لدویڤ ئێکا وان بۆ دوروست بینا کەسایەتی و پێگەهانـدنا مرۆڤـی یـا فەر و ئەرکـەك سـەرەکییە، ئـو دەسـتپێدکەت ژ پێتڤیـێن بیولـوجی وەك: بـرس و تێهن.. و یێن دەروونی وەك: تـرس، و نـەئارامی، و مانـدیبوون.. و یـێن جڤـاکی و رێزلێنان و خۆشتڤیاتی و..هتد. وەدکەت زەحمەتێ ببینیـت هـزرێ د کـارەك دیـدا بکەتن و پاشی هزرێن وی دێ پەلاتەبن دابشێتت خۆ قۆرتالکرن ژ ڤـان هەلوێسـتا. و هەروەسا ژبە و بڤی رەنگی رێزبەندیەکا پێداویستا یێن هەین کۆ ئێك لـدیڤ ئێـك دڤیا بێنە تێرکرن هەتا کو مرۆڤ بگەهیتە تمامکرنێ و بەختەوەریێ. و ئـەڤ ڕاسـتیە لسەر ژیانا قوتابی ژی ب هەمان رەنگ، یان ژ بـەر هـەر ئەگـەرەکێ بـیتن لەوانەیـە ببیتە ئەگەرەك بۆ تێکچۆنا زنجیرا دوروست بینا ستراکچەرێ کەسایەتیا وی و لاواز بینا وێ، و وی ببەت بەرەڤ نزمکرنا ئاستێ شیان و تێگەهشـتنا وی و لـدۆماهیکا وێ فێرکەتە هندەك کریارێن چەوت ( Feldman, 2009:293; Jolley & Mark , 1995 : 366, Passer & Ronald, 2007: 59; Santrock,2009:59 ; Кордуэлл, 2003: 461، 165-166: Coon,1997 ، مقـدم، ١٣٨١ك ، ٦٨١م : ١٠٥-١٠٧). ئـەڤجا ژڤێ بـیردوزێ بـو مـە وەسـا دیـار دبیـت کـو ئـەو کەسـێن قۆپیـایێ دکـەن دبیـت لاوازیەك د خۆیەتیا واندا **هەبیت**.

**کردارێن ڤەکۆلینێ:** بریتییە ژ کردارێن ڤەکولەر پێ رابووی ئەوژی سالوخەت دانا کومەلا ڤەکۆلینێ و چاوانیا هەلبژارتنا سەمپلا وێ، و بەرهەفکرنا ئامرازێ پیڤانێ و دەرێخستنا دروستی و نەگوریێ و هوییێن بیرکاری و ئاماری یێن سەرەدەری ل گەل دێ هێتە کرن.

**ئێک: کومەلا ڤەکۆلینێ و سەمپلا وێ.**

**أ- کومەلا ڤەکۆلینێ:**

ژمارا ماموستاییێن ئامادەی لناڤەندا پەروەردا قەزا زاخو (٦٦٩) ماموستا، ژوان (٣٦٨) ماموستاییێن ژ رەگەزێ نێر بوون، و (٣٠١) ماموستا ژ رەگەزێ مێ بوون*. و خشتێ (١) ئەڤێ چەندێ پتر روون و ئاشکەرا دکەت:

**خشتێ (١)**
**کومەلا ڤەکۆلینێ ددەتە دیارکرن**

| بەش و خزمەت / رەگەز | زانستی | | مروڤایەتی | | سەرجەم |
|---|---|---|---|---|---|
| | (١-١٠) سال | (١١-٢٠) سال | (١-١٠) سال | (١١-٢٠) سال | |
| نێر | ١٤٠ | ١٣ | ١٦٠ | ٥٥ | ٣٦٨ |
| مێ | ١٠٠ | ١١ | ١٤٥ | ٤٥ | ٣٠١ |
| سەرجەم | ٢٤٠ | ٢٤ | ٣٠٥ | ١٠٠ | ٦٦٩ |

**ب. سەمپلا ڤەکۆلینێ:** ڤەکولەری هەلبژاردنا چینی یا ژمارێت دەستنیشانکری ل سەر شێوازێ هەرەمەکی (عشوائی) بکارئینا، و (٨٠) ماموستا وەرگرتن ژ وان (٤٠) ماموستاییێن زانستی بوون، (٢٠) کەس ژێ نێر بوون و (٢٠) ژێ مێ بوون و هەروەسا (٤٠) ماموستاییێن دی یێن وێژەیی بوون و نیڤە ژێ ژ رەگەزێ نێر بوون و نیڤا دی میێ بوون. خشتێ (٢) ئەڤێ چەندێ پتر روون و ئاشکەرا دکەت.

**خشتا (٢)**

**کومەلا سەمپلێ ددەتە دیارکرن**

| بەش و خزمەت / رەگەز | زانستی | | مروڤایەتی | | سەرجەم |
|---|---|---|---|---|---|
| | ژ١ – ١٠ سال | ژ١١– ٢٠ سال | ژ١ – ١٠ سال | ژ١١– ٢٠ سال | |
| نێر | ١٧ | ٣ | ١٦ | ٤ | ٤٠ |
| مێ | ١٧ | ٣ | ٢٠ | ٠ | ٤٠ |
| سەرجەم | ٣٤ | ٦ | ٣٦ | ٤ | ٨٠ |

دوو: بەرهەفکرنا ئامرازێ ڤەکوٚلینێ:

أ– ئامیرێ ڤەکوٚلینێ:

ژ بو دیارکرنا شێوازێن قوٚپیاکرنێ ل دەف قوتابیێن پولا (١٠–١١) ئامادەی، ڤەکولەری هەڤدیتن دگەل هژمارەکا قوتابیا کر دەربارەی شێوازێن قوٚپیاکرنێ، و هەروەسا پێداچوون لسەر ئەدەبیات و ڤەکوٚلینێن پەیوەندار کر ژ وانا (المشكلات الاجتماعية، العموشي، أحمد ومحمود العليمات، ٢٠٠٩) (المشكلات التربوية المعاصرة، المعايطة، عبدالعزيز، ومحمد الجغيمان، ٢٠٠٦)، (المشكلات الصفية، العمايرة، محمد حسن،٢٠٠٧)، پشتی ئەڤێ چەندێ رابوو ب بەرهەڤکرنا راپرسەکا ڤەکری وەکو د پاشکویا (١) هاتی کو پێشکێشی (١٢) ماموستایا کر، (٦) ماموستا دەرچوێت بەشێن مروڤایەتی بوون، (٣) ماموستا ژ وان رەگەزێ نێر بوون، و (٣) ماموستا ژ رەگەزێ مێ بوون، و (٦) ماموستا دەرچوییێت بەشێن زانستی بوون، (٣) ماموستا ژ وان رەگەزێ نێر بوون، و (٣) ماموستا ژ رەگەزێ مێ بوون. ل دیف وێ هەڤدیتنێ ئەوا دگەل هژمارەکا قوتابیا و پێداچوونا ئەدەبیاتا و بەرهەڤکرنا راپرسیا ڤەکری، هژمارا برگا بوونە (١٨) وەکو د پاشکویا ( ٢) دا هاتی.

**ب– دروستیا راپرسیا ڤەکوٚلینێ (صدق اداة البحث):**

پیڤەر بدروستی دێ هێتە هژمارتن ئەگەر شیا ئەوی تشتی ب پیڤیت ئەوێ ژ پێخەمەت هاتیە بەرهەڤکرن. (عباس، ١٩٩٦: ٢٢ ). ڤەکولەری پیڤەر ئێخستە بەرچاڤێت هژمارەکا شارەزا و تایبەتمەندان د بوارێن رێکێن فێرکرنێ و پەروەردە

و دەروونناسییێدا وەکو د پاشکویا (٣)دا، داکو بریارێ ل سەر بدەن کا چەند یێ دروستە. و پیڤەر دئێتە هژمارتن یێ دروست و بهێزە هەکەر رێژەکا بلند ژ شارەزا و تایبەتمەندا بریارێ ل سەر بکارهاتنا ئامیری بدەن بو پیڤانا وی تشتی ئەوێ ژ پێخەمەت هاتیە بەرهەڤکرن (عودة، ١٩٩٩: ٣٧٠). و ئەوان (١٤) برگە لسەر زێدەکرن وەکو ل خشتا (٣) لدوماهیێ هژمارا وان برگا بوونە (٣٢) برگە وەکو د پاشکویا (٤)دا هاتی.

**خشتا (٣)**

**برگێن هاتینە زێدەکرن ژلایێ شارەزاڤە**

| ژمارێن برگێن هاتینە زێدەکرن | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ز | ژمارا برگێ | ز | ژمارا برگێ | ز | ژمارا برگێ | ز | ژمارا برگێ |
| ١ | ٥ | ٥ | ١٤ | ٩ | ٢٠ | ١٣ | ٣١ |
| ٢ | ٩ | ٦ | ١٥ | ١٠ | ٢٦ | ١٤ | ٣٢ |
| ٣ | ١١ | ٧ | ١٦ | ١١ | ٢٧ | | |
| ٤ | ١٢ | ٨ | ١٩ | ١٢ | ١٨ | | |

## ج- جێگریا پیڤەرێ پیڤانێ (ثبات الاستبانة):

بو دەرێخستنا نەگورێ ، پتر ژ شێوازەکی تێتە بکارئینان (علی، عبدالقادر ، ٢٠١٠: ٥٩) بو ڤێ مەبەستێ ڤەکولەری شێوازێ (ژێکڤەبوونا ب نیڤی) "التجزئة النصفية" ئەوژی برێکا هەلبژارتنا (١٨) ژ ناميلکێن بەرسڤدەرا نیڤی "٩" ژ وان یێن چینا وێژەیی بوون و هەمان ژمارە ژ یێن زانستی بوون، و هەروەسا بو رەگەزی ژی. ، و دابەشکرنا برگێن پیڤەری بو کت و جووت و دەرئینانا هێزا پەیوەندیێ دنافبەرا واندا بکار ئینا (عودة، ١٩٩٩: ٣٥٠)، و دویڤدا ڤەکولەرا (هاوکێشەی پێوەنداری پێرسون) بکارئینا دەرکەفت (0.80) ئەڤە جێگریا نیڤا ئەزموونێ بوو تاکو ببیتە یا تمام و هەمیێ، ڤەکولەرا (هاوکێشەی گتمان) بکارئینا (ژێدەرێ پێشوو ، ١٩٩٩: ٣٥٣) و دەرکەفت (0.88) ، بڤێ چەندێ ئامرازێ پیڤانێ وەکو د هەفپێچا ژمارە (٤)دا هاتی و ب رەنگەکێ دوماهی بەرهەڤ بوو.

**سێ:** ژبو دەرئینانا ئەنجاما ڤەکۆلەری رێـژا سـەدی هاوکێشـەی پێوەنـداری پێرسون بو دەرێخستنا نیڤا نەگوریێ هاوکێشەی گێتمـان بـو دەرێخسـتنا نـەگوریا تمام بکار ئینا.

**ئەنجامێن ڤەکۆلینێ:**

ئەڤ پشکە پێك دهێت ژ خستنە رووا ئەنجامێن ڤەکۆلینێ و گەنگەشە کـرن ل سەر لدویف ئارمانجێت ڤەکۆلینێ، و بڤی رەنگێ ل خوارێ:

**ئارمانجا ئێکێ:** زانینا هەبوونا قۆپیـاکرنێ دناڤبـەرا قوتـابیێن قوناغـا (١٠ — ١١) ئامادەییدا دئەزموونێن نڤێسیندا ل دویـف بوچـوونا ماموسـتاییێن وان لناڤەنـدا قەزا زاخۆ.

پشتی سەرەدەریا ئامارەیێ دگەل پێزانینێن کەتین بەردەسـتێ ڤەکۆلـەری ژ سەمپلا ڤەکۆلینێ لدویف بوچوونێن گشت ماموستایا دیار بۆ کو قۆپیـا دهێتـەکرن د ئەزموونێن نڤێسیندا ، و ژبو پتر پشت راستبوونێ ڤەکۆلـەرا ئـامرازێ (t-test) یـا سامپلەکێ بکار ئینا کە بهـایێ (٣٢.٣٣) و ب تێکـرا نمـرا (٥٧.٣٩) وەکـو دخشـتا (٤) پتر ئاشکەرا دکەت:

**خشتا (٤)**

**هەبوونا قۆپیاکرنێ د ئەزموونێن نڤێسیندا لدویف بوچوونێن ماموستاییێن وان**

| ژمارا سامپلێ | تێکرا نمرا | | لادانا معیاری | | بهایێ | | نمرا ئازاد | دلالەتا ئامارەیی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | | | هژمارتی | خشتەیی | | |
| ٨٠ | ٥٧.٣٩ | ١٥.٨٥ | ٣٢.٣٣ | ١.٩٦ | ٧٩ | ٠.٠٥ | | |

**و ژ بو پتر روونکرنێ تەماشەی نەخشێ خارێ بکە**



و لدویف بوچوونا ڤەکۆلەری ئەگەر دزڤرن گەلەك هوکارا وەك ژینگەها هولێت ئەزموونا کە گەلەك جارا پڕن ژ قوتابیا و قوتابی نزیکی ئێکن ، هەروەسا هندەك جارا ماموستا رێکێن جوراوجور بکارنائینن ژبو هەلسەنگاندنا قوتابیا کە دبیتە رێکەك قوتابی هەمی هەولا بدەت کە نمرێن سەرکەفتنێ بدەستخۆڤە بینیت.

**ئارمانجا دووێ:** رێزکرنا شەش شێوازێن قۆپیاکرنێ ژ یا پتر بەربەلاڤ بوو یا کێمتر بەربەلاڤ ل ناڤبەرا قوتابیێن قوناغا (١٠ – ١١) دا ل دویف بوچوونا ماموستاییێن وان لناڤەندا قەزا زاخۆ.

ژبەرسڤێن سامپلێ دیار بۆ کو رێژا **ئاخڤتن دگەل ئێك راستەوخو** (١٠٠٪) بو لدویف بوچوونێن ماموستاییێن وان کە ژ هەمی شێوازێن دی بەربەلافترە، و دویفرا شێوازێ **بەرێخودانا دەوروبەرا (هەڤالا) د هولا ئەزموونێدا** کو رێژا (٩٧.٥٪)، و پاشی شێوازی **نڤێسین لسەر لاپەرێت بچیك** کو ب رێژا (٩٦.٢٥٪) بوو ، و **دەنگی ژخو دئینن وەك ئیشارەت** ب رێژا (٩٢.٥٪)، و دویفرا شێوازێ **نڤێسین لسەر وێ پەرتووکێ یا لاپەرا ئەزموونێ د دانیتە سەر** کە ب رێژا (٨٢.٥٪)و، و دویفرا شێوازێ **بلندکرنا لاپەرا تاقیکرنێ بو هەڤالێ خو** کە ب رێژا (٨٠٪) ژ ماموستاییێن وان دبێژن یا بەربەلاڤە. و خشتا (٥) پتر روون دکەت:

**خشتا (٥)**

**رێزکرنا شێوازێن قۆپیاکرنێ ژ یا پتر بوو یا کێمتر بەربەلاف لناف قوتابیێن قوناغا (١٠ – ١١) لدویف بوچوونا ماموستاییێن وان لناڤەندا قەزا زاخۆ دیاردکەت.**

| ز | شێوازێ قۆپیاکرنێ | ژمارا دەستەواژێ د راپرسییێدا | رێژا سەدی یا بەربەلافبوونێ |
|---|---|---|---|
| ١ | ئاخڤتن دگەل ئێك راستەوخو. | ١٧ | ٪١٠٠ |
| ٢ | بەرێخودانا دەوروبەرا (هەڤالا) د ئەزموونێدا | ٢٣ | ٪٩٧.٥ |
| ٣ | نڤێسین لسەر لاپەرێت بچیك | ٤ | ٪٩٦.٢٥ |
| ٤ | دەنگی ژخو دئینن وەك ئیشارەت | ١٨ | ٪٩٢.٥ |
| ٥ | نڤێسین لسەر وێ پەرتووکا لاپەرا ئەزموونێ د دانیتە سەر. | ١٤ | ٪٨٢.٥ |
| ٦ | بلندکرنا لاپەرا تاقیکرنێ بو هەڤالێ خو | ٢٦ | ٪٨٠ |

**ژبو پتر روونکرنێ تەماشەی نەخشێ خارێ بکە**




**ئارمانجا سییێ:** زانینا شەش شێوازێن قۆپیاکرنێ دئەزموونێن نڤێسیندا لدویف شینگر (بدائل)" گەلەك گەلەك، گەلەك، هندەك جارا " دئێتەکرن دناڤبەرا قوناغا (١٠ –١١) ئامادەیی لدویف بوچوونا ماموستاییێن وان لناڤەندا قەزا زاخۆ و لسەر بنەمایێ بگورێ:

أ – "رەگەز، ب– بسپوری، ج – خزمەت " وان.

**ئەنجاما دا دیارکرن کو:**

أ– ژبوچوونێن سەمپلا ڤەکۆلینێ دیار دکەن کو رێژا (١٠٠٪) ژشێوازێ (**ئاخڤتن دگەل ئێك راستەوخو**) یێ قۆپیاکرنێ ئێك ژ وان شێوازێن هەرە بەربەلاڤە و لسەر بنەمایێ شینگرێ (البدائل) (گەلەك گەلەك، گەلەك، هندەك جارا) دئێتە کرن، رێژا (٥٠٪) ژسەمپلێ نێر بوون، و ژوانا رێژا (٢٥٪) ژ بسپوریا مروڤایەتی بوون ، و (٢٥٪) ژ بسپوریا زانستی بوون، و ژ یێن نێر رێژا (٨٠٪) خزمەت ژ (١–١٠) سالا هەبوون و رێژا (٢٠٪) خزمەت ژ (١١ –٢٠) سالا هەبوون،. و رێژا (٥٠٪) ژ سەمپلێ ژ رەگەزێ مێ بوون، ژوان رێژا (٢٥٪) ژ یێن مێ ژ بسپوریا مروڤایەتی بوون، و رێژا (٢٥٪) ژ بسپوریا زانستی بوون و رێژا (٤٦.٢٥٪) ژرەگەزێ مێ خزمەت ژ (١–١٠) سال هەبوون و رێژا (٣.٧٥٪) ژ وان خزمەت ژ (١١ –٢٠) سال هەبوون، هەروەك لخشتێ (٦) هاتیە دیارکرن:

**خشتا (٦)**

**ئاستێ بکارئینانا شێوازێ قۆپیایێ " ئاخڤتن دگەل ئێك راستەوخو " لدویف بۆچوون و (رەگەزی و بسپوری و خزمەتا) ماموستاییێن وان لناڤەندا قەزا زاخۆ و لسەر بنەمایێ (گەلەك گەلەك،گەلەك، هندەك جارا) دئێتە کرن ددەتە دیارکرن.**

| پسپور و خزمەت و رەگەز | | مروڤایەتی | | زانستی | | سەرجەمێ دووبارەبوونێ |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | ١_١٠ | ١١_٢٠ | ١_١٠ | ١١_٢٠ | |
| نێر | گەلەك گەلەك | ١٢ | ٢ | ٩ | ٢ | **٢٥** |
| | گەلەك | ٢ | ٠ | ٥ | ٠ | **٧** |
| | هندەك | ٢ | ٢ | ٣ | ١ | **٨** |
| مێ | گەلەك گەلەك | ١٤ | ٠ | ١٣ | ٢ | **٢٩** |
| | گەلەك | ٤ | ٠ | ٣ | ٠ | **٧** |
| | هندەك | ٢ | ٠ | ١ | ١ | **٤** |
| سەرجەم | | **٣٦** | **٤** | **٣٤** | **٦** | **٨٠** |

ب- ڕێژا (٩٧.٥٪) ژسەمپلا ڤەکۆلینێ دبێژن شێوازێ (**بەرێخودانا دەوروبەرا (هەڤالا) د ئەزموونێدا** ) یێ قۆپیاکرنێ ژ شێوازێن بەربەلاڤە و لسەر بنەمایێ شینگریێ (البدائل) (گەلەك گەلەك،گەلەك، هندەك جارا) دئێتەکرن، ڕێژا (٤٨.٧٥٪) ژسەمپلێ نێربوون ، و ژوانا ڕێژا (٢٤.٣٦٪) ژ بسپوریا مروڤایەتی بوون ، و ڕێژا (٢٥.٦٤٪) ژ بسپوریا زانستی بوون، و ڕێژا (٤١٪) ژ یێن نێر خزمەت ژ (١-١٠) سالا هەبوون و ڕێژا (٨٪) خزمەت ژ (١١ -٢٠) سالا هەبوون،. و ڕێژا (٤٨.٧٥٪) ژ سەمپلێ ژ رەگەزێ مێ بوون، ژوان ڕێژا (٢٤.٣٦ ٪) بسپورێن مروڤایەتی بوون ، و ڕێژا (٢٥٪) ژ بسپوریا زانستی بوون و ڕێژا (٤٦.١٥٪) ژرەگەزێ مێ خزمەت ژ (١-١٠) سال هەبوون و ڕێژا (٣.٨٥٪) ژ وان خزمەت ژ (١١ -٢٠) سالا هەبوون، هەروەك لخشتێ (٧) هاتیە دیارکرن:

**خشتا (٧)**

**ئاستێ بکارئینانا شێوازێ قۆپیایێ " بەرێخودانا دەوروبەرا (هەڤالا) د ئەزموونێدا " لدویف بوچوون و (رەگەزی و بسپۆری و خزمەتا) ماموستایێن وان لناڤەندا قەزا زاخۆ و لسەر بنەمایێ (گەلەك گەلەك،گەلەك، هندەك جارا) دئێتە کرن ددەتە دیارکرن.**

| پسپور و خزمەت / رەگەز | | مروڤایەتی | | زانستی | | سەرجەمێ دووبارەبوونێ |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | ١_١٠ | ١١_٢٠ | ١_١٠ | ١١—٢٠ | |
| نێر | گەلەك گەلەك | ١٠ | ٢ | ٨ | ١ | ٢١ |
| | گەلەك | ٣ | ٢ | ٥ | ١ | ١١ |
| | هندەك | ٢ | ٠ | ٤ | ١ | ٧ |
| مێ | گەلەك گەلەك | ١٥ | ٠ | ٩ | ٢ | ٢٦ |
| | گەلەك | ٣ | ٠ | ٨ | ١ | ١٢ |
| | هندەك | ١ | ٠ | ٠ | ٠ | ١ |
| سەرجەم | | ٣٤ | ٤ | ٣٤ | ٦ | ٧٨ |

ج — رێژا ( ٩٦.٢٥٪) ژسەمپلا ڤەکۆلینێ دبێژن شێوازێ (**نڤێسین لسەر لاپەرێن بچیك**) ژ شێوازێن بەربەلاڤە ژبو قۆپیاکرنێ و لسەر بنەمایێ شینگرێ (البدائل) (گەلەك گەلەك،گەلەك،هندەك جارا) دئێتە کرن، رێژا (٤٨.٧٥٪) ژسەمپلێ نێر بوون ، و ژوانا رێژا (٢٥٪) ژ بسپوریا مروڤایەتی بوون ، و رێژا (٢٣.٧٥٪) ژ بسپوریا زانستی بوون، و ژیێن نێر رێژ( ٤٪) خزمەت ژ(١—١٠) سالا هەبوون و رێژا (٨.٧٥٪) خزمەت ژ (١١ —٢٠) سالا هەبوون. و رێژا (٤٧.٥ ٪) ژ سەمپلێ ژ رەگەزێ مێ بوون، ژوان رێژا (٢٣.٧٥٪) ژ بسپوریا مروڤایەتی بوون ، و رێژا (٢٣.٧٥٪) ژ بسپوریا زانستی بوون و رێژا (٤٣.٧٥ ٪) ژرەگەزێ مێ خزمەت ژ(١—١٠) سالا هەبوون و رێژا (٣.٧٥٪) ژ وان خزمەت ژ (١١ —٢٠) سالا هەبوون، هەروەك لخشتێ (٨) هاتیە دیارکرن:

**خشتا (٨)**

**ئاستێ بکارئینانا شێوازێ قۆپیایێ " نڤێسین لسەر لاپەرێن بچیك " لدویف بوچوون و (رەگەزی و بسپوری و خزمەتا) ماموستایێن وان لناڤەندا قەزا زاخۆ و لسەر بنەمایێ (گەلەك گەلەك،گەلەك، هندەك جارا) دئێتە کرن ددەتە دیارکرن.**

| پسپور و خزمەت / و رەگەز | | مروڤایەتی | | زانستی | | سەرجەمێ دووبارەبوونا |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | ١_١٠ | ١١_٢٠ | ١_١٠ | ١١_٢٠ | |
| نێر | گەلەك گەلەك | ٩ | ٢ | ٧ | ٢ | ٢٠ |
| | گەلەك | ٦ | ١ | ٦ | ٠ | ١٣ |
| | هندەك | ١ | ١ | ٣ | ١ | ٦ |
| مێ | گەلەك گەلەك | ١٢ | ٠ | ٩ | ٢ | ٢٣ |
| | گەلەك | ٣ | ٠ | ٦ | ١ | ١٠ |
| | هندەك | ٤ | ٠ | ١ | ٠ | ٥ |
| سەرجەم | | ٣٥ | ٤ | ٣٢ | ٦ | ٧٧ |

د– کو رێژا (٩٢.٥٪) ژسەمپلا ڤەکۆلینێ دبێژن شێوازێ " **دەنگی ژخودئینن وەك ئیشارەت** " ژشێوازێن بەربەلاڤە و لسەر بنەمایێ شینگرێ (البدائل) (گەلەك گەلەك،گەلەك،هندەك جارا) دئێتەکرن، رێژا (٤٣.٧٥٪) ژسەمپلێ نێر بوون ، و ژوانا رێژا (٢٢.٥٪) ژ بسپوریا مروڤایەتی بوون ، و رێژا (٢١.٥٪) ژ بسپوریا زانستی بوون، و ژ یێن نێر رێژا (٣٥٪) خزمەت ژ(١–١٠) سالا هەبوون و رێژا (٨.٧٥٪) خزمەت ژ (١١ –٢٠) سالا هەبوون. رێژا (٤٨.٧٥٪) ژ سەمپلێ ژ رەگەزێ مێ بوون، ژ وان رێژا (٢٣.٧٥٪) ژ بسپوریا مروڤایەتی بوون ، و رێژا(٢٥٪) ژ بسپوریا زانستی بوون و رێژا (٤٥٪) ژ رەگەزێ مێ خزمەت ژ(١–١٠) سالا هەبوون، و رێژا (٣.٧٥٪) ژ وان خزمەت ژ (١١ –٢٠) سالا هەبوون ، هەروەك لخشتێ (٩) هاتیە دیارکرن:

**خشتا (٩)**

**ئاستێ بکارئینانا شێوازێ قوٚپیایێ " دەنگی ژخو دئینن وەك ئیشارەت " لدویف بوچوون و (رەگەزی و بسپوری و خزمەتا) ماموستاییێن وان لناڤەندا قەزا زاخوٚ و لسەر بنەمایێ (گەلەك گەلەك،گەلەك، هندەك جارا) دئێتە کرن ددەتە دیارکرن.**

| پسپور و خزمەت و رەگەز | | مروڤایەتی | | زانستی | | سەرجەمێ |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | ١_١٠ | ١١_٢٠ | ١_١٠ | ١١_٢٠ | دووبارەبوونا |
| نێر | گەلەك گەلەك | ٥ | ٢ | ٣ | ١ | ١١ |
| | گەلەك | ٧ | ١ | ٤ | ١ | ١٣ |
| | هندەك | ٢ | ١ | ٧ | ١ | ١١ |
| مێ | گەلەك گەلەك | ١١ | ٠ | ٩ | ١ | ٢١ |
| | گەلەك | ٨ | ٠ | ٦ | ١ | ١٥ |
| | هندەك | ٠ | ٠ | ٢ | ١ | ٣ |
| سەرجەم | | ٣٣ | ٤ | ٣١ | ٦ | ٧٤ |

هـ- رێژا (٨٢.٥٪) ژسەمپلا ڤەکوٚلینێ دبێژن شێوازێ " **نڤێسین لسەر وێ پەرتووکا لاپەرا ئەزموونێ د دانیتە سەر** " ژشێوازێن بەربەلاڤە و لسەر بنەمایێ شینگرێ (البدائل) (گەلەك گەلەك،گەلەك،هندەك جارا) دئێتە کرن، رێژا (٤٠٪) ژسەمپلێ نێر بوون ، و ژوانا رێژا (٢٣.٧٥٪) ژ بسپوریا مروڤایەتی بوون ، و رێژا(١٦.٢٥٪) ژ بسپوریا زانستی بوون، و ژ پێن نێر رێژا (٣٦.٢٥٪) خزمەت ژ(١- ١٠) سالا هەبوون و رێژا (٣.٧٥٪) خزمەت ژ (١١ -٢٠) سالا هەبوون. و رێژا (٤٢.٥٪) ژ سەمپلێ ژ رەگەزێ مێ بوون، ژوان رێژا (٢١.٢٥٪) ژ بسپوریا مروڤایەتی بوون ، و رێژا (٢١.٢٥٪) ژ بسپوریا زانستی بوون و رێژا (٣٨.٧٥٪) ژرەگەزێ مێ خزمەت ژ(١-١٠) سالا هەبوون و رێژا (٣.٧٥٪) خزمەت ژ (١١ -٢٠) سالا هەبوون ، هەروەك لخشتێ (١٠) هاتیە دیارکرن:

**خشتا (١٠)**

**ئاستێ بکارئینانا شێوازێ قۆپیایێ " نڤێسین لسەر وێ پەرتوکێ یا لاپەرا ئەزموونێ د دانیتە سەر" لدویف بوچوون و (رەگەزی و بسپوری و خزمەتا) ماموستایێن وان لناڤەندا قەزا زاخۆ و لسەر بنەمایێ (گەلەك گەلەك،گەلەك، هندەك جارا) دئێتە کرن ددەتە دیارکرن.**

| پسپور و خزمەت / و رەگەز | | مروڤایەتی | | زانستی | | سەرجەمێ دووبارەبوونا |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | ١_١٠ | ١١_٢٠ | ١_١٠ | ١١_٢٠ | |
| نێر | گەلەك گەلەك | ٦ | ٣ | ٥ | ٠ | ١٤ |
| | گەلەك | ٩ | ٠ | ٤ | ٠ | ١٣ |
| | هندەك | ١ | ٠ | ٤ | ٠ | ٥ |
| مێ | گەلەك گەلەك | ٨ | ٠ | ٨ | ١ | ١٧ |
| | گەلەك | ٥ | ٠ | ٦ | ٢ | ١٣ |
| | هندەك | ٤ | ٠ | ٠ | ٠ | ٤ |
| سەرجەم | | ٣٣ | ٣ | ٢٧ | ٣ | ٦٦ |

و- رێژا (٨٠٪) ژسەمپلا ڤەکۆلینێ دبێژن شێوازێ " **بلندکرنا لاپەرا تاقیکرنێ بو هەڤالێت خو**" ژشێوازێن بەربەلاڤە و لسەر بنەمایێ شینگرێ (البدائل) (گەلەك گەلەك،گەلەك،هندەك جارا) دئێتە کرن، رێژا (٤١.٢٥٪) ژسەمپلێ نێر بوون، و ژوانا رێژا (٢١.٢٥٪) ژ بسپوریا مروڤایەتی بوون ، و رێژا (٢٠٪) ژ بسپوریا زانستی بوون، و ژ یێن نێر رێژا (٣٣.٧٥٪) خزمەت ژ(١–١٠) سالا هەبوون و رێژا (٧.٥٪) خزمەت ژ (١١ –٢٠) سالا هەبوون،. و رێژا (٣٨.٧٥٪) ژ سەمپلێ ژ رەگەزێ مێ بوون، ژوان رێژا (١٨.٧٥٪) ژ بسپوریا مروڤایەتی بوون ، و رێژا(٢٠٪) ژ بسپوریا زانستی بوون و رێژا(٣٧.٥٪) ژرەگەزێ مێ خزمەت ژ(١–١٠) سالا هەبوون ورێژا (١.٢٥٪) خزمەت ژ (١١ –٢٠) سال هەبوون ، هەروەك لخشتێ (١١) هاتیە دیارکرن:

**خشتا (١١)**

**ئاستێ بکارئینانا شێوازێ قۆپیایێ " بلندکرنا لاپەرا تاقیکرنێ بو هەڤالێت خو " لدویف بوچوون و (رەگەزی و بسپوری و خزمەتا) ماموستاییێن وان لناڤەندا قەزا زاخۆ و لسەر بنەمایێ (گەلەك گەلەك، گەلەك، هندەك جارا) دئێتە کرن ددەتە دیارکرن.**

| پسپور و خزمەت و رەگەز | | مروڤایەتی | | زانستی | | سەرجەمێ دووبارەبوونا |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | ١_١٠ | ١١_٢٠ | ١_١٠ | ١١_٢٠ | |
| نێر | گەلەك گەلەك | ٣ | ٢ | ٣ | ١ | ٩ |
| | گەلەك | ٦ | ١ | ٦ | ٠ | ١٣ |
| | هندەك | ٤ | ١ | ٥ | ١ | ١١ |
| مێ | گەلەك گەلەك | ٤ | ٠ | ٢ | ٠ | ٦ |
| | گەلەك | ٧ | ٠ | ٨ | ١ | ١٦ |
| | هندەك | ٤ | ٠ | ٥ | ٠ | ٩ |
| سەرجەم | | ٢٨ | ٤ | ٢٩ | ٣ | ٦٤ |

**دەرئە نجام:**

پشتی ئەنجام ب دوماهیك هاتین ، بو ڤەكولـەری ئـەف خـالێن لخـواریێ دئـێن دیاربوون:

هندەك ژ شێوازێن قوپیایێ د ئەزموونێن نڤێسیندا ب پیلان دئێنە ئەنجامـدان "**نڤێسین لسەر لاپەرێت بچیك** ، دەنگی ژخو دئینن وەك ئیشارەت، نڤێسـین لسـەر لاپەرا تاقیكرنێ بخو ، بلندكرنا لاپـەرا تـاقیكرنێ بـو هـەڤالێ خـو " و ئەڤـە جهـێ مەترسـییەكا ئیكجـار بلنـدە چـونكی وێ رامـانێ ددەت كـو قوتـابی بـەرهنگاریێ "تحدی" یێ دگەل رێنماییێن پەروەردێ دكـەت كـو دبیتـە جهـێ نزمبوونـا ئاسـتێ بەرپرساتیێ د جڤاكیدا. وهندەكێن دیتر دبیت بێ پیلان بیت" ئاخفتنـا راسـتەوخو دگـەل دەوروبـەرا، بـەرێخودانا دەوروبـەرا (هـەڤالا)" بـەلێ هـەر جهـێ مەترسـییێیە چونكی بێ دادوەریێ دهەلسەنگاندنێدا پەیدا دكەت و هەروەسا بێ ئومێدیێ.

١- بشێوەكی گشتی جیاوازی هەبوو دنافبەرا بوچوونێن ماموستا لسـەر رێـژا بەربەلافبوونا شێوازێ قوپیاكرنێ لدویف رەگەزی و بسپوریێ و سالێن خزمـەتێ. و بارا پتر رێژا بوچوونێن ماموستاییێن نێر ل بسپوریا مروڤایەتی بلنـدتر بـوون ژ یـێن زانسـتی. بـەلێ پێچـەوانە رێـژا رەگـەزێ مـێ لبسـپوریا زانسـتی بلنـدتر بـوو ژیـێن مروڤایەتی.

**راسپاردە:**

١- ماموستاییێن چاڤدێر ل هولێن ئەزموونان لاپەرێن ئـەزموونا بـو قوتـابی دابـین كەت و مور كەت.

٢- هەلسـەنگاندن جوراوجـور بێنـە بكارئینـان و نمـرە ب دادوەری لسـەر بێنـە دابەشكرن.

٣- پسیارێن هزری بێنە دروستكرن ژبو ئەزموونێن نڤێسین.

٤- لـدەمێ ئـەزموون دێنـە ئەنجامـدان د هـولێن تاقیكرنـادا دویراتـی بكەڤیتـە دناڤبەرا قوتابیادا.

٥- جهێن تایبەت ژبو تاقیكرنا و ئەنجامدانا تێستێن قوتابیان بهێنە دروسـتكرن، و نەخاسمە ل سەرێ سالێ.

٦- پتر ژ جورەك پسیارا بێتە دروستکرن وەك (A – B) بو تاقیکرنێن پولێن ژمارا قوتابیا گەلەك بن.
٧- خولێن شیاندنێن زێرەڤانا بێنە بەرهەفکرن لسەر نیاسبینا شێوازێن نوێ یێن گزی کرنێ د ئەزموونادا، دا مامۆستا لسەر فرت و فێلێن وان هلبێن و ئەڤ کارە لبەر چاڤێن وان بەرزە نەبن.

**پێشنیاز بۆ ڤەکۆلینێن ئایندە:**

١- ڤەکۆلین بێنەکرن لسەر هەمان بابەت لدویف بوچوونێن قوتابیێن ئامادەیی.
٢- پتر ژ ڤەکۆلینەکێ بێتەکرن لسەر رێکێن رێگرتنا ل کریارا قۆپیایێ د ئەزموونێن نڤێسیندا.
٣- ڤەکۆلین بێنەکرن رێکێن چارەسەریا قوتابییێ قۆپیاکەر.
٤- ڤەکۆلینەکا تاقیگەهی لدۆر کاریگەریا خولەکا رۆشنبیری لسەر ئاستێ ئەنجامدانا قۆپیەکرنێ لنك قوتابیێن سەرەتایی یان ناڤنجیێ.

## ژێـــــدەر:

**ب زمانێ کوردی:**

- قورئانا پیرۆز.

١. حیتۆ، عارف (٢٠١٣ ) ((کەسایەتیا کەسێ تاکێ عێراقی))، **گۆڤارا مەتین**، ژمارە (٢٢٢).
٢. شیلانی، سەید عەلی (١٩٩٨) **تەفسیرا رۆناهی** ،چ١، چاپخانا زانست ،دهوك ،عیراق.
٣. قەرەچەتانی،کەریم شەریف (٢٠٠٨) **چونێتی سەعیکردن و خو ماندیکرن بو تاقیکردنەوە** ،چ١، وەزارەتی پەروەردە، سلێمانی ، عیراق.
٤. گوستافسۆن، هانس ئۆلۆف و هێلین لیندهۆلم ( ٢٠٠٢ ). **لایەنی بیردۆزی و پراکتیزەکردن لە بنچینەکانی وانە وتنەوە و فێرکردنی مەزنان لەگەل جەختکردن لەسەر نەهێشتنی نەخوێندەواری**، وەرگێڕان: سۆزان جەمیل ئەحمەد و ئەوانی تر، چ. یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، زنجیرەی بلاْوکراوەکانی **ئاسۆی پەروەردەیی**(٨)، هەولێر ،عیراق.
٥. یاسین، باقر ( ٢٠١١) **کەسێتیی تاکی عێراقی** ، وەرگێڕان: سەباح ئیسماعیل، چ. ١، چاپخانەی ئاراس، هەولێر، عیراق.

**ب زمانێ عەرەبی:**

١.البدري، طارق عبدالحميد (٢٠٠٥) ادارة التعلم الصفي الأسس والاجراءات، ط١، دار الثقافة ، عمان ، الاردن.
٢. الخليلي، أمل (٢٠٠٥) ادارة الصف المدرسي، ط١، دار صفاء، عمان، الاردن.
٣. دليم، فهد بن عبدالله (١٩٩٠) مدخل الى نظريات الشخصية، دار الحارثي ، الطائف ، السعودية.
٤. ربيع، هادي مشعان (٢٠٠٨) الارشاد التربوي والنفسي من المنظور الحديث، ط١، مكتبة المجتمع العربي ، عمان ، الاردن.
٥. الزيات، فتحي (٢٠٠٤) سيكولوجية التعلم بين المنظور الارتباطي والمنظور المعرفي، ط٢، دار النشر للجامعات ، القاهرة، مصر العربية.
٦. شحاته، حسن وزينب النجار (٢٠٠٣) معجم المصطلحات التربوية والنفسية، ط١، الدار المصرية، لبنان.

٧. شيفر، شارلزو هوارد ميلمان (٢٠٠٨) مشكلات الأطفال والمراهقين وأساليب المساعدة فيها ، ط١، دار الفكر، عمان ، الاردن.
٨. عباس، فيصل (١٩٩٦ ) الاختبارات النفسية تقنياتها واجراءاتها، ط١، دار الفكر العربي، بيروت ، لبنان.
٩. عربيات، بشير محمد (٢٠٠٧) ادارة الصفوف وتنظيم بيئة التعليم، ط١، دار الثقافة ، عمان ، الاردن.
١٠. عطية، محسن علي (٢٠٠٨) الاستراتيجيات الحديثة في التدريس الفعال، ط ١ ، دار صفاء ، عمان، الاردن.
١١. علي، عبدالحميد محمد و فتحي عبدالحميد عبدالقادر(٢٠١٠) القياس النفسي والاختبارات النفسية، ط١، مؤسسة طيبة للنشر ، القاهرة، مصر العربية.
١٢. عودة ، أحمد (١٩٩٩) القياس والتقويم في العملية التدريسية، ط٣، دار الأمل، إربد ، الأردن.
١٣. العموشي، أحمد وحمود العليمان (٢٠٠٩) المشكلات الاجتماعية، ط٢،الشركة العربية المتحدة للتسويق والتوريدات بالتعاون مع جامعة القدس المفتوحة، القاهرة، مصر العربية.
١٤. فرج، عبداللطيف حسين (٢٠٠٩) الاضطرابات النفسية، ط١، دار الحامد، عمان، الاردن.
١٥. قطامي، نايفة (٢٠٠٤) تعليم التفكير للمرحلة الاساسية، ط٢، دارالفكر، عمان، الاردن.
١٦. القائمي، علي (٢٠٠٤) الأسرة والمشاكل الاخلاقية للطفل، ط٣، دار النبلاء، بيروت، لبنان.
١٧. القوصي، عبدالعزيز (١٩٥٢) أسس الصحة النفسية، ط٤، مكتبة النهضة المصرية، القاهرة، مصر العربية.
١٨. مرسي، محمد منير (١٩٧٣) مدارس بلا فشل ، دار عالم الكتب، القاهرة، مصر العربية.
١٩. منصور، طلعت و انور الشرقاوي و عادل عزالدين وفاروق ابوعوف (٢٠٠٣) اسس علم النفس العام، مكتبة الانجلو المصرية ، القاهرة ، مصر العربية.
٢ ٢١. المعايرة، محمد حسن (٢٠٠٧) المشكلات الصفية السلوكية–التعليمية–الأكاديمية، ط٢، دار المسيرة، عمان، الاردن.

٢٢. المعايطة، عبدالعزيز و محمد الجغيمان (٢٠٠٦) مشكلات تربوية معاصرة، ط١، دار الثقافة ، عمان، الاردن.

**ب زمانێ فارسی:**

١. تاسيگ و ديگران ( ١٣٨٦ ) **جامعه شناسی بيماريهای روانی**، سازمان مطالعة و تدوين كتابهای علوم انسانی دانشگاهها، ترجمه: د. عبدالله أحمدی، چاپ (١ )، تهران.

٢. پورێفكارى. نصرت الله (١٣٨٠) **فرهنگ معاصر جامع روانشناسی و روانپزشكی و زمينه های پيوسته انگليزی و فارسی** ، جلد ١ – ٢ ،تهران.

٣. مقدم ,بدری (١٣٨١ك) **كاربرد روانشناسی دراموزشكاهروانشناسی اموزشكاهی**,گ .٨ . (سروش) انتشارات صداوسيما، تهران.

**ب زمانێ ئینگلیزی:**

1. Coon, Dennis (1997). Essentials of psychology, exploration and application, 7 th, Brooks/Cole pub.USA.
2. Gleitman, Henry & Alan J. Fridlund, Daniel Reisberg ( 2004 ). Psychology, 6th. Ed., W.W. Norton & Company, USA, 717 pp.
3. Fledman, Robert S. (2009). Essentials of understanding psychology, McGraw hill, 8th, USA.
4. Jolley Janina M. , Mark L. Mitchell(1995). Lifespan development a topical approach, Brawn & Benchmark, USA.
5. Neubeck, Kenneth J. & Glasberg, Daivita Silfen ( 2005). Sociology diversty, conflict, and change, McGraw- Hill, Higher education, NY. , 574 pp.
6. Passer, Micheal W. , Ronald E. Smith(2007). Psychology , thescience of mind and behavior, 4th ed., McGraw hill, USA.
7. Santrock , John W. (2009). Educational psychology, 4th ed., McGraw hill., USA.

**ب زمانێ رۆسی:**

1. Большой психологически словарь(2007).Сост.иобш. Ред. Б.Г.Мещеряков,В.П. Зинченко.СПб.:ПаримЕврознок,.627с.

2. Генкин Б. М.(2005). Экономика и социология труда: учебник для вузов.-5-е изд., -М. :НОРМА,-416с.
3. Кордуэлл М. (2003).Психология, А-Я: словарь-справачник / перев. С англ. К. С. Ткаченко.- М.: ФАИР-ПРЕСС,.-448с.
4. Маслоу А. (2006). Мотивация и личность / Пер. с англ. Гутман Т. И др. -3-е изд.-СПб.
5. Немов Р. С. (2007). Психология: словарь-справочник: в 2ч.-М. : изд-во ВЛАДОС-ПРЕСС,с.2.-312с.

**ژێدەر ژ سایتێن ئەنترنێتێ:**

١- الشـــــهرى ، زاهــــــر (د.س) الغـــــش.. تعريفــــــه ، مظـــــاهره و مضــــــاره، http://www.saaid.net/rasael/178.htm روژا سەرەدانێ ( ٢٠١٢/١١/٢٥)

٢- صـــــحار ، نـــــور (٢٠٠٩) الغـــــش بـــــين طـــــلاب المـــــدارس. http://socialworker2009.ahlamontada.net/t83-topic ، روژا ســـــــــــــەرەدانێ (٢٠١٢/١١/٢٥).

٣- عـــــــبرى، عاشـــــــــقه (٢٠٠٩) **الغـــــــــش فى المـــــــــدارس،** http://socialworker2009.ahlamontada.net/t83 -topic ، روژا ســـــەرەدانێ (٢٠١٢/١١/٢٥).

٤ – الزركوشي، نبيل ابراهيم (٢٠١٣) ظاهرة الغش المدرسي أسبابه وأنواعه ودوافعه، http://www.alnoor.se/article.asp?id=40362 الحـــوار المتمـــدن، روژا ســـەرەدانێ (٢٠١٣/٣/١).

٤- العـــزاوي، فـــارس (٢٠٠٦) ظـــاهرة الغـــش في التعلـــيم: رؤيـــة شـــرعية http://alukah.net/sharia/0/22709، المنتـــدى الشـــرعي العـــام، روژا ســـەرەدانێ (٢٠١٢/١١/٢٥).

**پاشكویا (١)**

**زانكویا زاخو**

**فاكولتیا زانستێن مروڤایەتی**

**پشكا: دەروونزانی**

ب/راپرسی

ماموستایێ............................ بەرێز

ماموستایا............................. بەرێز

سلاڤ و رێز

من لبەرە ڤەكۆلینەكا زانستی لدور (شێوازێت قۆپیاكرنێ د ئەزموونێن نڤێسینێدا) بكەم،چونكە ئێك ژ ئەركێن ماموستایان زێرەڤانیا قوتابیانە، و هەوە گەلەك شارەزایی هەیە دڤی بواریدا، ئەڤجا داخازێ ژ هەوەیێن بەرێز دكەم هاریكاریا من بكەن سەبارەت ئەڤی بابەتی وەكو خزمەتەكا زانستی برێكا بەرسڤدانا ئەڤان پرسیارێت ل خوارێ دیاركری، دگەل سوپاسیا ڤەكولەری.

١. ئایا د ئەزموونێن نڤێسینێ دا یێت (روژانە، هەیڤانە،....هتد) قۆپیا دهێتە كرن؟

أ– بەلێ

ب– نەخێر

٢. ئایا قۆپیا ب چ شێوە تێتە كرن؟ برێكا

أ– بنڤێسینێ:لسەردیواریلسەررەحلەیلسەرلاپەرێنبچیك

ب– زارەكی:

- راستەوخو دگەل هەڤالێ خو دئاخڤیت
- دەنگەكی ژ خو دئینیت
- 
- 

ت– ئەلکترونی:

- بلوتو
- موبایل
-
-

پ– (حەرەکێ) ئانکو لڤینەکێ بکەت:

- گوهرینا لاپەری دگەل یێ هەڤالێ خو
- ئیشارەت دان بدەستی ئانکو رێك کەفتن لسەر ئیشارەتەکێ
- ڤەکرنا کتێبێ بو هەڤالێ خو
-

**ڤەکولەر**

**م.هـ. زاهد سامی محمد**

**پاشکویا (٢)**

**جامعة زاخو** **الاختصاص:**

**فاكولتية العلوم الانسانية** **اللقب العلمي:**

**قسم علم النفس**

إستبانة آراء الخبراء

الاستاذ الفاضل.......................المحترم

الاستاذة الفاضلة..................المحترمة

تحية طيبة:

يروم الباحث اجراء بحثه الموسوم (أكثر أساليب الغش ممارسة بين طلبة المرحلة الاعدادية من وجهة نظر المدرسين في مركز قضاء زاخو) وبعد اجراء استبانة استطلاعية بين تدريسي المرحلة الاعدادية حول موضوع البحث والاستفادة من آراء مجموعة من الطلبة حصل الباحثين على الفقرات المدرجة في الاستمارة. ونظرا لما لكم من خبرة في هذا المجال نرجو ابداء رأيكم حول مدى صلاحية مجالات و فقرات أداة البحث بالأشارة في الحقل (يصلح–لايصلح–التعديل) و اضافة ما ترونه مناسبا. علما ان بدائل الاجابة هي (تمارس بدرجة كبيرة جدا– تمارس بدرجة كبيرة– تمارس بدرجة متوسطة– تمارس بدرجة قليلة– لا تمارس). هذا و لكم فائق تقدير و احترامالباحث.

**الباحث**

**م.م: زاهد سامى محمد**

